د. مكرم تاڵەبانی

# شێخ ڕەزای تاڵەبانی

ژیانی پەروەردەی بیروباوەڕی و شیعری





ناوی کتێب: شێخ ڕەزای تاڵەبانی "ژیانی، پەروەردەی، بیروباوەڕی و شیعری"
کۆکردنەوە و لێکدانەوەی: د. موکەڕەم تاڵەبانی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٧٣
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
پیت لێدان: ئەمیر داوود- دلاوەر صادق ئەمین- ڕەهیل ڕەشید
هەڵەگری: ئەحمەد تاقانە - شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٠٤)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ



وێنەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی
د. موکەڕەم تاڵەبانی کێشاویەتی

# شیعری کوردی

زوبدەی مـەتاعـی حـیکمـەتە ئەم شـیـعـری کـوردییـە
هەرزانە، بێ مـــوبالەغـــە، حـــەرفی بە گـــەوهەرێ
جـــامـــەی حـــەیاتی عـــاریەت کـــورتە زینهـــار
ئالّوودە دامـــەنی مـــەکـــە بۆ پێـــچی مـــێـــزەرێ

شێخ ڕەزا

# پێشەکی

لە ساڵی ١٩٤٦، بۆ یەکەم جار، لە یانەی مەئموووران لە کەرکووک، ئێوارەیەک لەگەڵ نووسەر و ئەدیبی کوردی ناسراو شێخ محەمەدی خاڵ یەکمان گرت. لە کاتی گفتوگۆدا باسی شێخ ڕەزا کرا. شێخ محەمەد پێی وتم؛ ئەرکی کۆکردنەوەی شیعرەکانی شێخ ڕەزا دەکەوێتە ئەستووی تۆ. من ئەمەم لەخۆمدا ڕانەدەبینی، چونکە وام دەزانی ئەوەی ڕێگای خەباتی سیاسی بگرێت، نابێت خۆی بە ئەدەب و شیعرەوە خەریک بکات. هەروا، ئەو شیعرە هەڵماڵراوەکانی شێخ ڕەزا کە بەسەر زوبانی خەلقەوە بوون، لەگەڵ بیروباوەڕی مندا نەدەگونجان و سیاسی دەبێت وەک وشکە سۆفی بێت و سیاسی بۆ سیاسەت و ئەدیب بۆ ئەدەب بێت و یەگرتنی سیاسەت و ئەدەب وەکوو دوو کاڵەک بەدەستێک هەڵگرتن وایە، لەبەرئەوە گفتی ئەوەم نەداین کە ئەو ئەرکە بخەمە ئەستووم و کەوتە ئەستووی ئەو.

شێخ محەمەد قۆڵی پیاوانەی لێ هەڵماڵی و لەو بابەتە تەقەلایەکی زۆری دا بەڵام مەرگ ماوەی ئەوەی نەدا ئەو هەموو گەنجینەیەی شێخ ڕەزا لە دەستی فەوتان ڕزگار بکات و بیخاتە بەردەستی ڕۆشنبیرانی کورد و لە پاش کۆچی دوایی ئەو، کەس ئەو ئالایەی هەڵنەگرد و ئەو ئەرکەی نەخستە ئەستووی خۆی و منیش ئەوەی بە بیرما نەهاتبێ ئەوە بوو کە ڕۆژێک لە ڕۆژان یەک دوو ساڵ لەدوا ساڵانی ژیانم تەرخان بکەم بۆ کۆکردنەوەی شیعرەکانی شێخ ڕەزا.

ساڵی ١٩٩٢ شیعرێکی شێخ ڕەزام دەخوێندەوە کە گلەیی لە شێخ غەفووری مامی دەکات و دەڵێت:

چورسا لەبەرم جوببە و فیسا لەسەرم فێس
نە فێسی لەسەر نام و نە جوببەی لەبەرم کرد

ویستم وێنەیەکی شێخ ڕەزا بە فێس و جوببەوە دروست بکەم و گەلێک پێوە خەریک بووم. من شێخ ڕەزام نەبینیوە، بەڵام رابیعە خانمی کچی و شێخ عەبدوڵلای کوڕی و هەندێک لە کوڕ و کچەزاکانیم دیبوو. لە خەیاڵ و لەسەر شێوەی ئەواندا ئەو وێنەیەم دروست کرد، بەڵام لە پاشا بیرم کردەوە کە کەس شێخ ڕەزای بە فێسەوە نەبینیوە و بە دەسکارییەک، فێسەکەیم بە مێزەر داپۆشی، کە بەرگی ئاسایی شێخ ڕەزا بوو.

لە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری ڕەنگیندا ئەو وێنەیە و هەندێ لە شیعرە سیاسی و

کۆمەڵایەتییەکانی شێخ ڕەزام بڵاوکردەوە. ئەو داوایەی خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی خاڵم بیر کەوتەوە. بەیارمەتیی برایان و مامۆستایانی بەڕێز لە دیوانە چاپ کراوەکانی شێخ ڕەزا و لە کتێبە دەسنووسەکانی هەوادارانی شێخ لەوانە، کتێبە دەسنووسەکەی بەهائەددین ئەفەندیی کەرکووک و شێخی ئالوسی کە لە مۆزەخانەی بەغدادایە و لە دەسنووسەکانی شێخانی بیارە، بەهۆی مامۆستا جەمیلی ڕۆژبەیانی و مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم و مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغییەوە گەلێک شیعری نایابی شێخ ڕەزا دۆزرایەوە. هەر کە زانرا من خەریکی کۆکردنەوەی ئەو شیعرانەم لە هەموو لایەکەوە برایانی بەڕێز یارمەتیان دام و گەلێک شتی نایابیان بۆ ناردم و لەم کتێبە تۆمار کران.

لە ڕاستیدا، ئەم بەرهەمە کە دەیخەمە بەردەستی خوێندەواران، تەنها بەرهەمی من نییە، بەڵکو بەرهەمی دەسەوایەکە هەموو ئەو بەڕێزانە مافی ئەوەیان هەیە بڵێن بەرهەمی هەموانە. قەد لە مننەتی مامۆستا جەمیلی ڕۆژبەیانی دەرناچم کە لەمن پتر تەقەلای دۆزینەوەی شیعرە ون بووەکانی شێخ ڕەزا دەدا و سەراتاپا بە نووسینەکانمدا دەهاتەوە و هەڵەکانی بۆ ڕاست دەکردمەوە. کاک محەمەدی مەلا عەبدولکەریم وەرگێڕانی شیعرە فارسییەکانی بە کوردی خستە ئەستووی خۆی و زۆری پێوە ماندوو بوو و جێی سوپاسمانە. لەوانەی یارمەتییان دام، مامە شێخ عارف شێخ فاتحی تاڵەبانی، کە ئینسکلوپیدیای ڕووداوەکانی شاری کەرکووک و بە تایبەتی گەڕەکی بەرتەکییەیە و زۆربەی ئەو ڕووداوانەی بۆ ڕوون کردمەوە، سوپاسی بێ پایانم بۆ هەمووان.

ئەوەی شێخ محەمەدی خاڵ دەستی پێ کردبوو لە وزەی مندا نەبوو. بەڵام وەکو دەڵێن "هەرکەسە ڕۆڵەی زەمانەی خۆیەتی" لەبەر ئەوەی زۆر پێویست بوو ئەوە بزانرێت کە شێخ ڕەزا ئەو شیعرانەی بۆ چ وتووە و لە چ کاتێکدا وتوویەتی ئێمە ئەم ئەرکەمان خستە ئەستووی خۆمان و ئەم کارەش کارێکی ئاسان نەبوو بەڵام وەکو دەڵێن: بە مەنزڵ گەیشتن لە یەکەم هەنگاوەوە دەس پێ ئەکات.

شێخ ڕەزا بە چوار زوبان شیعری وتووە، زۆربەیان بە کوردی و فارسی و تورکییە. خوێندەوارانی ئێستا زوبانی کوردی و عەرەبی دەزانن و شارەزاییەکی ئەوتۆیان لە زوبانی فارسی و تورکیدا نییە، شیعرە نایابەکانی شێخ ڕەزایش زۆربەیان بەم دوو زوبانەن، ئەمە دەبووە هۆی بێبەش بوونیان لەو شیعرە نایابانە. بە وەرگێڕانی شیعر لە زوبانێکەوە بۆ زوبانێک، ئەو ڕەونەقەی کە شاعیر پێی داوە نامێنێت. بەڵام بلیمەتیی شێخ ڕەزا تەنها

له هۆنینەوەی ئەو لەفزە مرواریيانەدا نەبوو، شێخ ڕەزا پیاوێکی بیرکراوە و لە بارودۆخی سیاسی و کۆمەلآیەتیی ئەو سەردەمە شارەزا و ڕەخنەی لە هەموو کەموکورتیی ئەو بارودۆخە دەگرت، لەبەرئەوە ، هەر هیچ نەبێت، دەبوایێ ئەو بیروباوەڕانەی بخرێنە بەرچاوی ڕۆشنبیرانی کورد کە بزانن شێخ ڕەزا بە بێ ترس و پەروا چ جۆرە رەخنەی لە کەموکورتی و چەوت و چێلیی بارودۆخی سیاسی و کۆمەلآیەتی گرتووە. لەبەرئەوە ئێمە؛ نە ڕێگای دابەش کردنی شیعرەکانی بە پێی زوبان کە کرابووە سێ دیوان بە سێ زوبان لە بەرگێکدا و نەیش شیعرەکانی بە پێی قافیە و پیتی ئەبجەدیمان نەگرت، بەڵکو بە جۆرێکی تر کە بۆ خوێندەواران، دۆزینەوەی شیعرەکانی، ئاسانتر بێت وا ڕێک خران. بۆ نموونە: ئەو شیعرانەی کە لەگەڵ میرانی بەبە و یان میرانی جاف یان ئەمین فەیزی، بە هەر زوبانێک بووبێت لە یەک خانەدا تۆمارکران.

شێخ ڕەزا زۆربەی ژیانی لە کەرکووک و بەغدا بردەسەر، لە هاتوچۆی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی، ئەستەموڵدا پێوەندیی لەگەڵ گەلێک لە پیاوانی سیاسی و ئەدیبی کورد و تورک و عەرەب پەیدا کردبوو، لەو سەردەمەدا کوردستان لە نێوان دوو دەوڵەت، ئێران و عوسمانلی دابەش کرابوو. خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی کورد لە هاتوچۆی سەرانسەری کوردستان سنووری سیاسییان بۆ نەبوو، و بە ناچاری پێوەندییان لەگەڵ هەردوو حکومەتدا پەیدا دەکرد، لەبەرئەوە ، وەکو شێخ ڕەزا ساڵانی ژیانی بەسەر ئەو وولآتانەدا دابەش کردبوو، ئێمەیش، بەپێی ئەوە، دیوانەکەمان، وەکو ژیانی، بەسەر ئەو شار و وڵاتانە دابەش کرد. بۆ ئەوەی لەسەر هەمان زنجیرەی مێژوویيدا بڕۆین، وەکو دەرئەکەوێت، لە یەکەم پلەی ژیانی لە کەرکووک بوو و لەو کاتەدا کاتی عەشیرەت ئارایی بوو، بەڵام کە هاتە بەغدا لێرەدا پێوەندی لەگەڵ گەلێک لە بنەماڵە ناسراوەکان و ڕۆشنبیران و کاربەدەستانی حکومەت پەیدا کرد و وەکو ئەستێرەیەکی گەش لە ئاسمانی ئەدەبدا دەدرەوشایەوە. سەرەڕای ئەمانەیش، شێخ ڕەزا دەریایەک نەبوو مەلەوانیی تێدا نەکات و بەرهەمی هونەری ئەوەندە زۆر و ئەوەندە لقوپۆی هەبوو، لەو خانانەدا جێیان نەدەبووەوە، بە ناچاری، بەپێی مەوزووعی شیعرەکان، وەکو مەدح، هەجو و ستایش و گاڵتە و گەپ... هتد، بەش بەش کرانەوە بۆ ئەوەی، بەپێی فەهرەست، بە ئاسانی بدۆزرێنەوە.

شێخ ڕەزا لە بنەماڵەیەکی کوردە و بنەماڵەی تاڵەبانی دەگەڕێتەوە سەر نێلی زەنگنەی کورد. هەر لە سەردەمی مەلا مەحموودی زەنگنەوە، دێی (ڕەمەزان مامکە) بەجێ دێڵێت

و بۆ ئیرشادی ئایینی لەسەر ڕێبازی قادری دێتە ناوچەی سووورداش و لە پاشان بنەماڵەی لە دێی (تاڵەبان) و لەوێشەوە دێنە شاری کەرکووک. لەو بنەماڵەدا هەر تەنها شێخ ڕەزا شاعیر نەبووە، بەڵکو چەند شاعیرێکی ناسراویان تێدا هەڵکەوتووە، لەوانە شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی. • شێخ قادری برای کە نازناوی (فائز)ە و شێخ محەمەدی کوڕی کە نازناوی (خالصی)یە، بە زوبانی کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی شیعری نایابیان هەیە.

شێخ ڕەزا؛ نەک تەنها شیعرە فارسی و تورکییەکانی پێویستی بە شەرح کردن و لێکۆڵینەوە هەن، بەڵکو شیعرە کوردییەکانیشی ئەوەندە قووڵ و پڕ مانان پێویستییان بە شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆرە، ئەوەیش ئەرکی نووسەر و ئەدیبەکانی کوردە.

شێخ ڕەزا بە شاعیرێکی هەجوکەر ناسراوە. لە شیعرەکانیدا ناوی گەلێک لە ئێلان و پیاوە ناسراوەکان هاتووە. گەلێکیان هەجوێکی توند و تیژ کراون. هەندێ لەوانە شاعیر بوون و توانیویانە بەرەنگاری شێخ ڕەزا بن و ئەوانیش هەجوی ئەویان کردووە، بە پێی دەسکەوتنمان لەگەڵ هەجوەکانی شێخ ڕەزا هەجوەکانی ئەوانیشمان بڵاوکردەوە. لەمە و پێشیش، ئەو بەڕێزانەی کە بەر پەلاری شێخ ڕەزا کەوتوون، نەخۆیان و نەیش کەسوکاریان دڵگیر نەبوون و هەر لە سووچی هونەرییەوە تەماشای ئەو شیعرانەیان کردووە. دڵنیام بە دەرچوونی ئەم کتێبەیش دڵگیر نەبن و پێشەکیش داوای لێبوردنیان لێ دەکەم. هەر بۆ ئەم مەبەستەیش گەلێک ڕاستیمان لە بابەت ئەو بەڕێزانە بڵاوکردووەتەوە. بۆ نموونە؛ لەگەڵ هەجوەکەی (کاکەیی)دا، بە پێی زانینمان ڕاستیی بیروباوەڕ و ڕێبازی ئایینی و کۆمەڵایەتیی کاکەیی کە بەشێکی لە ڕێبازی تایەفەی (ئەهلی حەق) بڵاوکردەوە تاک و بزانرێت ئەو هەموو باڵۆرەیەی کە شێخ ڕەزا بۆیانی ڕێک خستووە، تەنها بە هۆی دووبەرەکیی نێوان عەشیرەتی تاڵەبانی و عەشیرەتی کاکەیی بووە و هیچی تر. ئەگەر ئەو بەڕێزانەی کە شێخ ڕەزا هەجوکردوون تەماشای ئەو هەجوانەی کە بۆ شێخ غەفووری مامی و شێخ عەلیی کاکی و شێخ محەمەد عەلیی برازای کردووە، هیچ دڵگیر نابن. لەناوی ئەوانەی کە بەتوندی هەجو کراون دوو باپیری خۆمی تێدان؛ شێخ محەمەد عەلی باپیرم لە بابەوە و مەلا مارفی مەلا عەبدوللای خدری زەنگنەی باپیرم لە دایکەوە.

لەگەڵ ئەم هەموو تەقەلا و یارمەتیی مامۆستا و برایانی بەڕێز بۆ ئەوەی ئەو کتێبە کەموکورتیی لەوانی پێشوو کەمتر بێت، هیچ گومانی تێدا نییە کە هێشتا کەموکورتی

زۆره و نەک تەنها داوای لێ بوردن، بەڵکو تکا لە خوێنەوارانی بەڕێز و بە تایبەتی نووسەر و ئەدیبان ئەکەم هەڵەکانمان بۆ ڕاست بکەنەوە بۆ ئەوەی ئەگەر شتێک لە عومر ما و توانیمان دووبارە کتێبەکە چاپ بکەینەوە، ڕاستی بکەینەوە.

ئیتر ڕێزی بێ پایانم بۆ ئەو هەموو بەڕێزانەی کە لەم کتێبەدا ناویان بەچاکە و بە خەراپە هاتووە و داوای لێبوردنیان لێ ئەکەم.

د. موکەڕەم تاڵەبانی
بەغدا ١٩٩٨

## شێخ ڕەزا کێیە؟

**بنەماڵەی تاڵەبانی:**

بنەمــاڵەی تاڵەبانی خــۆیان بە تیــرەیەکی ئێلی زەنگنەی کــورد دەزانن، هەر چەندە مــێــژوونـاسی کــوردی بە ناووبانگ مــەحــەمــەد ئەمین زەکی بنچــینەیان دەباتەوە ســەر دانیشتــووانی هەرێمی سووورداش، کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای شاری سولەیمانی، وا دیارە ئەم باوەڕەی لەوەوە هاتبێ کە مەلا مەحموودی باپیرە گەورەی تاڵەبانییەکان یەکێک بووە لە پێشەواکانی ڕێبازی قادری لە ناوچەی سووورداش و ئەم بەهرەیەی لەسەر دەستی شێخ ئەحمەدی لاهووری دا کە بە یەکێک لە نەوەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی ناسراوە، وەرگرتووە و زۆربەی ژیانی خوداپەرستی لەو ناوچەیەدا ڕابواردووە.

مەلا مەحموود بە "زەنگنە" ناسراوە. هەندێک هەن دەڵێن: ئەم ناوبانگەی لەوەوە وەرگرتووە کە زۆربەی ژیانی مەلایەتی لە ژێر سێبەری میر سمایلی زەنگەنەدا ڕابواردووە، وەکو شێخ ئەحمەدی کوڕی ناووبانگی "تاڵەبان"ی لە دێی تاڵەبانەوە وەرگرتووە. بەڵام تاڵەبانییەکان بنچینەی ڕەسەنی خۆیان دەبەنەوە سەر یوسف ئاغای کوڕی ڕۆستەم ئاغای زەنگنە و مەلا مەحموود ناوبانگی مەلایی بەسەر ئاغاییدا زاڵ بووە، لەگەڵ ئەوەیشدا ناوی عەشیرەتەکەی ون نەکردووە.

یوسف ئاغا یەکێک بووە لە پیاوە دەمڕاستەکانی دەوری میر سمایلی زەنگنە. هەر چەندە هەندێک دەڵێن یوسف ئاغا زاوای میر سمایل بووە، باوەڕێکی تریش هەیە کە مەلا مەحموود زاوای میر سمایل بووبێت. لەو سەردەمەدا زۆر کەم کچیان بە بێگانە دەدا. لەو کاتەدا، میر سمایل پەنجەی لەگەڵ میرانی (بەبە) لێ دەدا، ڕێی تێ ناچێت کچی خۆی بداتە پیاوێکی بێگانەی ئێل. لە لایەکی تریشەوە باسێکی وا هەیە کە میر سمایل کچەکەی شێت بووە، لەو سەردەمەدا، بە پێی بڕوای خەلق، شێتی تەنها لەلایەن شێخانی خوا پەرستەوە تیمار دەکرا و میر سمایل ئەو گفتەی داوەتە مەلا مەحمود، ئەگەر کچەکەی چاک بکاتەوە، لێی مارە بکات. ئەمەش زۆر ڕێی تێ ناچێت. چونکە میرێکی بەدەستەڵاتی وا، دەیتوانی بەبێ ئەم گفتەیش ڕوو لە مەلا مەحموود بنێت و ئەمیش پەلپی وای لێ نەگرێت. ئەوەی زانراوە مەلا مەحمود لە ساڵی ١١٣٠ کۆچی لە ناوچەی زەنگنە هاتووەتە دونیاوە زۆربەی تەمەنی لە و ناوچەیەدا، لە دێی "ڕەمەزان مامکە" کە بە "تەکیە"یش ناو دەبرێت، بردووەتە سەر و هەر لەوێوە هاتوچۆی ناوچەی سووورداش و شاری

کەرکووکی کردووە.

میرنشینی میر سمایلی زەنگەنە، دەکەوتە پایینی ڕۆژئاوای چیای قەرەداغ و تا سنووری "داویەی کوردوستان" و دەگەیشتە "ئاوەسپی" و لە باشووریشەوە تا نزیکی شاری کفری، دەستەلاتی بەسەر ئەو هەرێمەدا گرتبوو و بوبووە کۆسپێک لەبەردەم میرنشینی "بەبە"دا چونکە، لەو هەرێمە هەردەیەدا ملی نە بە میرانی بەبە و نە بە دەوڵەتی عوسمانی نە دەدا. لەپاش مردنی میر سمایل بە هانی دەوڵەتی عوسمانلی، میرانی بەبە هێرشیان بردە سەر ئەم میرنشینە و خانەدانی میر سمایلیان سەرنگوم کرد و وڵاتی زەنگنەشیان خستە سەر میرنشینی خۆیان. مەلا مەحموود لەکاتی مردنیدا، داوا دەکات تەرمەکەی لە گۆڕستانی کەرکووک بنێژن و شێخ ئەحمەدی کوڕی دێی ڕەمەزان مامکە بەجێ دێڵێت و دێتە دێی "تاڵەبان"ی نزیکی گۆڕستانی باوکی و لەپاش ماوەیەک بناغەی تەکیەی تاڵەبانی کە لە جێگای ژێر زەوییەکەی تەکیەدا بوو، دادەمەزرێنێت و لەسەر ڕێبازی قادری دەس بە ئیرشاد دەکات. دێی تاڵەبان تاکو ئێستایش بەدەستی شێخانی تاڵەبانی و بەتایبەتی بەرەی شێخ ڕەزاوەیە و هەر لە شێخ ئەحمەددەوە، ئە. بنەماڵە ناوبانگی تاڵەبانییان وەرگرتووە و بەوە ناسراون.

وا دیارە دێی (تاڵەبان) ئەم ناوەی لە دوو وشەوە وەرگرتووە "تاڵە" کە لە درەخ... "تاڵک"ەوە کە ئەم ناوچەیەی داپۆشیوە و "بان" کە دێیەکە لەسەر پێلێکی بانە بەرز دروست کراوە و بووەتە "تاڵە-بان" کە لە کوردەواریدا زۆر ناوی وا هەن.

شێخ ئەحمەدی تاڵەبان (١١٩٤ - ١٢٥٧ه) یانزە کوڕ و چوار کچی هەبووە. هەموو فامیلیای تاڵەبانی لە نەوەی ئەمانەن. ئەم کوڕانە: شێخ عەبدولڕەحمان شێخ عەبدولکەریم، شێخ عەبدولفەتاح، شێخ محێدین، شێخ مەحەمەد ساڵح، شێخ عارف، شێخ عەزیز، شێخ حوسێن، شێخ عەبدولقادر و یانزەمینیان بە منداڵی مردووە، ئەمانە، جگە لە شێخ عەبدولقادر، هەموویان لە گۆڕستانی تەکیەی تاڵەبانی نێژراون و زیارەتگاهی دەروێشانن. شێخ عەبدولقادر؛ هەر بە هەرزەکاری بەرەو باشوور سەری خۆی هەڵدەگرێت و لە ناوچەی ئەلئەنبار (الانبار) دەگیرسێتەوە و بە ناوی فامیلیای (ئەسەد بەگ) بنەماڵەیەکی داناوە، ئێستایش خۆیان بە بنەماڵەی شێخ عەبدولقادری تاڵەبانی دەزانن.

لە پاش کۆچی دوایی شێخ ئەحمەد، شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕە گەورەی، لە جێگای

باوکی بووەتە پۆست نشینی ڕێبازی تاڵەبانیی قادری لە کەرکووک. شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی (١٢١٢-١٢٧٥ه) پیاوێکی خواپەرست و سۆفی ڕەوشت و دانایەکی ئایینی ئیسلام بوو. لە دەوری هەرزەکاریدا، لەسەر فەرمانی باوکی لەلای مەلا داناکانی کوردوستان خوێندوویەتی، لەپاشان لەلای دانای ناسراوی کورد مەلا عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی کۆتایی پێ هێناوە.

ڕۆژێکیان شێخ مارفی کۆسە دێتە لای شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی. شێخ مارف کوڕی نەبوو. دەپرسێت، "شێخ ئەحمەد چەند کوڕت هەیە؟" لەوەڵامدا: "قوربان یانزە"، "یا شێخ زەکاتیان دەکەوێتە سەر". "قوربان عەبدولڕەحمانی لێ دەرچێت هەموو لە خزمەتتان". "ئاوەڵڵاە من عەبدولڕەحمانم دەوێت... هەموو بەهرەی خۆمی دەدەمێ و بە شێخی بۆتی دەنێرمەوە". لەسەر ئەم گفتوگۆیە شێخ عەبدولڕەحمان بە کوڕی مەعنەوی خۆی داناوە و بەهاوشانی لەگەڵ کاک ئەحمەدی شێخ بەهرەی شێخێتی لە شێخ مارفی کۆسە وەردەگرێت و هەر لە ژیانی خۆیدا نیوەی سامانی خۆی دەبەخشێتە شێخ عەبدولڕەحمان و بەو سامانە دووبارە لە ساڵی ١٢٦٠ی کۆچیدا تەکیەی تاڵەبانی دروست دەکاتەوە.

شێخ عەبدولڕەحمان چوار کوڕی هەبووە؛ شێخ عەلی و شێخ قادر و شێخ ڕەزا و شێخ عەبدولواحید. شێخ عەبدولڕەحمان شاعیرێکی بەرز، بە زوبانی تورکی و فارسی لە مەیدانی عەشقی خوا پەرستیدا شیعرێکی زۆری هەیە.

به تورکی لەسەر ڕێبازی قادری دەڵێت:

شــــاه اقلیم ولایتـــــدر گـــروه قـــــادری
راه عـشـــقـده زولکرامـتـدر گـروه قـادری
جــــمله ارباب طریقت بلبل شـــوریده‌در
آنلره باغ مـــضـــافـــتـــدر گـروه قـــادری

واتا:

شای ئیقلیمی وەلییەتە دەستەی ڕێبازی قادری
لەڕێی عەشقدا خاوەن کەراماتە دەستەی قادری
سەر لەبەری خاوەن ڕێبازی دەروێشی بولبلی هەرا هەڵگیرسێنەرن
باخی مێوانداریی ئەوانە دەستەی قادری.

مێژوناسی کورد ئەمین زەکی بەگ لەسەر شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی دەڵێت: چەند

کتێبێکی هەیە، ئەمانەی لەچاپ دراون: (دیوانی شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی) و (شەرحی مثنوی مەولانا جەلالەدین رومی) و (بهجة الاسرار) بە تورکییە و گەلێک لە شیعرەکانی (فضولی بیاتی بغدادی)ش پێنج خشتە کردووە.

لە غەزەلێکی فارسیدا دەڵێت:

ای کـه در هر ذره‌ء تابان بـود سـیـمـای تو
در دل هـر قطـره‌ء پـنهـــان بـود دریای تـو
لمعــهء از برق حـسنت بر رخ لیلی نیــافت
برق بر مجنون زد و مجنون شد از سودای تو

واتا:

ئەی کەسێ کە سیمای تۆ لەهەر تۆزقاڵێکدا تیشک ئەداتەوە و
لەنا و دڵی هەر دڵۆپێکدا دەریای تۆ شارراوەتەوە
تیشکێکی لە تیشکی جوانیی تۆ بەڕووی لەیلاوە نەدی
تیشکی دا لە مەجنوون و لە عەشقی تۆدا شێت بوو

لەدەمەتەقێیەکدا لە نێوان عەقل و عەشقدا لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێت:

عـقل مـیگوید بەمـن همـه مم کە ترک یارکن
عشق میگوید کە هی هی ترک این گفتار کن
عـقل مـیگوید برو باسـجـده و سجـاده باش
عــشق مــیگوید برو تسـبـیـحـرا زنار کن
عـقل مـیگوید بپـوش آخـر لبـاس عـاقـلان
عـشق مـیگوید کـه ترک جبـه و دسـتـار کن
مـن نمیــدانم کــدام این نکتــەرا باور کنم
ای خـدایا بر دلم تـو کـشـف این اسـرارکن

واتا:

ئەقڵ هەرجار پێم دەڵێ دەست لەیار هەڵگرە
عەشقیش دەڵێ: هەی هەی؟ واز لەم قسەیە بێنە
ئەقڵ ئەڵێ: بڕۆ لەگەڵ بەرماڵ و سوجدە بردن بە

عەشقیش ئەڵێ برۆ تەسبیحت بکەرە زوونناری گاوران
ئەقل ئەڵێت: کوڕە بەرگی ئاقڵان لەبەرکە
عەشقیش ئەڵێ: واز لە جوببە و مێزەر بێنە
من نازانم باوەڕ بە کام لەم قسانە بکەم
خوایە! ڕازی ئەم نهێنییانە توو بۆ دڵم دەرخە.

لە پێنج خشتەی غەزەلێکی مەغربیدا دەڵێت:

زشـــور بادهء عـــشـــقت چنان سـرمــست و حـيـرانم
شـعـوری نیــست تا دانم کـه کـافـر یا مـسلمـانم
ولی از جلوهء حـــســن تو جـــانا این قـــدر دانم
"گـه، از روی تو مـجـمـوعم گـه، از زلفت پریشـانم
وزیـن در ظلمـت کـــــفــــــرم وزان در نـور ایمـانم

واتا:

لە شۆری بادەی عەشقدا وا سەرمەست و حەیرانم
هەستێک نییە تا بزانم کافرم یان موسوڵمانم
لەجیلوەی جوانیی تۆدا، ئەی گیانە ئەوەندە ئەزانم
کە ڕووی تۆ دەبینم خۆم کۆدەکەمەوە و دێمەوە سەرخۆ
کە زولفت دەبینم وەکوو ئەو پەرێشان و پرشوبڵاو ئەبم

لەپێنج خشتەیەکی تورکیدا، شێخ ئەم پرسیارانە دەکات:

عــجــبــا دهره صــالان شـور قــيــامت بومــيــدر؟
عــالمه شــعـله ويرن عــارض و قــامت بومــيــدر؟
مــست ایدوب جـاذب ارباب کـرامت بومــيــدر؟
عــجـبـا گـوکلمی صــيــد ایلین آفت بومــيــدر؟
بنی مـــجــروح و پریشـــان ایدن آفت بومــيــدر؟

واتا:

ئایا ئەوەی هەرای قیامەتی خستووەتە دونیاوە ئەمەیە؟
ئەو بەدەن و قامەتەی کە بڵێسەی داوەتە کەون ئەمەیە؟
ئەوەی خاوەن کەراماتی مەست و ڕاکێشاوە ئەمەیە؟

ئایا ئەو پەتایەی کە دڵمی خستووەتە داوەوە ئەمەیە؟
ئەو پەتایەی منی بریندار و پەرێشان کردووە ئەمەیە؟

لەبابەت تەصەووف و خواپەرستییەوە لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت:

ظن ایدر جـــــاهل اولانلر بزلری دیوانەیز
بز جـمـالی یاری گـورمش بر طاقم مـسـتـانەیز
اهل ظاهرلر نەبیلســـون اهل باطن حـــالنی
عـشق مـیـداننده جـان ویرمش عـجب مـردانەیز

***

طالب اسـرار حـقـز کـیـمـسـه بیلمـز بز نەیز
شـوق مـحـیـرنده بویومش لانظیـر در دا نەیز
بزلری طعن ایتـمـه ای واعظ بو قـیل و قـال ایله
فـهم قـیل احـوالمز ظن ایتـمـه بز افـسـانەیز

واتا:

ئەو کەسانەی نەزانن وا دەزانن ئێمە دێوانەین
ئێمە جوانیی یارمان دیتووە دەستەیێ مەستانەین
ئاشکەرازان چۆن بزانێت حالی نهێنیزان چییە
لە مەیدانی عەشقدا گیانیان داوە چۆن مەردانەین
داواکەری نهێنیی خوداین کەس نازانێت ئێمە چین
لە حەیرانی شەوقیدا گەورە بوو دانە دورێکی بێ هاوتاین
تیرمان تێ مەگرە ئەی واعیز بەم قیل و قالەوە
لە حاڵمان بگە وا مەزانە ئەفسانەین.

لەم بنەماڵەدا، شێخ قادری کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانیش (١٢٥٠-١٣١٥)ی کۆچی شاعیرێکی بەرز و لە زوبانی عەرەبی و تورکی و فارسیدا شارەزا بووە و پیاوێکی دیندار و قانیع، لە شیعرێکی تورکیدا هەستی خۆی دەردەخات و دەڵێت:

نەکسب مال ایچون سعی و نە جاهە رغبتم واردر
قناعت چوق یشاسون، سایەسندن راحتم واردر

یوق ایسـه گنج و مـالم، حکمـران ملک عـرفـانم
سـوواد اعظم فـقـرایله گنج وحـدتم واردر
شکسـته کاسه‌می خوان شهـه ویرمم کـه کاسمـده
طعـام أمن و آسـایش گـبی بر نعـمـتم واردر

واتا:

نه بۆ کۆکردنی سامان عه‌ودالم و نه بۆ جاه ئاره‌زووم هه‌یه
هه‌ر بژی قه‌ناعه‌ت له سایه‌یدا حه‌سانه‌وه‌م هه‌یه
هه‌ر چه‌نێک گه‌نجینه و سامانم نییه، حوکمرانی مۆڵکی خواناسیم
له‌گه‌ڵ جه‌ماوه‌ری هه‌ژاراندا گه‌نجینه‌ی یه‌کێتیم هه‌یه
که‌یله شکاوه‌که‌م به خوانی شا نادەم که له کاسه‌مدا
نیعمه‌تی خۆراکی وه‌کو ئاسووده‌یی و ئاسایشم هه‌یه.

شـێخ ڕه‌زا سێ کـوڕ و سێ کـچی هه‌بوو. کـوڕه‌کـانی: مـه‌حـه‌مـه‌د و مـه‌حـه‌مـه‌دئه‌مین و عه‌بدوللا و کچه‌کانیشی ڕاضیه و مه‌رضیـه و ڕابیعه. شێخ مه‌حه‌مه‌د له ده‌وری داگیردنی کوردستان له‌لایه‌ن ئینگلیزه‌کانه‌وه، ده‌کرێته قائمقامی قه‌زای رانیـه و له‌پاشا قائمقامی کفری. مه‌حه‌مه‌دئه‌مین به هه‌رزه‌کاری مرد و شێخ عه‌بدوللا، له‌پاش کۆچی باوکی، شێخ عـه‌لیی مـامی کـچی خۆی ده‌داتێ و ده‌یکاته مـتـه‌وه‌للی ته‌کیـه‌ی تاڵه‌بانی له به‌غـدا. ڕاضیه: خێزانی شێخ حه‌بیبی شێخ عه‌لی تاڵه‌بانی بوو، مه‌رضیـه خێزانی شێخ غالیبی شێخ حه‌میـدی تاڵه‌بانی و رابیعه‌یش خـێزانی شاعیـری تورکی ناسراو محه‌مه‌د راسیخ کوڕی قادر ئه‌فه‌ندیی کوڕی ئه‌حمه‌د ئه‌فه‌ندیی یالاو بوو.

شێخ محه‌مه‌دی کوڕی شێخ ڕه‌زا، مرۆڤێکی ڕۆشنبیر و شاعیر بوو. که قائمقامی رانیه ده‌بێت، شێخ مه‌حمودی حوکمداری کوردستان فه‌رمان ده‌دا و سوپا ده‌نێرێت رانیه داگیر ده‌که‌ن و ماڵی شێخ محه‌مه‌د تالان ده‌که‌ن. شێخ محه‌مه‌د له‌گه‌ڵه‌ییدا ئه‌م شیعره ئه‌نێرێت بۆ شێخ مه‌حموود.

له‌پاش داوێن و ده‌ست مـاچ کـردن و عـه‌رضی دوعـا خـوانی
وه‌ڕین ده‌ست پێ ده‌کـا به‌چکه‌ی گـه‌مـاڵی پیـری گـه‌یلانی
ده‌ڵێ بۆچی منت ده‌رکـرد؟ ئه‌گـه‌ر پاست نه‌کـه‌م به‌خـوا
هه‌مـوو چه‌ڵتـوکـه‌کـه‌ت ده‌خـوا به‌رازی قـوطبی ڕه‌ببـانی

یەکانە و پەلخ و مالوسی قەوی قولیان گەلێ زۆرە
بەری ملیان لەکوێ دەگرێ پشیلەی کانی ئاسکانی؟
لە ڕۆژی وا پیاوێ چاترە بۆتۆ لە پێنج صەد کەس
هەزاری لیرەیێ ناکا دە پارە و پوول و تارانی
هەموویان دوژمنێ، نەک دۆستی تۆن ئەو گیپە خۆرانە
کە ئیمڕۆ تۆ وەلی نیعمەت و ئاغای هەموویانی
هەموو شێر و پڵنگن وەقتی نان خواردن لە ئەترافت
سمێڵ بابڕو کفن دڕ کەللە خڕ، پەرچەم مەریوانی
دوعات با بۆ بکەن ئەمما بە تەدبیریان نەکەی زینهار
مەلا و دەروێش و صۆفی و شێخەکانی لوقمە باطمانی
ئەمانە گشت قسەن، با بێمە سەر مەطلەب وەکو عورفی
لەسەر ئەم مەطلەعە لادەم بچم بۆ مەطلەعی ثانی
لەپاش تالان و عەزل و لانەوازی و خانە وێرانی
حەوالەی خۆت دەکەم قوربان، چلۆن بێم بۆ سولەیمانی؟!

لێرەدا دێتە سەر مەطلەعی فارسی و دەڵێت:

الا ای خستەیی پیکان مژ گانت دل اخوان
الا ای گستەیی همراز دوریت پیر کنعانی
توبا یاران همان کردی کە باید کرد بادشمن
توبا دشمن چونان کردی کە اورا رنجە نتوانی
بهر سوە بود دلخواهی توراچشمش برون کردی
زهر کو دشمنی یابی ورا بر چشم بنشانی
اگر بر جستوجوی تست اینها وای بر دلها
وگربی آرەزوی تست این نبود حکمرانی

دووبارە دەگەڕێتەوە سەر کوردی و دەڵێت:

لەبەر چاوت وەکو یەک وایە بێ فەرقن لە خزمەتتا

شەهێن و حاجی لەقلەق، شێر و ڕێوی، مورشید و جانی
لە کوێت دۆزینەوە ئەم کوێر و قۆڕانەی لە خوا یاخی؟*
چلۆنت کەوتە خاطر مشکە کوێر و ورچی کوێستانی؟
کەر و گا خەرجی بار و جووتە، هێستر مالی کاروانە
ئەمانە نابنە کوێخا و ڕەئیس و میری دیوانی
بەیار کێلان و گای لەڕ، پیر و کچ خواستن، ژن و تەدبیر
سەگ و جۆ، ئەسپ و ئێسقان، بۆق و سەردار، جرج و ناوکانی
عەبا و کەر، فێس و ڕێوی، ورچ و شەپقە، مێزەر و مەیموون
حەیا و کوێر، شەرم و دۆم، قەحپە و وەفا، ناموس و سۆزانی؟

***

لەڕێ دووبارە لادەم با بچم بۆ مەطلەعی ثالث
بڵێم هەی پاسەوانی میللەت و ڕێگەی موسڵمانی
وجوودت فەخرە بۆ من، چونکە لای من فەخری کوردانی
نەوەی کاک ئەحمەدی، نوطفەی حوسێنی، شێری یەزدانی
جەنابی تۆ لەحەق من، زۆر لە خۆم موشفیقتری ئەمما
لە بەختی نەحسی من فکرت خراپە، زۆر بەنسیانی
هەتیو چیت وت؟ زوبانت وەرگەڕێ خەڵطێکی گەورەت کرد
لەلای خۆت شاعیری هێشتا قسەی پیاوانە نازانی؟
فەلەک مل شۆڕ ئەکا ئەمڕۆ لەبەر پێی ئەسپی شێخ مەحموود
مەلەک مەجبوور ئەکا ئەمڕۆ ئیطاعەی ئەمر و فەرمانی
خراپەی چاکەیە، زامی شیفایە، حیددەتی حیلمە
جنێوی فەخرە، تالانی عەطایە، عەفوە عینوانی
کەرەم کار و وەفادار و وەلی خولق و عەلی کردار

* کوێر: مەبەستی لە بابەکر ئاغای پشدەرە کە چاوێکی کوێر بووە و (قۆڕ)یش مەبەستی هەباس ئاغای پشدەرە کە قۆڕ بووە.

طەبیـــعـــەت چاک و طینەت پاک و دڵ بێ باک و نوورانی
ئەگـەر چی مـوفلیـست کـردم لەناو خـەلقـا حـەیات بردم
خـــوا تۆ خـــۆش بکا، با مـــاڵ و رووحم بێ بە قـــوربانی
ئەمـەندە باری طەعنەی کـەوت بەملدا (خـالیـصی) ئەمـڕۆ
دەهات بۆ خـزمـەتت قـوربان، فـەقـەط زامـداره سـەرشـانی

***

### زنجیرەی بنەماڵەی تاڵەبانی لە هەڵبەستێکی شێخ ڕەزادا:

شێخ ڕەزا، لە شیعرێکی کوردیدا باسی زنجیرەی باوباپیری خۆی دەکات و دەڵێت:

خـوداوەند حـەز بکا وەقـتێ بەندەیەکی خـۆی بکا خـۆشنوود
لەڕێگەی دوورەوە بۆی دێ بە پێی خۆی قاصیدی مەقصوود
لە هیـندوستـانەوە شـەش مـانگە ڕێ تا خـاکی کـوردوسـتـان
خوا شێخ ئەحـمـەدی هیندی ڕەوان کـرد بۆ مـەلا مـەحـمـوود
مـەلا مـەحـموودی زەنگنە یەعنی قـوطبی دائیـرەی ئیـرشـاد
لە دەوری مـەرقـەدی هەر دەنگی یاهو دێت و یا مـەعـبـود
لە پاش ئەو ئەرشدی ئەولادی شێخ ئەحمەد لە جێی دانیشت
بە عـەینی وەک سـولەیمان جێ نشـینی حـەزرەتی داوود
بەڵـێ بابی وەها ئەلبــــەت دەبێ فــــرزەندی وا بێـنێ
ئیـلاهی صـەد هەزار ڕەحـمـەت لە قـەبری والیـد و مـولود
بە ڕەحـمـەت چوون ئەوان بابێـینە سەر باسی ئەوڕەحـمـان
فـیدات بم ئەی نەتیـجەی دوودەمانی ئەحـمـەد و مەحـموود
نەتیـجەم مـەقـصـەدە تالی و مـوقـەددەم شـەرتی تەحصـیلە
ئەوانەی بۆیە ئیـجـاد کـرد خـودا تا ئەم ببێ مـەوجـوود
ئەمیـستـاش (شێخ عەلی) ئەجلی کەبیری صاحیب ئیرشاد
ئەمیـش وەک بـاوک و باپیـری لەزومـرەی ئەولیـا مـەعـدوود
(ڕەزا)یش لەو نەسلەیە بیبەخشە یارەب چونکە قەد نابێ

گـولـی بێ خــار و بەحــری بێ بوخــار و ئاگــری بێ دوود

شێخ ڕەزا لە شـیـعـرێکی فـارسـیـدا کـە باسـی شـێخ عـەبدولڕەحـمـانی باوکی دەکـات، بنچـینەی تاڵەبانـی دەباتە سەر تـیرەی کاکەسووری (گـولی)، ئەو تـیـرەیەی کە خۆیان بە ساداتی بەرزنجە دەزانن، بەڵام بۆ ئەمە هیچ بەڵگەیەکی نییە.

بۆ ئەمە دەڵێت:

مـشــهــور جـهــان بغـوث ثانی عــبـدالرحــمن طالبــانی

مـحـمـودش جد و احـمـدش باب، هرسی ولیند قطب اقطاب

مـحـمـود مریدی پیـری لاهور هەرچەند بە زنگنە است مـشـهـور

در اصل ونسب (گلی) است سـووی از گلبن باغ کـاکـە سوری

واتا:

عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی، بەناوبانگ بە غەوسی دووەم

مەحمود باپیری و ئەحمەد باوکیەتی

هەرسێ وەلی و قوتبی ئەقتابن

مەحموود مریدی پیری لاهور، هەر چەند بە زەنگنە بەناوبانگە

لەبن و بنچینەدا (گولی) و (سووری)یە، لە چەپکە گوڵی تاخی (کاکە سووری)یە.

دەڵێن، دەروێشـان لە شێخ عـەلی داوا دەکـەن کە بە قـووڵی لە بنچـینەی شـێخـانی تاڵەبانی بکۆڵێتەوە بەڵکو دەچنە سەر نەوەی ئیمام حوسێن.

دەڵێت: لەبەرچی؟ ئەگــەر بۆ ئەم دونیــا بێت، لە ســایەی خــوداوە لە دونیــا لە هیچمان کەم نییە و ئەگەریش بۆ ئەو دونیا بێت، ئەوە لە زانینی خودادایە.

کەواتا: شێخ ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ ئەحمەدی تاڵەبانە کە کوڕی مەلا مەحموودی زەنگنەیە.

***

## شێوەی ژیانی شێخ ڕەزا

### تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک

لە پێش دروست کردنی تەکیـەی تاڵەبانی لە کەرکوک؛ لەسـەر داوای خۆی، تەرمـەکـەی مەلا مەحـموودی زەنـگنە، کە باپیـرە گـەورەی شێـخـانی تاڵەبانییـە، لەجـێگای مـەرقـەدی

ئێستای بە خاک سپێرراوە. شێخ ئەحمەدی کوڕی، بۆ نوێژ کردن، ژوورێک و هەیوانێک دروست دەکات. ئەم تەکیەی ئێستای کەرکووک، لەپاش کۆچی شێخ ئەحمەدی تاڵەبان، شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی کە بووە بە پۆست نشین لە ساڵی ١٢٦٠ی کۆچیدا دروستی کردووە. ئەوەی شایانی سەرنجە، بۆ گەیاندنی ئاو بۆ تەکیە، بەهێزی بازووی دەروێشان، یەکێک لە زنجیرەکانی چیای زاگرۆس، بە نووکە قولنگ شەق دەکەن و لە ڕووباری (خاسە)وە ئاو دەگەیێننە حەوشی تەکیە.

یەکێک لە شاعیران، مێژووی دروست کردنی تەکیەی لەم شیعرە فارسییەدا داناوە و دەڵێت:

تعالی الله چه مسجد قصر گلزار جنان است این
سروشانرا مطاف کعبهء کروبیان است این
جناب مرشد کل، قطب دوران کرده است انشا
مفیض خلق عالم مرجع اهل جهانست این
کمال آینش ز آن رخصت گرفت گفت تاریخش
مصلی معبد قطب و مطاف قدسیانست این (١٢٦٠)

ساڵی ١٢٨٥ دووبارە دەستێکی تریشیان بە تەکیەدا هێناوەتەوە. ئەم تەعمیرە لە سەردەمی شێخ عەلیی کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان دەبێت کە شێخ ڕەزا بە شیعرێکی تورکی دەڵێت:

خیالی ترک ایدوب آلکدم بو تأریخی حقیقتدن
بهشته سلسبیله کوثره طوبایه بنزرسک

واتا: وازم لە خەیاڵ هێنا و ئەم تاریخەم لە ڕاستی وەرگرت
(لە بەهشت، سلسبیل، کەوثەر وطوبا دەکەویت)

بەپێی ئەمە دەکاتە ١٢٨٥ھ

یارمەتیی دەروێشان و دانیشتوانی شاری کەرکووک؛ ئەم ئەرکە قورسەی بۆ شێخ عەبدولڕەحمان ئاسان کردووە و شێخ خۆی لەم بابەتەوە لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێت:

گەر بیایی بە تەماشاگە ویرانەء ما
بینی از نیست معمرّ شدە کاشانەء ما

همــه عــالم کلمــات انده بور مــعنیء هو
درس این است درین مکتب شــاهانهء مــا

واتا:

ئەگەر بێی بۆ تەماشای وێرانەمان
دەبینی لە نەبوون ئاوەدان کراوە کاشانەمان
هەموو دونیا وشەی ئەوەیە کە مانای ناوی خودایە
ئەو دەرسەیە لە قوتابخانەی شاهانەمان

***

## ژیانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی

شێخ ڕەزا لە ساڵی ١٢٥٣ی کۆچیدا لە دێی (قرخ)ی نزیکی شارۆچکەی چەمچەماڵ هاتووەتە دونیاوە. باوکی شێخ عەبدولڕەحمان و دایکی صافیە خاتوونە. لە سەرەتاوە خوێندنی لە لای شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی و لەپاشان لەلای مەلا محەمەدی بلاغ و مەلای دانا حاجی مەلا سەعید زانیاری نەحو و صەرف و مەنطیق و بەدیع و بەیان و فیقهی خوێندووە. لەپاشان بۆ تەواو کردنی ئەم زانیارییانە، دەچێتە شاری کۆیە و لە خزمەتی مەلای دانا مەلا ئەسعەدی جەلیزادە پایان بە خوێندن دێنێت.

شێخ ڕەزا جگە لە زمانی کوردی، شارەزاییەکی زۆری لە زمانی تورکی و فارسی و عەرەبیدا پەیدا کردووە بەم چوار زمانە شیعری زۆر نایابی وتووە. مامۆستای بەڕێز مەحموود شوکری ئالوسی ئەڵێت: "شیعرەکانی شێخ ڕەزا زۆربەیان بە زوبانی غیر عەرەبیی، هەندێکی بە تورکی و هەندێکی بە فارسی و بە کوردین. ئەو بە گوێرەی ڕەواجی ئەو زوبانەی لەو شارەدا شیعر دەڵێت. شیعرە عەبییەکانیشی بێ گەردن و هیچ لەنگ نین، بەڵکو بە هەموو ئەو زوبانانە شاعیرە. ئەمە خاوەنی ئەدەب و فەصاحەت و بەیان دەیسەلمێنن." (کتێبە دەسنووسەکەی ئالووسی... کتێبخانەی مۆزەی بەغدا).

شێخ عەبدولڕەحمان هەر لەسەرەتاوە؛ شێخ عەلیی کوڕی بە بیر و زانستی ڕێبازی ئیسلامی و خواپەرستی، بۆ پۆست نشینی داهاتووی تەکیەی تاڵەبانی پەروەردە ئەکات، شێخ ڕەزایش، لەکاتی ژیانی باوکیدا؛ ئەوەندە بە تەنگی مایەی گوزەرانەوە نەبووە و بەو گوزەرانە دەروێشانەی کە باوکی بۆی ئامادە ئەکرد قاییل و مل کەچ بوو. بەڵام هەر لە ماوەی ژیانی باوکیدا. دەیویست لەو سنوورە تەسکەی ژیانی تەکیە و دەروێشی بێتە دەر

و بچێته جیهانێکی فراوانترەوە. هەر وا، یەکەم چوونی بۆ پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی، ئەستەموڵ. لە زەمانی شێخ عەبدولڕەحمانی باوکیدا بوو و لە گەڕانەوەیدا خەبەری مردنی دەزانێت. ئەوەی جێی سەرنجە، بەرهەمەکانی ئەم سەردەمەی شێخ ڕەزا، زۆربەی لەچوارچێوەی، بیری خواپەرستی و دەروێشیدا بوو. چونکە بارودۆخی ئەو سەردەمەی تەکیە و دەسەڵاتی شێخێکی خواپەرستی وەکو باوکی ڕێگای ئەو جۆرە وشانەی نە ئەدا کە لە پاش مردنی باوکی بەسەر زمانیدا دەهات. وەکو زانراوە، سەرەتای هونەری شیعری شێخ ڕەزا، بە زمانی فارسی لەسەر شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە.

لە پاش کۆچی دوایی باوکی، شێخ عەلیی برا گەورەی بووەتە پۆست نشینی تەکیە و لەبەر ئەوەی مەلایەکی دانا و شێخێکی خواپەرست بووە بە ڕاستی ئەو جێگایەی پڕکردووەتەوە و تەکیە؛ نەک تەنها کۆڕی دەروێشان، بەڵک و زیارەتگای مەلا و داناکانیش بوو.

نیتر ئەو نازەی کە شێخ ڕەزا بەسەر باوکیدا دەیکرد نامێنێت و شێوەی ژیانیش دەگۆڕێت و شێخ ڕەزایش خۆی لە چەمەری دەرویشی ڕزگار دەکات و دەکەوێتە ناو گێژەنکەی ژیانێکی فراوانترەوە. هەرچەنێک شێخ عەلی لە شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی دەسرۆیشتووتر بوو و ئازووقەی ماڵ و خەرجیی براکانی لە مل گرتووە، بەڵام ئەمە تەنها ژیانێکی دەروێشانە مسۆگەر دەکات و هیچی تر. ئەمەیش لەگەڵ دەروێش ڕەوشتێکی وەکو شێخ قادری برای پێی قایل بێت، هەموو داواکانی شێخ ڕەزای بۆ جێبەجێ ناکرێت و شێخ ڕەزایش نەدەگەڕایەوە دۆخی دەروێشیی جاران، لە شێخ عەلی دەتۆرێت و دەچێتە لای شێخ غەفووری مامی لە کۆیێ، بۆ ئەوەی هەندێ پارەی لێ وەرگرێت و بچێتە ئەستەموڵ.

شێخ غەفوور نایەوێت ڕەزای برازای لە وڵاتێکی غەریبی وەکو ئەستەموڵ سەرگەردان بێت و گفتی دەداتێ کە کچی خۆی لێ مارە بکات و لە تەکیەی کۆیێ جێگایەکی ڕێزداری بداتێ. بەڵام شێخ ڕەزا نەیدەویست دووبارە بگەڕێتەوە ژیانی تەکیە و دەروێشی، لەمامی دەکەوێتە گلەیی و لە پاشان هێرش بردنە سەری و کە باسی ئەو ڕووداوە ئەکات ئەڵێت:

ئەو ڕۆژە کە تۆرام و لە کەرکووک سەفەرم کرد
مانەندی عەقارب لە ئەقارب حەزەرم کرد

گـــەردوون ســـینگی گـــردم و هێنامـــیـــە کـــۆێی
مـــیـــوانی لەکن مـــامــە غــەفــووری لەجــەرم کـــرد
خـواســتـم کـە بڕۆم بۆ سـەفـەری ڕۆم بە ســیـاحـەت
نەیهێشت و دوو سەد ئەهلی عەمامەی لە سەرم کرد
دانیـشـێ، نەچێ، من کـچی خـۆم مـارە دەکـەم لێی
ئەو طالبی دونیـــایە ئەوا مـــوعـــتـــەبەرم کـــرد

ئەم ژیانەیشی بەدڵ نابێت و سەفـەری ئەسـتـەمولیشی سەر ناگرێت، لەوە پەشیـمـان ئەبێتەوە کە لەگەڵ شێخ عەلیی کاکی تێکی داوە و ئەڵێت:

صـەد دەفـعـە وتم وەختێ کـە دیم نەخـوەتی قـەلبی
یارەب کـە لەگـەڵ شـێخ عـەلی بۆچی شـەڕم کـرد
هەر دەچمـــەوە لای گـــەرچی بڵێ هاتەوە دیســـان
ئەو خـــۆێڕی بێکارە کـــە من لێـــرە دەرم کـــرد

بەڵام واز لە سـەفـەری ئەسـتـەمولّ نایێنێت، چونکە لەکـاتی ژیانی باوکیدا سـەفـەرێکی ئەوێی کردبوو و لە گەڕانەوەدا خەبەری مردنی باوکی بیست. دووبارە بەهەر جۆرێک بێت دەڕواتەوە ئەستەمولّ. لەوێ لەگەڵ گەلێک لە ئەدیب و ڕۆشنبیران و پیاوە سیاسییەکانی کورد و تورک ناسیاوی پەیدا ئەکات و لە کاروباری سیاسیی دونیا و دەوڵەتی عوسمانی شارەزا دەبێت، وەکو لەم شیعرە فـارسـیـە باسی ڕووداوەکـانی ئەو سـەردەمـەی ئەورووپا دەکات:

بە بزم عـشق مگرجـز حـدیث مـهـروو فـا
مـــرا بکار نیـــاید قـــران (ناپلیـــون)
مـرا از ان چە کـە فـیروز گشت (بسـمـارک)
مـرا ازان چە کـە پامـال گشـت (ماکـمـاهون)

واتا:

لە بەزمی دڵداریدا لە ڕاز و نیازی (میهر و وەفا) بەولاوە هیچ بەدەردی من نایەت
قرانی (ناپیلۆن) هیچ بە کەڵکی من نایەت
من لەوەم چی کە (بسمارک) سەرکەوت؛

من لەوەم چی کە (ماکماهۆن) لە ژێر پێدا سوایەوە؟!.

لە ئەستەمولّ، میللەت لە سولّتان عەبدولحەمید کەوتبووە تەقەوە و داوای مافی دیموکراسی و دانانی یاسای بنەڕەتی (قانونی اساسی) دەکرد. شێخ ڕەزایش لە دژی سولّتان لایەنگیری میللەتی دەکرد، بەلاّم لە ئیتحادییەکانیش بەداخ بوو. بە سولّتان دەلّێت:

دوشمنه قارشی کدی، میللەته قارشی اصلان

لعنة الله علی حـــضـــرة هذا السلطان

واتا:

بەرامبەر دوژمن پشیلە و بەرامبەر میللەت شێرە

لەعنەتی خودا لە حەزرەتی ئەم سولّتانە بێت

لەپاش ئەوەی سولّتان بە ناچاری مل کەچ دەبێت و قانوونی ئەساسی دادەنێت، خەلقی وا دەزانن تەنها ئەم یاسایە چارەسەری هەموو گیروگرفتی وولاّت دەکات. بەلاّم ئەم هەلە (ئیتحادی)یەکان دەیقۆزنەوە و لە ڕەگەز پەرستیدا لە جاران خراپتر دەبێت و ئەوان ولاّت دەبەنە ڕێوە. شێخ ڕەزا نارەزایی دەردەبڕێت و دەلّێت:

ملکک اصلاحنه بر میتی ایتمش مامور

آفـــرین قـــوهء ادراکنه باب عـــالی

واتا:

بۆ چارەسەرکردنی ولاّت مردوویەکی کردووەتە مەئموور

ئافەرین بۆ هێزی هەستت ئەی (بابی عالی)

لەپاش دانانی یاسای بنەڕەتی (قانون اساسی) بارودۆخی ولاّت خرابتر بوو ئیتحادییەکان ئەو هەلەیان بۆ خۆیان قۆزتەوە و ژیانی میللەتانی تر خرابتر بوو. شێخ ڕەزا دەلّێت:

بیچاره عدالت کە ییقمشدی بناسی

بردن ایچنه سیچدی بو قانون اساسی

واتا: بێچارە عەدالەت کە بناغەی ڕووخابوو

بەجارێک ئەم قانوونە ئەساسییە گووی تێ کرد

ژیانی کۆمەڵایەتیی تەکیـە و گەڕەکی بەرتەکیە؛ پەروەردەیەکی تایبـەتی شـێخ ڕەزای کـردبوو. لە سـەرووی تەکیـەوە، لە دیواخـانی شـێخ عـەلیی کـاکی، مـەلا و داناکـانی کوردستان و پیاوە ناسراوەکانی ئاییني کۆڕیان دەبەست و باسی زانستی ئیسلامی دەکرا و لەلایەکی تریشـەوە کـۆڕی دەروێشـان دەبەسـترا و لەسـەر دەنگی تەپڵ و دەف گـۆرانیی خواپەرستی و خۆشەویستیی پیرانی تەریقەت دەوترا. لە سووچێکی تریشەوە شێخ قادری برای، لەبەر دەست کـورتی خـۆی خزانبـووە ژوورێکی تـاریکەوە، بەڵام بە و بیـرە ڕۆشنەی هەمـوو تاریکیی ژیانی دامـاڵی بوو و تەنهـا گلەیی حاڵی خـۆی و سکاڵای دڵی لەگەڵ خوایدا بەنهێنی دەکرد کە لە شیعرێکی تورکیدا دەڵێت:

بنای عـیـشــمی قـهـریله ویران ایلین مـعـمــار
أمیـدم وار کـه دسـتی لطفـیله مـعـمـور ایدر برگـون

واتا: ئەو وەستایەی کە لەکاتی تووڕەییدا خانەی ژیانمی وێران کردووە
هیوادارم کە ڕۆژێک بە دەستی بەخشندەی ئاوەدانی بکاتەوە

شێخ قـادر، عیـزەتی نەفسی زۆر گەورە بوو، هەرچەنێک شێخ عەلی درێغیی هیـچی لێ نەدەکرد، بەڵام لە ژیانی دەروێشی بەولاوە چی دەکات، شێخ قـادر بەوەش شوکرانەی خوای دەکرد.

نەکسب مـال ایچون سـعی و نه جـاهه رغبـتم واردر
قناعت چوق یشـاسـون سـایەسنده ڕاحـەتم واردر

واتا:
نە بۆ سامان کۆکردنەوە تێدەکۆشم و نە بۆ جاه مەیلم هەیە
هەر بژی قەناعەت لە سایەیدا ئاسوودەییم هەیە.

شێخ ڕەزا وەکوو شـێخ قـادر نەبوو. بەشداری لە سامـانی برا و مامەکانی بە مـافـێکی ڕەوای خۆی و کەم و کورتی لە چاوی ئەوانی دەزانی وەکوو دەڵێت:

بێگـانـە هەمــوو صــاحــبی جــاه و جــەبەرووتـن
بێــچــارە برای شـێـخ عــەلی مــوفلیس و ڕووتـن

شـێخ عـەلی دێی "قـرخ" و "تاڵەبان" کـە لە شـێخ عـەبدولرەحـمـانی باوکـیـانەوە بۆیان مـابووەوە، بۆ شـێخ ڕەزای تەرخـان کردبوو. هەر لە پایزیشـەوە هەمـوو ئازووقـەی وشکەی

زستانی بۆ برا و برازاکانی دەنارد و نان و چێشتی ئێوارانیان لە مەنجەڵی خۆیەوە بۆیان دەچوو. بەڵام ژیان بریتی نەبوو لەمە و شێخ ڕەزایش بەمە قایل نەدەبوو و شێوەی ژیانیش لە چوارچێوەی قەناعەتی دەروێشی چووبووە دەرێ.

دیواخانی شێخ ڕەزا بریتی بوو لەژوور و هەیوانێک لە نزیکی دووەم دەرگای تەکیە کە دەینواڕییە ماڵی خۆی لە گەڕەکی بەرتەکیە. هەموو دیوارەکانی بە نووکە قەڵەم بە شیعری شێخ ڕەش کرا بوو، یا شێخ خۆی و یا کەسانیتر، بۆ ئەوەی لە بیریان نەچێت، لێرەدا تۆماریان دەکرد. بەڵام بەداخەوە، نە شێخ ڕەزا خۆی و نەیش کەسیتر بیری لەوە نەئەکردەوە ئەو شیعرانە کۆکاتەوە و تۆماری بکات و زۆری فەوتا، شێخ ڕەزا دەیوت: "دیوانی من لە سینەی صەدان کەسدا تۆمار کراوە" بەڵام ئەو صەدانە زۆربەیان لەژێر خاکدان.

گەلێک لە پیاوانی هاودەمی، لە گەڕەکی بەرتەکیە و ناوشار لەم دیوەخانەدا لە شێخ ڕەزا گرد دەبوونەوە و زۆربەی کاتیان بە شەڕە شیعر و نوکتەبازی ڕادەبوارد.

دانیشتوانی گەڕەکی بەرتەکیە، لەڕەسەندا هەموو کوردن، بەڵام هەر یەکە لە هەرێمێکی کوردستانەوە هاتوون. وەکو : قالە تەنیایی، ئەمین سووورداشی ئەمینە ڕووتی زەنگنە، محەمەد ئەفەندی خەلیفە، سلێمان چاووش، سالەی چەرمەڕەق، ئەحمەد مەلا ژن، تۆفیقی بیلال، سەید ئەمین هەپلوس، سەعە بەشیر، سەعەی حەمە وڕێز، فەقێی ئەولا چاووش، حەمەی وەستا فەتاح، بلە منگن، ئەحەی سۆفی عەزەم دەم بۆڕ، وەستا عەبدوللای کەوش دوور، خەلیفە ئەحمەد... هتد.

ئەم هەمە چیزەیە، وەکو یەک فامیلیا و یەک نێڵ لە دەوری شێخانی تاڵەبانی کۆبووبوونەوە و ژیانیان دەبردە سەر.

کوڕەکانی شێخ عەلی، هەریەکە لە حەوشی تەکیە دیواخانێکی تایبەتی بۆ خۆی دانابوو. شێخ مەحەمەد عەلی؛ میوانداری عەشایر و نان و خوانی لە مل گرتبوو، خەلقێکی زۆری لێ کۆدەبووەوە و ئێوارانیش، بۆ ئەوەی لاوانی بەرتەکیە لەناو شاردا تووشی گێچەڵ و فێری ڕەوشتی خراپ نەبن، شەوان بەیاری (سینی و زەرف) و گاڵتە و گەپ ڕایاندەبوارد و لەبەر ئەوەی شێخ ڕەزایان لەو گاڵتە و گەپە بەشدار نەدەکرد ڕقی هەڵدەسا و هەجوی دەکردن.

شێخ موحەمەد ڕەئووفیش دەستەیەکی لاوی ئازا و چاپووکی لەخۆ کۆکردبوو دەستەڵاتی بەسەر شاردا کێشابوو.

دەڵێن: لەسەردەمی عوسمانی، شێخ ڕەئووف دەیەویست ببێتە سەرۆکی شارەوانیی کەرکووک، بەڵام موتەسەریفی تورک عەونوللا (عون الله) دەیەوێت تورکمانێکی هاو زمانی خۆی بکات و لە ئەنجامی تەقەلای ئەودا تورکمانەکە دەکرێتە سەرەک شارەوانی. شێخ ڕەئووف ئەمەی پێ ناخۆش دەبێت و چوار لاوی چەکدار لەگەڵ خۆی دەبات و سەرەک شارەوانی دەردەکات و خۆی لەجێی دادەنیشێت. کابرا دەچێتە لای موتەسەریف و بۆی دەگێڕێتەوە. ئەویش سەرۆک ژاندارم لەگەڵ خۆی دەبات، تەماشا ئەکا شێخ ڕەئووف لە جێگای سەرۆک دانیشتووە. هەر لەدەرگاوە بە تورکی دەپرسێت: "شێخ موحەمەد ڕەئووف کێ تووی کردە سەرەک شارەوانی؟". شێخ ڕەئووف دەست بۆ دەمانچەکەی پشتی دەبات و دەڵێت: "پاشام ئەمە منی کردە سەرەک شارەوانی"... "پەکی... پەکی..." دەڵێت و دەگەڕێتەوە سەرای حکومەت و بروسکەیەک دەنێرێت بۆ والیی مووصل داوا دەکات شێخ ڕەئووف بکرێتە سەرۆک شارەوانی و دەڵێت: "ئێمە یەکێکمان پێویستە ئەو حکومەت بپارێزێت نەک حکومەت ئەو بپارێزێت. شێخ ڕەئووف دەکرێتە سەرەک شارەوانیی کەرکووک و لە پاش ئەویش شێخ حەبیبی برای و لەپاش شێخ حەبیبیش شێخ فاضلی ئامۆزای سەرەک شارەوانی کەرکووکیان کردووە.

ژیانی بەرتەکیەیش بریتی بوو لە چەند مانگێکی کار و کەسابەت، ئەوەی لە کاتی مەڕ برینەوەدا "کارگەیی" دەکرد و هەندێکیشیان ساڵی چەند کاروانێکی توتنی قاچاغیان دەهێنا بۆ جگەرەفرۆشەکانی ناوشار و هەندێکیش لەبازاڕی کۆنە فرۆشان «قاریلر بازاری = بازاڕی پتوپیرێژن» دوکانی کۆنە فرۆشییان هەبوو، بەمانە ئازووقەی زستانیان ئامادە دەکرد و ئیتر بە درێژیی ساڵ کارێکی وایان نەبوو، لەم دیوەخانانە ڕایاندەبوارد.

شێخ ڕەزا دەوری هەرزەکاری لەنێوان ئەم جۆرە ژیانە کۆمەڵایەتییەدا ڕابوارد. لە لایەکەوە زیکر و خواپەرستیی دەروێشان و لەلایەکی تریشەوە کۆڕی مەلا و ڕۆشنبیران و پیاو ماقووڵانی شار و سەرۆک ئێلان و هەروا مەجلیسی گاڵتە و گەپ، ئیتر زیرەک ئەوەیە ئەم هەموو دژایەتییە و بیری چەشن چەشنانە بقۆزێتەوە، تەنها بلیمەتیی شێخ ڕەزا ئەم هەموو بیروڕایانەی هەڵقۆزتبوو و بووبووە ئەنسکلۆپیدیای بیروڕای تەصەوف و دەروێشیی خواپەرستی و ڕۆشنبیری و ئەدەب و شیعر و گاڵتە و گەپ، لەم لاوە؛ لە سنە و سابلاغ و کرمانشاوە و لەولاوە تاکو ئەستەموڵ و لە باشووریشەوە تاکو بەغدا، زیرەکی و بلیمەتی، وەکو "هۆشووچن" گوڵ گوڵ دەیچنییەوە و "سووالە"یەکی هەمە ڕەنگی لێ دەهۆنییەوە. هەموو کەسێک ئەم ژیانەی دەدیت، بەڵام وەکوو کوردەواری دەڵێت: "هەموو

چەکمە زەردێک هەمزە ئاغا نییە".

شێخ عەبدولڕەحمان، هەر لەسەرەتای پۆست نشنییەوە، براکانی بۆ ڕێگا پێشاندان بە ڕێبازی تاڵەبانیی قادری، بە هەرێمەکانی کوردستاندا بڵاوکردبووەوە. شێخ غەفوور بۆ کۆیێ و شێخ عەزیز بۆ ناوچەی (گل) و شێخ موحەمەد صالح و شێخ عەبدولکەریم بۆ بادەوا و ساڵەیی و شێخ موحەمەد عارف بۆ ناوچەی سیروان و شێخ موحێددین بۆ سەرتاب و جاحیلر... هتد. ئەمانە تاڵەبانیان لە فامیلیایەکی بچووکی ئایین پەرستەوە کردە ئێلێکی گەورەی دەستەڵاتدار. ئەم ئێلە کەوتە شەر و شۆڕ و پەلاماردانی ئێلانی تری و هەرێمێکی زۆریان داگیرکرد. شێخ ڕەزایش دەبوایێ، بە هەق و ناهەق پارێزگاری لە ئێلیی خۆی و دژی ئێلانی تری بوەستێت و ژیان و گوزەرانیشی کەوتبووە سەر ئەوە. وەکوو دەڵێت:

جائیزەم مەطلووبە ئەم مەدحەم بە خۆڕای نییە
هورمانیش بێ (ڕەزام) گەر هیچ نەنێرن یاسەتتار

ئیتر نە شێخ عەلیی کاکی بەم هەموو دانایی و دڵ گەورەیی و نەیش خزمانی و دۆستانی و هەتا سوڵتانی عوسمانی، سوڵتانێکی بەزەبر و زۆری وەکو عەبدولحەمیدیش لە زمانی ڕزگار نەدەبوون کە بە سوڵتان دەڵێت:

کاشی یک روزم بما بین همایون رەدهند
تا (حمید خان) را بگویم: ای (حمیر المؤمنین)
بعثت تو برخلاف بعثت پیغمبر است
(انت ما ارسلت الا زحمة للعالمین)

واتا:

خۆزگە تاقە ڕۆژێکم ڕێ دەدەن بە مابێن هەمایونی
تا بە حەمید خان بڵێم ئەی گوێ درێژی موسڵمانان
ناردنی تۆ بە پێچەوانەی ناردنی پێغەمبەرە
تو بۆ ئازاری خەلق نەبێ بۆ هیچی تر نەنێرراوی

چونکە سوڵتان خۆی بە "امیر المؤمنین" ناو دەبرد و وای جاڕ دابوو کە خەلافەتی ئیسلامی بۆ ئەو ماوەتەوە و لە جێی پێغەمبەر دانیشتووە.

لەم هەجوەی سوڵتان شێخ ڕەزا ڕادەکێشرێت بۆ بەرپرسیاری و لە گەڕانەوەیدا پرسیاری

ئەنجامی لێ دەکەن. دەڵێت "لەت"ێکیان پێوە نام، "ڕەزا" بووم، بووم بە ڕەزالەت".

لەم سەفەرانەی ئەستەموڵ و بەغدا، شێخ ڕەزا پێوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ گەلێک لە ئەدیب و شاعیر و ڕۆشنبیرانی کورد و تورک و عەرەب پەیدا ئەکات، لەوانە شاعیری تورکی بەناوبانگ نامیق کەمال. کە دەچێتە لای نایناسێت و بە فیزێکەوە دەست درێژ دەکات و دەڵێت: "بن کەمالم = من کەمالم" شێخ ڕەزایش: "بندە فحولی اهلی کەمالم". نامیق کەمال دەیناسێت و گورج" شێخ ڕەزا سکز... بیورکز... بیورکز" پێش وازیی لێ دەکات. ژیانی شێخ ڕەزا لەگەڵ ئەوەشدا چاکترین و فراوانترین بەرهەمی ئەدەبی هەبوو، وەکو گەردەلوولی گەرمیان تووشی هەرچی دەبوو لەگەڵ خۆیدا دەیپێچایەوە. لەلایەکەوە

من سنیم نامم ڕەزا - کلب امـــــــام مـــــــرتضی
درویش عـبـــدالقـــادرم - راهم بە مـــولا مـــیـــرود

واتا:

من سونیم ناوم ڕەزایە- سەگی ئیمامی مورتەزام
دەروێشی عەبدولقادرم- ڕێگام بەرەو خوا ئەچێ

لەلایەکی تریەوە:

نەقـیـبک نقـبنە گـیـرمش هەزران کـیـر افـغـانی
گـوتی وارسـە دیانسـون نسل پاک غـوث گـیـلانی

واتا:

هەزاران کێری ئەفغانی چووەتە کونی نەقیبەوە
گەر قنگی هەیە بەریگرێت نەوەی پاکی غەوثی (غەوسی) گەیلانی

و لەگەڵ ئەو هەموو پێوەندییەی کە فامیلیای تاڵەبانی لەگەڵ فامیلیای کاک ئەحمەدی شێخدا هەیبوو شێخ ڕەزا بە هەموو ڕێزێکەوە:

مــــەربـووطە حـــەیاتم بە ســـولەیمانی و خـــاکی
خـۆزگـەم بە صـەگی قـاپـیـــەکـەی ئەحـمـــەدی کـاکی

کـەچی لەپاش کوشتنی صەمەدی تاڵەبانی و لە تۆڵەیدا کوشتنی شێخ حوسێنی قەرەچێوار و لەشکر ئارایی بەرزنجە و تاڵەبانی، شێخ ڕەزا لەسەرچۆک بۆیان دەچێتە سەنگەرەوە و هەجوی وایان دەکات کە موو لەجێی سەوز نەبێت.

وه نەبێ هونەری شێخ ڕەزا تەنها لە مەدح و هەجودا بێت، لە سیاسەتی وڵاتدا شارەزا و لایەنگیری میران و میرنشینانی کوردوستان و نەقدی ڕژێمی سەڵتەنەتی عوسمانی و هێرش بردنە سەر حکومەت و دەیدیت زۆر هەبوون لە سایەی سوڵتانەوە سامان و جاهیان پەیدا دەکرد، بەڵام زۆربەیان کەللە بۆشن، دەیوت:

عـــالمه عـــام اولـدیغـندن التـــفـــات پادشـــاه

خـــر دەخی بر آد قـــزاندی ســـایەء شـــاهانەدن

واتا:

لەبەر ئەوەی ئیلتیفاتی پادشاه هەموو سووچێکی گرتووەتەوە، کەریش، لە سایەی شاهانەیەوە ناوێکی دەسکەوتووە.

ئەوەی جێی سەرنجە، شێخ ڕەزا لە هەجودا، خوو و ڕەوشتێک نانێتە یەکێکەوە کە ئەوەی تێدا بێت. بە پیاوی ناپەسەند ناڵێت ناپەسند، ئەگەر وابێت سەرنجی خەلقی ڕاناکێشێت و هەجو کراوەکەیش پێی تووڕە نابێت.

ڕۆژێک شێخ عەلیی کاکی لێی تووڕە دەبێت و دەڵێت:ـ"ڕەزا، ئەمە چییە کەس ما هەجوی نەکەیت و لێمانی نەتۆرێنی؟" دەڵێت: "بەڵێ... ئەوانەی هەجو هەڵناگرن، خوا و پێغەمبەر و ئیمامی عەلی و شێخی گەیلانی، هەجوی ئەمانەم نەکردووە". لەبەرئەوە دڵنیام ئەو ئێل و کەسە بەرێزانەی کە ناویان بەخراپە لە شیعرەکانی شێخ ڕەزادا دێت، هیچ دڵگیر نابن و تەنها لە سووچی هونەرمەندییەوە تەماشای شێخ دەکەن. خوالێخۆش بوو فەتاح ئاغای کاکەیی زۆر جار کۆی لە شیعرەکانی شێخ ڕەزا کە بەسەر ئێلی کاکەییدا هەڵیداوە دەگرد و قاقا پێدەکەنی. هیچ گومانی نییە، ئەوەی ئەو کەسانەی کە شێخ ڕەزا هەجویانی کردووە، لەپێش ئەوانیتر دیوانەکەی دەقۆزنەوە.

***

پلەی سێیەمی ژیانی ئەدەبی شێخ ڕەزا لە بەغدا بوو. شێخ عەلی بەهەموو توانایەکەوە تەقەلای ئەوەی دەدا دڵی خەلق ڕاکێشێتە لای خۆی، کەچی شێخ ڕەزا بەو هەجوانە خەلقی دەتۆران. ڕۆژێک حاجی عەلی قەردار دێتە لای شێخ عەلی و دەڵێت: "من پیاوێکی حاجی و ویندار و مەخلیصی تەکیەی تاڵەبانیم، کەچی شێخ ڕەزا لە شیعرێکدا منی هانیوەتە ڕیزی میناس گاوور، ئەمە چۆن خوا قەبووڵ ئەکا!" شێخ عەلی زۆری پێ ناخۆش دەبێت و دەنێرێتە دووی شێخ ڕەزا و هەر لە دەرگاکەوە: "ڕەزا... ئێمە تەقەلا ئەدەین دڵی

دوو مسولمان راکیشین کەچی تۆ بەدوو قسەی هیچوپووچ لیمانی دەتۆرینیت... چۆن مسولمانێکی حاجیی وەکو حاجی عەلی دەبەیتە ریزی میناس گاوور؟" شێخ رەزا دەڵێت: "نازانم من لەدەس کێ سەری خۆم هەڵگرم... بەیانی زوو میناسیش دەرگای لێم گرتووە و دەڵێت؛ من هەرچەنێک گاورم بەڵام پیاوێکی بە وجدانم، خوا چۆن هەڵئەگرێت من دەبەیتە ریزی حاجی عەلی".

ئیتر شێخ عەلی بیری لەوە دەکردەوە کە شێخ رەزا لەم گێژەنگەیە دەربێنێت و بیگەرێنێتەوە سەر دۆخی دەوری دەروێشیی شێخ عەبدولرەحمانی باوکیان، لەبەرئەوە تەکیەی تاڵەبانیی بەغدای پێ سپارد و کردییە شێخی ئەوێ و لە ساڵی (١٣١٨ھ) وەکو "طبیب رغماً عنه" هاتە بەغدا و لە تەکیەی تاڵەبانی لە گەرەکی مەیدان جێنشین بوو.

لە بەغدا ئاشنایی لەگەڵ گەلێک لە پیاوە ناسراوەکان و ئەدیب و شاعیری کورد و عەرەب پەیدا کرد. لەوانە حەمدی بەگی بابان و سەلیم بەگی بابان و مفتی زەهاوی و شاعیری ناسرا و جەمیل صدقی زەهاوی و سەید مەحموودی گەیلانی و ئیبراهیم پاچەچی و عیسا ئەفندی جەمیل زادە... هتد.

دەگێرنەوە، شێخ رەزا رۆژێک لە بەغدا لەگەڵ سەید مەحمودی نەقیبی گەیلانی یاریی شەطرەنج دەکەن. بە دەستێکی شەطرەنج و بەو دەستیشیەوە تەسبیح، ویرد و دۆعا دەخوێنێت. لەناکاو هاوار دەکات و دەڵێت: "قتلتە ورب الکعبە" سەید مەحموود وا دەزانێت شای شەطرەنجی کوشت و دەڵێت: "وین... وین قتلتە؟".. دەڵێت: "ئەمە نا.. مفتی زهاوی" و هەجوەکەی مفتیی بۆ دەڵێت و بە عەرەبی تێی دەگەیێنێت. سەید مەحمود دەڵێت: ئەمە چۆن بلیمەتێکە، بەدەستێک شەطرەنج و بەدەستێک تەسبیح، بەلێو وورد و دۆعا و بە بیر شیعر رێک دەخات!!

پێویستە ئەوەیش بڵێین شێخ رەزا، لە حەقیقەتدا ئەو شێخ رەزایە نییە کە لە شیعرەکاندا خۆی بە گەلێک رەوشتی ناپەسەند ئیتتهمام دەکات کە بە تەواوەتی لەو رەوشتانەوە دوور بوو، بۆ نموونە، لە دەوری عوسمانیدا کە دەوڵەت سەری بۆ گەلێک لە داواکانی دەوڵەتە ئیستیعمارییەکانی ئەوروپا شۆر کردبوو، هەتا بێگانە بەپێی یاسای عوسمانی تاوانبار نەدەکرا، بەڵکو بە پێی یاسایەک کە "قانونی اغیار"یان پێ دەووت، شێخ رەزا دەیەوێت گاڵتە بەو یاسایە بکات. لە ستایشی ئەحمەد پاشای باباندا، توهمەتی کورە بولغارەکە بۆ خۆی دروست دەکات و داوای پارە لە ئەحمەد پاشا دەکات کە

بەپێی (قانونی اغیار) پارەی کوڕە بولغارەکە بدات. هیچ گومانی نییە ئەمە بێ ئەسڵ و فەسڵە. ئەیەوێت بڵێت کوڕێکی بولغاری حیزیش بەپێی یاسایەکی تایبەتی مافی هەیە. وەکو «الشعراء یقولون مالایفعلون».

گەلێک لە شاعیرانی کوردستان دانیان بە وەستایی شێخ ڕەزا لە مەیدانی شیعری غەزەلدا ناوە، یەکێک لەوانە مەلا محەمەد کەریمی قازیی سەقزییە (١٨٤٨-١٩١٠) لە دایک بووەن، کە نازناوی "کەوثەر"ە. ئەمەیش دەقی نامەکەیە کە لە مامۆستای کورد لە فارسییەوە کراوەتە کوردی:

"بۆ خزمەتی جەنابی زمانپاراوترینی شاعیران شێخ ڕەزا بە سەرگەردی وجوودی بەختەوەرت بم.

دوای پێشکەش کردنی ئارەزوومەندیی بێ بڕانەوە، لە بیری درەوشاوەی ئێوەی پایەبەرزدا ئاشکرابێ و نادیار نەمێنێتەوە. لە و ڕۆژەوە ئەم کەمینەیە توانای ئەوەی بووە مرواریی شایستەی شیعرەکانت و وتەی تەڕ و تازەی گەوهەری بیری دەست بۆ نەبراوی ئێوەی بەڕێز (خواتەمەنتان درێژ بکات)، لە صەدەف دەرهێنێن و لە گوێکەی دڵدا بیکاتە گوارە و لەلاپەڕەی دڵەی خەمیندا بینە مایەی سەردانەواندن و بەخشین و لەکۆشکی باخی بیری کەم و کورتیا بینە حوور و غیلمانی بەهشت و خزمەتگوزارانی سەردارانی تاجدار سەرومڕی ساڵ و مانگ و سەعات و ڕۆژ و شەو، ئارەزووی ئەم چاوە فرمێسکاوییە، دیتنی ڕوخساری ئەو زاتە داوێن پاکەیە دڵخوازی ئەم ستەمدیدەیەی ڕۆژگار، بۆ هەمیشە خوێندنەوەی شیعری ئەو پیرۆزو تازەیە، کە بە زمان و گیان و، دیار و نادیار، لە پێشگای یەزدانی پەروەردگار، لە سینەی پڕ بڵێسەدا مایەی هێور بوونی کڵپەی ئاگری دووری و هاوڕاز و هاو خەمینە.

بەڵێ لەم ماوەیەدا ئەوەی توانای لە ئەستۆگرتنی باسی ژانی دووری و باری ئاوات و تاسەی ئەم کەمینەیەی لەباردا بوو، لە پاڵەوانی دەوران برای میهرەبان مەلا عەبدوڵلا زیاتر بە چاک نەزانرا، بۆیە هەلی لەدەست نەدا و بەناردنی ئەم کورتە ئاواتنامەیە، کەوتە پەلە و بە کلیلی دەروازەی خستنەڕووی سکالا و پوختەی ئەوڕازەوە، قفڵی سنووقی ئاواتی مێژینەی خۆی کردەوە و بۆی سێ غەزەلی لە پالاوتەی بیری خۆی داڕشت و چنی.

سازم مگر سیاهی چشمان خود مداد

تا در لباس نامه ببینم جمال دوست

واتا:

مەگەر ڕەشێنەی چاوی خۆم بکەم بە مەرەکەب

تا جوانیی دۆست لە بەرگی نامەدا ببینم

هەرچەندە پێشکەشکردنی ئەم غەزەلانە و ناردنی ئەم دیارییانە بۆ مەڵبەند و هەرێمگەلی دەوڵەتی عوسمانی وەک ناردنی وردە (زیر)ە و (شال)ە بۆ (کرمانی)یان وەک لافی خەتخۆشییە لای هونەرمەندی (ئەسفەهانی)، بەتایبەتیش بۆ وڵاتی کەرکوک و کە بەبوونی تەشریفی موبارەکی ئێوە (خوا دەوامی گەورەییتان بدات)، وەک زێڕی قاڵبی کە میعیاری بێبەرەوە، کە شایستەی بەکار هێنانی نەبێ، بەڵام ڕەنگە لە کاتی ناوبردنی ئەم کەمینەیەدا بێتە مایەی یادگار و لەکاتی خوێندنەوەشدا ببێتە مایەی یادکردنەوە بە گوێرەی ئایەتی «لایکلف الله نفسا الا وسعها» بۆیە ناردمە خزمەتتان، چونکە وەکو وتوویانە:

طاعت ار هیچ نباشد گنهی باید کرد

در دل دوست بهر حیله رهی باید کرد

واتا:

ئەگەر هیچ تاعەتێکی خوات نەبێ، ئەبێ گوناهێ بکەی

چونکە مرۆ ئەبێ هەر چۆن بووە ڕێیەک بکاتەوە بۆ ناو دڵی دۆست

منیش بە ناردنی ئەم شیعرە نارێکانە، ڕێگەی دۆستایەتیم لە دڵی ئێوەدا کردووەتەوە، جەنابیشتان بەو پەڕی سۆز و ویژدانی خواپێداویی خۆتانەوە، لە کاڵ و کرچیی بەیتەکان و کەم و کووڕیی پایەکانی چاوپۆشی و پەسەندی چەشی گەوهەرباری بفەرموون، داخواز و تکاکاریشم چەند لاپەڕەیەک لە مرواریی شیعری خۆتان کە لە بەردەستدان و ئامادەن، لەهەر بابەتێک بن، چ لە بابەت ستایشی خوا و چ پیاهەڵدان و چ قەسیدە و چ لاقرتیو و توانج و داشۆرین و داواکاریان ئێجگار زۆرە، بە تایبەتی لای ئەم کەمینەیە وەک گۆگردی سوور وایە. بەناوی دیاری و خەڵاتەوە کە لای چا و و دڵڕووناکان دیارییەکی بێهاوتایە و لەگەڵ وەڵامنامەکەدا، بە مەلا عەبدوللادا بۆمی ڕەوانە بفەرموون، تا بۆ بڵاوکردنەوەی و برەوپێدانیان کەسانێکی زۆر لە وێژەی ئێوەی بەرێز و دەست ڕەنگینتان ئاگادار بکەمەوە چونکە خۆت واتەنی «حەیفە برزێ تیغی مجەوهەر لە غیلافا».

لە کۆتاییدا خوا تەمەنتان درێژ بکات و هەمیشەش چاوەڕوانی مژدەی سەلامەتی و

فەرمانتانم.

بدون سابقە ابلاغ گفتە اند خطا است
ولی بسوی هنرمند و اهل فضل روا است
سوال کردم ازین نکتە از وزیر خود
جواب داد کە اری جناب شیخ رضا است

واتا:

وتوویانە ڕاگەیاندن بێ ئەوەی پێشینەیێ لە نێوانا هەبێ، هەڵەیە
بەڵام لای مرۆی هونەرمەند و خاوەن فەزڵ ڕەوایە
لەم بارەوە لە ڕاوێژ پێ کراوی خۆمم پرسی
وەڵامی دایەوە، وتی: بەڵێ جەنابی شێخ ڕەزایە
(یا: بەڵێ، جەنابی شێخ ڕازییە)

ئێمە ئەو غەزەلانەی مەلا محەمەدی کریمی قازی کە لە بنەماڵەی شێخ الاسلامی سەقزە دەسمان نەکەوتووە بەڵام بەپێی ئەوەی ئەم کاغەزەی سەرەوەی ناردووە بۆ کەرکووک، دەبێت لەپێش چوونی شێخ ڕەزا بۆ پێشەوایی تەکیەی تاڵەبانی لەبەغدا کە لە ساڵی ١٣١٨ کۆچیدا بووە، بوو بێت. مەلا محەمەد زۆر بەترس و لەرزەوە شیعرەکانی پێشکەشی شێخ ڕەزا دەکات، ڕەنگیشە ئەو شیعرەی شێخ ڕەزای دیبێت کە بۆ عەبدوللا پاشای ڕەواندزی ناردبوو دەڵێت:

شاعیری گندە طبع همچو جعل
شعر او چون شعور او مختل

واتا:

شاعیرێکی تەبیعەت وەک قالۆنچە بۆگەن
ئەبێ شیعریشی، وەک هەست و شوعووری، شێواو بێ

***

## شێخ ڕەزا و شاری کەرکووک

شێخ ڕەزا ڕۆڵەی شاری کەرکووکە، ژیانی منداڵی و هەرزەکاری لە کەرکووک ڕابواردووە و هەر لە کەرکووکیش بەهرەی هونەرمەندی وەرگرتووە. کەرکووک گۆڕستانی

باوباپیریەتی، خۆی و خێزانی زۆربەی تەمەنیان لە کەرکووک بووە و جوانترین و فراوانترین بەرهەمی هونەری و ئەدەبی لێرە هەڵقوڵاوە و لە ژێر چاوەدێریی باوکێکی خواپەرست و زانا و شاعیر پەروەردە بووە و ژیانێکی دەروێشانەی ئاسوودەی ڕابواردووە. بەڵام ئەو بەهرە هونەرمەندییەی ئەوەندە ناگەهان بوو لە سنووری شاری کەرکووک جێی نەدەبووەوە و لەگەڵ ژیانی دەروێشانەی تەکیەدا نەدەگونجا، دەیەویست، نەک تەنها گەشتی وڵاتی عوسمانی و ئێران، بەڵکو بە جیهاندا بگەڕێت و جاڕی هونەرمەندیی خۆی پێدا بڵا و بکاتەوە.

بیــــــرون دلده بولمادم آثار کنز راز

جاک درونه عطف عنان ایتمک ایسترم

واتا:

لەدەرەوەی دڵدا نەمدیت ئاساری گەنجینەی ڕاز

دەمەوێت سەرێچی لە بەستنی ڕووحی دەروون بکەم

بەڵام لە پاش کۆچی دوایی باوکی، نە ئەم بەو ژیانەی دەروێشانەیە رازی بوو و نەیش مام و برا وەکوو باوکی نازیان دەکێشا، تووشی گیروگرفتی ژیان بوو و دڵی لە کەرکووک و خزمانی خۆی ڕەنجاوە و چەند جارێک بە تۆراوی کەرکووکی بەجێ هێشتووە، بەڵام چۆلەکەی دڵی هەر بۆ کەرکووک باڵەفڕێ کردووە و بە پەشیمانی گەڕاوەتەوە شارە دڵگیرەکەی خۆی.

بۆ موجتەهیدان گەرچی جەوازی نییە تەقلید

من موجتەهیدم، هاتم و تەقلیدی کەرم کرد

بەڵام چۆن بچێتەوە کەرکووک، خۆی بە بەش خوراو ئەزنێت و خزمانی لەگەڵیدا باش نین.

بەم حاڵە ئەگەر دەفعەیێ تر بچمەوە کەرکووک

مەعلومە بە مەردی نەرواوە لەسەرم تووک

بۆچ بچمەوە کەرکوکی قورمساغ کە لەگەڵ من

ئەهلی هەموو ناسازە وەکوو ئاوی حەماموک

گلەیی لە کەرکووک ناکات، دڵی هەر بۆ کەرکووک لێ دەدات، بەڵکو لە کەسوکاری

خۆی کە نەیانتوانیوە دڵی بێننەجێ، لەبەرئەوە غەریبی و ستەم ئەچێشێت و سەر بۆ خزمانی دانانوێنێت:

پێم خۆشە، لەبەر جەوری برا و لۆمەیی ئەقوام
صەد جار لەغەریبی بکەوم موفلیس و مەهتووک
ڕۆژێ بە مورادی منیش ئەڵبەت دەگەرێ چەرخ
ئەم میچە قەراری نییە گاهێ جگە گەه بووک*
شەش مانگە زیاتر کە لەپاش مەرگی بدەرم من
مەغدوورم و مەظلووم و جەفا دیدەو و مەهتوک

* جگ و بووک دوو باری نیشتنەوەی "قاپ"ە کە یاریی پێ دەکەن.

لەشیعرەکەی کە تەمێی شێخ عەلی کاکیی دەکات، ئەوی کردووە بەهۆی بەجێهێشتنی کەرکووک، چونکە لەکەرکووکدا هیچ سامانێکی وای نەبووە.

بێگانە هەموو صاحیبی جاه و جەبەرووتن
بێچارە برای شێخ عەلی موفلیس و ڕوتن

لەکەرکووکدا تەنها خانوویەکی بچووکی هەیە و تێدا ناحەسێتەوە:

حوجرەییێکم هەیە بە قەدەر لەپێ
ڕۆژ عیلاجی ئەکەم بە شەو ئەتەپێ

.........................

سەر و ڕیشم لە تۆز و قسڵ و گەچا
وەک پەلاسێکە پڕ لە ڕشک و سپێ

لەهەموو ئەمانەدا شێخ عەلیی کاکی تاوانبار دەکات و پەلاری بۆ ئەو دەوەشێنێت

شێخ عەلی خۆ تو منت ئاوارە کرد و دەربەدرە
چاکە هەجوێکت بکەم ئەمما موفید و موختەسەر
بۆ حەمەی وەستا فەتاح ئێمەت هەموو ئاوارەکرد
ئەی حەمەی وەستا فەتاح دایکت بەکێری نێرەکەر

حەمەی وەستا فەتاح وەکیل خەرج و جێ باوەڕی شێخ عەلی بوو.

هەر چەنێک خۆشترین ڕۆژانی ژیانی لەبەر تەکیە بوو، بەڵام کە لە تەکیە تۆرا ڕقی لە هەموو شتێک بووەتەوە و بەرتەکیەیشی لەبەر چاو کەوتووە:

حەرام زادە و دایکی خۆ گێ لەبەرتەکیە زورە
خلە و بلە و فشەگاڵتە و عەزە دەمبۆرە

هەروا جنێو بە هەموو کەرکووکیان دەدات:

مەکەن باوەڕ بە قەولی داکی خۆگێکانی کەرکوکی
ئەگەر خەلطێ بکەن وابزانە گا قوڕانی و کەر کۆکی

دیسانەوە دەڵێت:

کەبابی گۆشتی بزن، فاکهەی بەری خرنووک
لەمن بپرسە صەفای شارە حیزەکەی کەرکووک

شێخ ڕەزا لە کەرکوک سامانێکی وای نەبوو کە برا و خزم لێی زەوت بکەن، ئەوەی لە شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی مابووەوە دوو دێی "قرخ" و "تاڵەبان" بوون کە بۆ ئەو دانرابوون. شێخ عەلی لەپاش باوکی، بەدەستەڵاتی خۆی هەندێ دێی دەسکەوت کرد بوو، وەکو : قەرە حەسەن لەیلان و یەحیاوا و زەوی و زاری پشت تەکیە. شێخ ڕەزا دەیویست ئەمەش لەگەڵیدا بەش بکرێت. لە تەخمیسی غەزەلێکی "حافظ"دا ئەم گلەیی دەکات و خزمانی تاوانبار دەکات و دەڵێت:

تعدایی کە با من اقرابا کرد
ندیدم شمر با آل عبا کرد
مگر از حال من رمزی ادا کرد
(سحر بلبل حکایت با صبا کرد
کە عشق روی گل با ماچها کرد)
ز عقرب طینتان عم و خالم
پریشان روزگار و خستە حالم
مهیا از پی تاراج مالم

(مـن از بـیـگـانـگـان هـرگــــــــز نـنـالـم
کـــــه بـا مـن هـرچـه کــــرد آن اشـنـا کــــرد)
پـراز زاغ و زغـن صـــــحـن گـلـســــتــــان
ز شـــــادی کـــبـک قـــاهـا قـــاه خـنـدان
هـزارانـرا هـزاران داغ حـــــــرفــــــان
(بـهـــر ســـو بـلـبـل مــــسـکـین در افـــغـــان
تـنـعـم درمــــیـــان بـاد صـــبـــا کــــرد)
(رضـــا) را نـفـــرت اسـت از خـــرقـــه پـوشـــان
ز عـــشـق و شـــورمـــاچـون دف خـــروشـــان
مـن و مـن بـعـــــد بـمـزم بـاده نـوشـــــــان
(بـشـــــارت بـر بـکـوی مـی فـــــروشـــــان
کـــه (حــــافظ) تـوبـه از زهـدو ریـا کــــرد)

واتا:

ئەو تەعددايەی کە خزم لە منی کرد، شمر بە ئالی عەلی نەکردووە،
تەنها توانی ئەوە هەیە نیشانەیەکی حاڵی من
بە دەست دەستدرێژیی خزمانەوە باس بکرێ،
سبەینان بلبل رازی خۆی بۆ شنەبای بەیانی گێڕایەوە،
وتی عەشقی رووی گوڵ مەگەر هەر خوا بزانێ چیی بە نێمە کرد.
لە دوویشک رەوشتەکانی مام و خاڵم
رۆژگارم پەرێشان و حاڵم خەستەیە
ئامادەی بە تاراج بردنی ماڵمم
من هەرگیز لە دەست بێگانەکان ناناڵێم
چونکە هەرچی لە من کرا ئاشنا کردی
حەوشی ناوباخ پڕە لە قەلەڕەش و قەلەبازەکە و
کەو لە خۆشیدا قاقا پێئەکەنێ
بەڵام بولبولان هەزار داخی
بێ بەشییان پێوەیە
ئەڵێ: لەم ناوەندەدا ئەوی

کەیفی کرد بای صەبای بەیانیان بوو
(ڕەزا) بێزارە لەوانەی خەرقە لەبەر ئەکەن
ئێمە بە هۆی عەشق و سۆزی عەشقەوە وەک دەف هاتووینە جۆش
من ئیتر لەمەولا هەر لەگەڵ بەزمی بادەنۆشان ئەبم
مژدە بەر بۆ گەڕەکی مەی فرۆشان
کەوا (حافز) تۆبەی لە ڕیا کردن و خۆ بە درۆ بە خواناس دانە قەڵەم، کردووە

لەگەڵ ئەم هەموو هێرشەی بەسەر کەرکووکدا، شێخ ڕەزا پارێزگاری لە خەلقی کەرکووک دەکات و دەڵێت:

گرچە جمعیت کرکوک کم از بغداد است
قابلیت نە بتعداد بە استعداد است

واتا:
هەرچەند ژمارەی دانیشتووانی کەرکووک لە هی بەغدا کەمترە،
توان بە ژمارە نییە، بە لێهاتن و ئامادەییە.

ئەم پارێزگارییەی لە کەرکووک، لە بەغدا دەیکات پێ دەڵێن کەرکووکی لە بەغدا کەمن و دەستەڵاتێکی وایان نییە، لە وەڵامدا:

هەرچەنێک کەرکووکی لەغدادا کەمن
توانا بە ژمارە نییە بە بەهرە و زیرەکییە

***

## ماڵی شێخ ڕەزا لە گەڕەکی بەرتەکیە

ماڵی شێخ ڕەزا، دەکەوێتە بەرامبەری دەرگای دووەمی تەکیە (بەرەو ڕۆژئاوا) بریتییە لە دەرگایەکی گەورە کە بە پێی نەقشەی ئەو سەردەمە لەهەردوو لاوە دوو سەکۆی لێیە (سەلاملغ). کە دەچێتە ژوورەوە، ژوورێکی بچووک بۆ قاپییەوان و بەدەستە ڕاستدا ژوور و هەیوانێک دەنوارێتە سەر حەوشێکی گەورە کە مەلا ئەورەحمان و خێزانی تێدا دەژیان. لەم حەوشەدا دوو حەوشی تری جیا دەبێتەوە، یەکەمیان ماڵی شێخ واحیدی برای شێخ ڕەزایە و دووەمیان ماڵی شێخ ڕەزایە.

ماڵی شێخ ڕەزا بریتییە لە حەوشێکی گەورە و دۆر و خەزنە و دوو ژوور و هەیوانێک.

دۆرو خەزنە جێگای ژیانی خێزان بوو و ئەو دوو ژوورو هەیوانەیش بۆ میوانی تایبەتی. چونکە میوانانی تری لە تەکیە دەبوون. پەنجەرەکانی ژوورەکان دەنوارێتە (باغی فەرهاد) و گەڕەکی سەی سەروەرو قەڵای کەرکووک. ئەم خانووە تاک و ئێستا ماوە.

شێخ ڕەزا ژوورەکەی خۆی کردووەتە هۆی هەجوی وەستای دروست کردنی کە دەڵێت:

حــــوجــــرەیێکم هەیە بەقــــەدەر لەپێ
ڕۆژ عــــیــلاجی ئەکــەم بەشــەو ئەتەپێ
مــــەنفــــەز و درز و ئاو دزی هەرچەند
دەیگرم، دەیکوتم بە دەست و بە پێ
شەو کە دێم، دەم دەکاتەوە وەکو هار
وا ئەزانم صــــەگــــە و بەمن ئەحــــەپێ
ســـەر و ڕیشم لەتۆز و قــسڵ و گــەچا
وەک پەڵاسێکە پڕ لە ڕشک و سپێ
خــەمی شــاگــردەکــان زیاتر ئەخــۆم
گــەورە هەر چاکــە ئاخ لەدس دەس و پێ
ژنی وەســـتــاکــە بۆچ نەگــێم توخــوا
ســاق و سمت لووسی، کوز پڕی دەرپێ

***

## شێخ ڕەزا و شێخ عەلی

شێخ عەلی تاڵەبانی کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ ئەحمەدی تاڵەبانە و برا گەورەی شێخ ڕەزایە. لەپاش کۆچی دوایی باوکی، بووە پۆست نشینی تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک و شێخی ڕێبازی قادری. لە دەوری فەقێییدا، بۆ مەبەستی خوێندن، گەلێ شارانی کوردستان گەڕاوە و لەلای داناکانی کوردی ئەو سەردەمە زانستی ڕێبازی ئایینی ئیسلامی خوێندوە.

شێخ عەلی پیاوێکی لەسەرخۆ و زوبان خۆش و بێ فیز و هەمو و قورئانی پیرۆزی بەلێکدانەوە (تەفسیر) لەبەر بووە. لەزانستی پزیشکی و ناسینی گیا و درەختی دار و

دەرمانیش شارەزا بوو و کتێبێکی دەسنووسی لەسەر ئەمە داناوە.

شێخ ڕەزا، لەژێر سایەی باوکیدا ژیانێکی دەروێشانە ژیاوە. بەڵام لەپاش کۆچی باوکی، هەر چەنێک شێخ عەلی بۆ گوزەرانی شێخ ڕەزا و فامیلیای درێغی لێ نەکردووە و دەیویست شێخ ڕەزایش، لەسەر پیشەی باوباپیری ڕێگای ئایینپەرستی بگرێت، بەڵام شێوەی ژیان گۆڕابوو بلیمەتیی شێخ ڕەزا لە مەیدانی شیعر و ئەدەب پاڵی پێوە دەنا کە لەچوارچێوەی تەکیە و دەروێشی دەرچێت و بچێتە مەیدانێکی فراوانتر و لەناو کۆمەڵاندا جێگایەکی ڕەوای خۆی وەرگرێت. کەچی شێخ عەلی ئەم جۆرە ژیانەی بۆ مسۆگەر نەدەکرا و لە شێخ عەلی دەتۆرێ دەچێتە کۆیێ لای شێخ غەفووری مامی، بەڵام شێخ غەفووریش دەیویست ژیانێکی ئاسوودەی بۆ ڕێکخات لایەنگیری ئەوە نەبوو بچێتە شاران. کەچی شێخ ڕەزا دەڵێت:

پێم خۆشە لەبەر جەوری برا و لۆمەیی ئەقوام

سەد جار لە غەریبی بکەوم موفلیس و مەفلووک

شەش مانگە زیاتر کە لەپاش مەرگی پدەر من

مەغدوورم و مەظلووم و جەفا دیدە و ومەهتووک

......................

بەم حاڵە ئەگەر دەفعەیێ تر بچمەوە کەرکووک

مەعلوومە بە مەردی نەڕواوە لەسەرم تووک

نایەوێت نە برا بچووکیی شێخ عەلی بکێشێت و نەیش ژیانی دەروێشانەی تەکیە. دەیەوێت لەمە سەرفراز بێت و بچێتە دونیایەکی فراوانتر و دەڵێت:

من خواجەئی ئەحرارم و ئامێزشی دونیا

هێشتا کە نەمیکردووەتە بەندەیی مەملووک

بەڵام وەکوو دەڵێن؛ "بەرد لەجێی خۆی سەنگینە" و دووبارە ئارەزووی ئەو ژیانەی بەرتەکیە ئەکاتەوە و لەوە پەشیمان دەبێتەوە کە لەگەڵ شێخ عەلی کاکیی بەشەڕ هاتووە.

سەد دەفعە وتم وەختێ کە دیم نەخوەتی قەلبی

یارەب کە لەگەڵ شێخ عەلی بۆچی شەڕم کرد؟

شێخ ڕەزا خۆی لە دژایەتییەکی نەفسی دەبینێت. لەلایەکەوە شێخ عەلی لە جێگای شێخ عەبدولرەحمانی باوکی دانیشتووە و ئەو جێگایەی پڕ کردووەتەوە، بەڵام بەم چی! ئەم ژیانێکی تری دەوێت. لەلایەکەوە دەڵێت:

ئەمێستایش (شێخ عەلی)ی نەجلی کە پیری صاحب ئیرشادە
ئەمیش وەک باوک و باپیری لە زومرەی ئەولیا مەعدوود

هەروەها نەصیحەتی دەکات کە لە ڕێگای باوکی لانەدات:

شێخ عەلی ئەطواری باوکت تێک مەدە
(قل هو الرحمان آمنا بە)

کەچی لەو کاتەی کە شێخ عەلی لە حەج دێتەوە و هەموو جەماوەری شاری کەرکووک پێشوازیی لێ دەکەن، دەڵێت:

چەند هەتیو خۆی تاسولووس دا چوون بە پیری شێخەوە
کاشکی مووێ بوومایێ من بە کێری شێخەوە

کەچی لەلایەکی تریشەوە دەڵێت:

ایها الناس بشارت کە ولی من آید
آشنای ازلی شێخ عەلی من آید

واتا:

خەلقینە مژدە بێ وەلی دێت
شێخ عەلی ناشنای ئەزەلی دێت

شێخ عەلی بۆ خزم و بێگانە پیاوێکی کیسەکراو بوو، بەڵام شێخ ڕەزا دەیەوێت هەر بۆ برا بێت.

بێگانە هەموو صاحبی جاە و جەبەرووتن
بێچارە برای (شێخ عەلی) موفلیس و ڕووتن
ئەی شێخ عەلی چاکە و ثووقت بە برا بێ
باوەڕ مەکە بەم خەلقە کە وەک تولە لە دووتن
قەومێ کە لە عەهدی پدەرت حەلقە بەگوش بوون

تەحقیقی بزانە بەخودا جوملە عەدووتن
ڕەحمیان نییە دەربارەیی تو خزم و ئەقاریب
موشفیقترە بێگانە لەمانە کە عەمووتن
نادان و قورمساغ و نەزانن کە ئەمانە
گاهێ لەسەما، گاه لە سەیری مەلەکووتن
ئەم تەکیە نوشینانە، چە دەروێش و چ صووفی
هەرچەندە بە دڵ موشتەغیلی ذیکر و قونووتن
وەک حاجییێ مابەینی (صەفا)و(مروە) بە تەعجیل
بۆ لوقمە ئەمانیش بە مەثەل یوونس و حووتن

ئیمجا دێتەوە سەرخۆی و دەڵێت:

جومعانە براوە، بەخودا موفلیسە (لامع)
نەپوولی حەمامی هەیە نەپارەیی تووتن

لەلایەکەوە شێخ عەلیی کاکی دەباتە ڕێزی ئەولیا و ئاشنای خودا، لە لایێکەوە کە دەڵێتیش.

لازمە بۆ شێخ سبەینان گورگە خەو
تا بڵێن شێخ عابدە و نانوێ بە شەو

لالوتیی شێخ عەلی لەگەڵ شێخ ڕەزادا، زۆربەی لەبەر دڵ شکاندنی دۆست و ناسیاوی بوو. بۆ نموونە، لە بنەماڵە ناسراوەکانی کەرکوک کە دۆستێکی زۆر نزیکی شێخ عەلی بوون، بنەماڵەی (خادم السجادە) و مەلا مارفی مەلا عەبدوللای خدری و حاجی عەلی قەردار... هتد. شێخ عەلی دەیویست شێخ ڕەزا واز لە و وتە ناشرینانە بێنێت و ڕێگای با و باپیری بگرێت. بەڵام هونەری شێخ ڕەزا لەوەدا بوو و شیعرەکانی بەسەر زمانی خەلقەوە بوو. هەر لەبەرئەوە ، شێخ عەلی شێخ ڕەزای کردە نوێنەری خۆی و پێشەوایی تەکیەی تاڵەبانیی بەغدای پێ سپارد.

لە شیعرێکی تریدا کە بە شێخ عەلی کاکیی دەڵێت، جنێوێکیش دەداتە حەمەی وەستا فەتاح.

(شێخ عەلی) خۆ تۆ منت ئاوارە کرد و دەربەدەر
چاکە هەجوێکت بکەم ئەمما موفیدو موختەسەر
بۆ حەمەی وەستا فەتاح ئێمەت هەموو ئاوارە کرد
ئەی حەمەی وەستا فەتاح دایکت بەکێری نێرەکەر

لە شیعرێکی تریشدا کە باسی ئەو ئازووقەیە ئەکات کە شێخ عەلی وەری ئەگرێت ئەڵێت:

ئەم دەغڵە کە تەسلیمی دەکا شێخ بە هەجیجی
نوقصانی ئەکات هەر لە تەغاریّ دە کەویجی
ئەصل و نەسەبت دۆمە لە من بووی بە هەجیجی
بیّ مروەت و ئینصاف و حەرامزادە و بیجی

***

### شێخ ڕەزا و شێخ مەحەمەد عەلیی برازای

شێخ مەحەمەد عەلی، کە بە "کەڕەڕە" ناسراوە، کوڕی گەورەی شێخ عەلی شێخ عەبدولڕەحمانە. لەپاش کۆچی دوایی باوکی، هەرچەنێک ئەو پۆست نشینی تەکیە بوو، بەڵام لەبەر گویّ گرانی و زوبان لەنگی ئەم کارەی پیّ نەدەکرا و هەر لە هەرزەکارییەوە ئەمەی سپاردە شێخ جەمیلی کوڕی گەورەی.

شێخ مەحەمەد عەلی پیاوێکی ئازا و دەس کراوە و میوان گوزاربوو. لەو کاتەدا میوانخانە (ئوتێل) نەبوو. زۆربەی پیاوە ناسراوەکان یان لە تەکیەی تاڵەبانی و یان لە خانەقای سەید ئەحمەد میوان دەبوون و هەمیشە سوفرە و خوانی شێخ بۆ میوان ئامادە بوو. دایکی شێخ مەحەمەد عەلی؛ زوبەیدە خانمی کچی برایم پاشای باجەلانە.

شێخ ڕەزا، وەکو ، تاڕادەیێک، شەرمی لە شێخ عەلیی کاکی دەکرد، سووی لەم نەدەبووەوە، لەبەرئەوە ناکۆکییان لەنێواندا هەبوو و لە شیعرێکدا دەڵێت:

سا بیّ زگی خۆت هەڵمەدڕە و مەمرە لە داغا
ئەم قەومە هەموو مردن و تو مای لە وەجاغا
لەولاوە پەلێکت لە زەهاو پەل دەوەشێنی

لەم لاوە ڕەگـــێکت لە کنی ســـاوجـــە بولاغـــا

مەبەستی لەمە، شێخ مەحەممەد عەلی دوو ژنی هەبوو، یەکێکیان زێبا خانمی کچی عەلی بەگی برایم پاشای زەهاو و ئەویتریان فاطمە خانمی شێخ قەسیمی نەهریی سابلاغە.
شێخ مەحەممەد عەلی بەسوار چاکی و نیشان شکێنی ناوی دەرهێنابوو. شێخ ڕەزا لەم شیعرەی خوارەوە باسی دەست و تفەنگی دەکات و دەڵێت:

گـەرچی چەند ڕۆژێ بوو تەعلیـمی تفـەنگبـازیی ئەکـرد
ڕۆسـتـــەم ئاســا چووە پارێز لە یەکی تیـــتلە بیـــجــاع
هەر کــــە ئەنگاوتی، وتم؛ دەک دەس و بـازووت نەڕزێ
هەر کـەسێ پێت نەڵێ ڕۆسـتـەم تەرەسـە و قــوڕڕومـســاغ

شەوانی زستـان پیاوانی بەرتەکیە لەدیوەخانی شێخ مەحەممەد عـەلی کۆدەبوونەوە، بە نوکتەبازیی (خلەکەزی) و یاریی (سینی و زەرف) شەویان دەبردە سەر. شێخ مەحەممەد عەلی بۆ ئەوە کۆیانی دەکردەوە نەچنە ناوشار و تووشی گێچەڵ بن. شێخ ڕەزایش تاسوقی لەو کۆبوونەوەیە دەکرد، بەڵام دانوولەی لەگەڵ شێخی برازایدا نەدەکوڵا و گوێیان لێ کەڕ دەکرد. شەوێک دەیەوێت بچێتە دیواخانی برازای، بەڵام دەرگای لێ ناکەنەوە.

رووم کــــردە بەزمی خــــاسی بـرازا ئەزیزەکـــــەم
ئەم شـەو، بەصـەد تەوازوع و ئیـخلاص و سـەرکـزی
ڕووانیم لە درزی قـاپیـیـــەوە خـۆی و تابیـــعــان
دانیـــشـــتـــوون دوور ڕیزە لە دەوری خلەی کــەزی
دەتووت تەمێ کرابوو بە مەخـصـووصی قاپییـەوان
خـۆی کـرد بە نێـرە تورک وتی "کـیم یلیـر سـزی؟"
پێم وت منم کــەســەکــەم مـــامــە شـــێخ ڕەزام
«تانمزمـیـسن، خـومـەییس ئەفـەندی، مـەگـەر بزی؟»
ئەم ســـەددی بابە بۆ منە ئیــــزهاری کـــە تا بڕۆم
یان مـەرحـەمـەت کـە حـیـزە لەسـەرمـا گـونم تەزی
ئەمـــجـــا بەکـــوردی هاتە تەکــەللم وتی بەڵێ

ئەو شــێـخــە حــیله باز و قــومــارباز و كــەر دزی
وەخــتێ كــە لەم مــوعــامــەلە زانیم غــەرەز چیــیــە
دەرحـــاڵ گـــەڕامـــە پاشـــەوە ئەمما بەعـــاجـــزی

شێخ ڕەزا كە لە شێخ عەلی كاكی لالووت بوو؛ لەگەڵ شێخ مەحەمەد عەلیی برازای گۆم لە نێوانیاندا بوو. شێخ عەلی نازی برا بچووكەكانی دەكێشا بەڵام ئەم قسەی سووكی لە مامی قبووڵ نەدەكرد. شێخ ڕەزا ڕۆژێک بەم هەڵبەستەی خوارەوە هەجوی شێخ مەحەمەد عەلی دەكات:

نــەت و دەرپیـــشی مـــریدان چو شكر شـــیـــرینی
بەخـــــدا ای پســــر شــــیـخ تو هرجـــا شكری

واتا:

تۆ تەنها لەبەردەمی مریدەكاندا وەک شەكر شیرین نیت
بەخوا قەسەم ئەی كوڕی شێخ تۆ لە هەموو شوێنێكا شەكری یا تۆ هەر جاشە كەری!

شێخ مەحەمەد عەلی دەیگرێت و قۆڵی با دەدات و هەڕەشەی لێ دەكات، شێخ ڕەزا دەڵێت: توو بە پێچەوانە تێگەیشتوویت، من وتومە:

«تو هەرجا شەكریت، نەک هەر جاشەكەریت»

شێخ ڕەزا نارەزایی خۆی لێ دەربڕیوە و لەم هەڵبەستەی خوارەوە ئیتر پەردەی لە نێواندا هەڵگرتووە.

شــێخ كــە هام صــوحبــەتی شــامــار و نەدیمی حــەمــە بێ
شــێخ كــە دۆســتی مــچــەڕێژاوی یو ئەحــمــەد جــەمــە بێ
شـــێخ لەبەر جـــەلبی دڵی ئایشـــە كـــوڕانە، ژنەكـــەی
شــیــر بكێــشــێت و لە ڕووی والیــدە دەســتــە و قــەمــەبێ
شــێخ كــە قــودســیـــیـــەتی پیــرانی تەریقــەت لە كنی
هەمــوو ئەفســانەو و ئەفســوون، هەمــوو گاڵتــە و گــەمە بێ
شــێخ كــە گــەووادێ وەكــو (خــادمی ســوجــجــادە) لەلای
ســەییــدی حــوڕ، لە ســولالەی عــەلیــو فــاطمــە بێ
شــێخ كــە قــەســری حــەرەمی گــەییــە مــەقــامی ئەعــلا

سـەر بلند کـات و بلێ شـێخ ئەمـە، قـەسـری ئەمـە بێ
شـێخ ئەوا گـوێ هونەری بردەوە کـەشکەک صـەلەوات
شــێخ ئەوا جـێی پدەری گـرتەوە دەسـتی بەمـە بێ

***

### شێخ ڕەزا و حەمەی وەستا فەتاح

حەمەی وەستا فەتاح یەکێک بوو لە دانیشتوانی بەرتەکیەی کەرکووک و وەکیلی خەرجی شێخ عەلی بوو. شێخ عەلی؛ جگە لە نان و شۆربای تەکیە، بۆ برا و خزمانی ئازووقە و موچەی سالانەیشی دەدانێ و ئێوارانیش لەمەنجەلی مالی خۆیەوە خۆراکی شامی بۆ دەناردن. حەمەی وەستا فەتاح سەرپەرشتیی ئەمانەی دەکرد، لەبەر ئەوەی حەریص بوو لەسەر مالی تەکیە و شێخ عەلی، گوێ بەهەرەشە و گورەشەی شێخانی نەدەدا و هەرکەسە بەگوێرەی مووچەی خۆی، دابەشی دەکرد.

شێخ ڕەزا، هەر لە بناغەوە، بەم مووچەیەی کاکی قایل نەبوو و دەیویست بەزۆرە ملێ لەحەمەی وەستا فەتاح لەوە پتر بپچرێنێت و ئەویش نەیدەدا. لەبەرئەوە شێخ ڕەزا لەسەر چۆک بۆی دانیشتبوو لە پالی ئەوە وە جارجار پەلاری لە شێخ عەلیی کاکیشی گردووە.

لە یەکێک لە هەجوەکانی حەمەی وەستا فەتاح دەلێت:

هەزار ئەفـسوون و جـادووی پێـوە ئاوێزانە ئەم ڕیشـە
عـیلاجی گـەر ببێ یا گـووزە یا گـوێزانە ئەم ڕیشـە
بە تەحـریکی تەلێکی صـەد هەزار نەفـسی بە کـوشتن دا
ڕەئیـسی حـیلەکـاران، شـای قـومـاربازانە ئەم ڕیشـە
بەبای سەرسەرِ لە شوێن خۆی ناجمێ ڕیشی ئەمەند سەختە
بەبێ حـیکمـەت نییـە گـەر جـار بەجـار لەرزانە ئەم ڕیشـە
بە زاهیـر سـافـە وەک زیوی سـپی، ئەمما لە باطیندا
ڕەش و پیس و مـەلووەث، وەک بنی قـازانە ئەم ڕیشـە
بەمـەکـرێ ئەمـرەتێنێ حـەز بکا هەرلێـرە تا (مـوکـری)
پەنـاهم دەی خـودایا خـاوەنی زۆرزانـە ئەم ڕیشـە

کە سەیرم کرد، دەزانم شێخ لەمن مەسرووره یا عاجز
حەمەی وەستا فەتاح، بۆ حاڵی من میزانە ئەم ڕیشە
هەزار هەوسار و دەسبەند و گوریسی لێ دروست ئەکرێ
بەصەد باتمان خوری گەر دەس کەوێ هەرزانە ئەم ڕیشە

***

### لە یاریی زەرفێندا

یاریی زەرفێن لە کوردستاندا باوبوو. ئەم یارییە بریتییە لە یانزە زەرفی لە تووج دروست کراو، لەسەر سینییەک ڕیز دەکرێت و لەژێر پەردەوە ئەنگوستیلەیەک لە یەکێکیدا دەشاررێتەوە. یاریکەران کە دەبنە دوو دەستەوە، دەستەیەکیان دەیشارنەوە و ئەویتریان دەیدۆزنەوە. لە شارەکانی کوردستاندا، لە نێوان دوو گەڕەک، یان دوو شاردا لە شەوانی زستان و بەتایبەتی شەوانی مانگی ڕەمەزاندا دەکرا. گرەویش لەسەر سینییەکەی داتڵی یان پاقلاوە بوو. لەم یارییەدا، گەلێک زیرەکی و جارجاریش فێڵبازی دەکرا.

شێخ ڕەزا باسی فێڵبازیی ئەم یارییە ئەکات و ئەڵێت:

ئەی مەلا قەد تۆ لە زەرفێندا وەها خێرا نەبووی
یا لە حیزبی بەختی من یا مۆرکەت موی پێوە بوو
حاڵ لە سێ خاڵی نییە توخوا بە ڕاستی پێم بڵێ
موی سمێڵت یا بەرت یا کلکی یا بووی پێوە بوو
وا دەزانم مووی ڕزیوی پێستی دەبباغخانە بوو
چونکە ئاساری کەتیرە و جەوت و مازوی پێوە بوو
پەشمی پاشت بۆ مەزەندە چونکە وەختێ ڕۆژهەڵات
دیقەتم کرد دەورو پشتی زەرفەکان گوی پێوە بوو
مووی سەگی گەڕیش وەها نابێ، بەتەخمین صەد هەزار
ڕشک و ئەسپێ و کێچ و کەهلە، کرم و کەرنووی پێوەبوو
ئەلغەرەز دولبشکی رووحم چوو لە ترسان ئەو شەوە
هێندە دوپشک و هەزار پێ و مار و مێرووی پێوەبوو

قاوەچی ڕووی سینییەکەی هەرچەند بەنینۆک هەڵکراند
قەلعی ئاساری نەکرد هێشتا بەشی تۆی پێوەبوو
زۆر نەمابوو بۆیی سەرگیین بمکوژێ، وای تێدەگەم
تووکی بن کلکی کەر و بارگیری مردووی پێوە بوو
داوەکەی موویینت و گوویینت بە کاری هیچ نەهات
گەرچی هەر لایێ دوو صەد ئەفسوون و جادووی پێوە بوو

***

## لەگەڵ شێخ هۆمەر

شێخ هۆمەر لە کاتی پێگەیشتنی میوەهاتدا، بە قەرتاڵە قۆخ و ترێ و هەنجیری بەدیاری دەهێنا بۆ شێخ ڕەزا. بەڵام جارێک دێت و قۆخی پێ نییە و شێخ ڕەزا وا پێشوازیی لێ ئەکات.

هەر لەناکا و زرمەیەک هات کێی کوڕە (شێخ هۆمەرە)
شێخی چی مردووت مرێ بۆچی نەتگوت جاشەکەرە
دەردی لوقووی گرت لەناکاو شێخە توهمەت کەرەکە
ئەو قیافەت حیزەکەی هەیئەت وەکوو کەمتارەکە
قۆخ وەهای لێ کرد، لە جێی قۆخ کاشکی پۆخی دەخوارد
شێخەکەی دەم چەوتەکەی لچ گیرەکەی لێو خوارەکە
کوردە بێ ناموسەکەی گۆرانە قوڕومساغەکەی
حیزەکەی بێ دینەکەی کەربابەکەی بێعارەکە

***

## زۆرانبازیی شێخ ڕەزا و شێخ ستار

شێخ ڕەزا پیاوێکی باڵا بەرزی چوارشانەی بەهێز بوو. لە مەیدانی گاڵتە و گەپدا، نەک تەنها هێزی زوبانی، جارجاریش هێزی بازووی بەکارهێناوە.

لەم گاڵتە و گەپەدا، شێخ ڕەزا و شێخ ستاری تاڵەبانی زۆران دەگرن و شێخ ڕەزا شێخ

ستار ئەبەزێنێ و دەیداتە زەوی. بەم شیعرە فارسییە، باسی ئەم زۆرانبازییە ئەکات:

ســتــار آنکه هست به نیــر و تهــمــتنا
ایزد نیـــا فـــریده چون او اهریمنا
دوش از درم در آمـد و فـرمـایدکـای رضـا
(انت الذی تـصـــارعنی قلتـــه انا)
خندید قـــاه قـــاه کـــه روباه چون زند
باشـیـــر پنجـه تاتو زنی پنجـه با منا؟
گــفــتم بجــای خـود بنشین اینقــدر مناز
باکــرهای ســاعــد و یا مـــیل گـــردنا
هومــان کـه پهلوان جـهــاد بود عــاقـبت
دیدی چەکـــونه اش بســـر آورد بیـــژنا
گـــر تو بزور بازوی خـــود بیـــژن، من آن
غـــرنده اژدرم کـــه ببلعـــیـــد بهـــمنا
چون این سـخن شنیـد بر آشـفت از غـضب
گـــردن فـــراخت زد باکـــمـــر عطف دامنا
دســتی دراز کــرد و گــریبــان من گــرفت
تا افگند بـخـــاک منی شـــیـــر او زنا
هرچند ســعی کــرد تنی من تکان نخــورد
از جــای خـــود تکان نخـــورد کـــوه آهنا
نیــــروی او چـونیـک بمن آشکار شـــد
جـــستم زجـای و چون پسـر کـاوه قـارنا
مـــانند پور زال گــرفــتم کـمــر کــهش
بـر بوده مـش زخـــاک چو یـک دانه ارزنا
اورا ز روی خـــــشم جنـان بـر زمین ردم
کــــز مـــردنش هنوز دلم نیـــست ایمنا

آواز جـــــرت و پرت درونـش بلـنـد شـــــد
وز بارگــاه مــقــعــدش افــتــاه شــيــونا
آهی زدل کــشــيـــد چو نادم بگاه مـــرگ
گــفــتــا: (حــيــاته ذهب، مــوته دنا)
برقــوت و شـــجـــاعت (لامع) جنان بدل
اقـــرارکـــرد و گــفت: تو مـــردی و من زنا

واتا:

ستار، ئەو کەسەی بەهێز تەهەمەتەنێکە
خوا ئەهریمەنێکی وەک ئەوی دروست نەکردووە
دوێنێ لەدەرگای ماڵەکەوە هاتە ژوورەوە و نەڕاندی: ڕەزایا
تۆی ئەوەی لەگەڵم بە زۆران دێی؟ وتم: منم
قاقا پێکەنی و وتی: ڕێوی چۆن پەنجە لە پەنجەی شێر ئەدا تا تۆ پەنجە لەپەنجەی من بدەی؟
وتم: لە شوێنی خۆت دانیشە، ئەوەندە مەنازە.
بەماسولکەکانی قۆڵ و میلی گەردنت
(هومان) کەپاڵەوانی جیهان بوو، سەرئەنجام
دیت (بیژەن) چی بەسەر هێنا؟
ئەگەر تۆ بە هێزی بازووی خۆت بیژەنی، منیش
ئەو ئەژدەرە بەنەڕەیەم کە بەهەمە قووت دا.
کە ئەم قسەیەی بیست لە ڕقاندا تووڕە بوو
ملی هەڵبڕی چمکی داوێنەکەی کرد بە بەری پشتێنەکەیا
دەستێکی درێژ کرد و یەخەی گرتم،
تا منی شێر ڕمێن لە خاکدا بگەوزێنێ،
هەرچەندە هەوڵیدا، لاشەی من لەشوێنی خۆی نەبزووت،
کێوی ئاسن لە جێگای خۆیا ناجوولێ،
کە هێزی ئەم باش لەمن ئاشکرا بوو،
لەجێی خۆم هەڵسام وەک (قارنا)ی کوڕی کاوە،
وەک کوڕی زاڵ (ڕۆستەمی زاڵ) پشتێنەکەیم گرت،
وەک دەنکە گاڵێ لە عەرد هەڵم بڕی و فڕاندم،
وا بەرقەوە دام بە ڕووی زەویدا،

ئێستایش هێشتا دڵم ئەمین نییە لەوە کە نەمردبێ
ئاوازی جرتوفرتی دەروونی بەرز بووەوە،
لەبارەگای قنگیشیەوە هاواری شیوەن هەڵسا،
وەک مرۆی پەشیمانی سەرەمەرگ هەناسەیەکی هەڵکێشا،
وتی: ژینی بەسەرچوو، مەرگی نزیک بووەوە،
وا بەدڵ دانی بەهێز و قارەمانی (لامع) دانا،
وتی: تۆ پیاوی و من ئافرەتم.

***

## لەسەر جوانیی کاکە جافی کوڕی کەریم ئاغا

هەرچییەک بێت مەبەستی، شێخ ڕەزا لەباسی جوانیی سورووشت و ئارەمیزاددا زۆر وەستایە. لێرەدا باسی شۆخ و شەنگیی ئەم لاوە دەکات:

شیرین وەکو خوسرەو پسەری هورمزە جافە
چاو مامزە، لێو قرمزە، ئیمانسزە، جافە
چاوی ڕەشی فەتتانی وەکو شەببۆی عەییار
دین و دڵ و ئیمانی دزیوم دزە جافە
بورهانە لەسەر قودرەتی حەق ئایەتی حوسنی
بۆ دەعویایی ئیشپاتی خودا موعجیزە جافە
بۆ کەشمەکەش و عەربەدە مژگانی سیاهی
وەک لە شکری (تەیموور) و سوپای (جەنگز)ە جافە
تەنیا نە (ڕەزا) بۆی بووەتە بەندەیی فەرمان
فەرمانی لەسەر شاە و گەدا نافیذە جافە

کەچی لەگەڵ ئەم هەموو باسەی جوانیی، شێخ ڕەزا نایەوێت هاوڕێتیی بکات و دەڵێت:

بەجێ ما کاکە جاف خۆی و کڵاوی
دەری کرد، ئافەرین، خدری گڵاوی

***

## لەبەر دووریی قادری وەستا خدر

قادری وەستا خدر لەبنەڕەتدا خەلقی ناوچەی ئاکۆیان بوو و لەبەرتەکیە جێنشین بووبوو و زۆریش هاودەمی شێخ ڕەزا بوو. قادر، وەکو هەندێ لەبەرتەکیەیی، ساڵی چەند کاروانێکی توتن هێنانی دەکرد و توتنی "بێشەمە و شاور و شێتنە"ی دەهێنا و دەیفرۆشتە جگەرەفرۆشەکانی بازاڕی کەرکووک. کاروانی ئەو سەردەمە لەبەر ڕێ گرتنی هەمەوەند و لەترسی پۆلیسی ڕێژی، لەدزە ڕێگاکانەوە هاتوچۆیان دەکرد و زۆریان پێ دەچوو. شێخ ڕەزا ئەم شیعرەی لە دووریی قادری وەستا خدری هاودەمی وتووە.

بۆ نەسووتێ جگەر و بۆچی نەبێ دڵ بە کەباب
بۆچی نەڕوا لەتەنم ڕووحی ڕەوان میثلی غوراب
بۆ لەسەر چاوەیی چاو هەڵ نەقوڵێ ڕەشحەیی خوێن
بۆچ لە فەووارەیی مژرگان نەچکێ قەطرەیی ئاب
بۆ لەبەر ناڵە نەبێ حەلقەیی حەلقم بە سروود
بۆچ لەبەر گریە نەبێ چەشمەیی چەشمم بەسەراب
موونیسی ڕۆژ و شەوم، باعثی ئارامی دڵم
ڕۆیی بو من لە غەمی کەوتمە نی و بەحری عەذاب
بەوقووعی، سەفەری قادری ئوستاد خدر
خانەیی عەیشمی تاڵ کرد فەلەکی خانە خراب
چەنگ و نەی، لێ مەدە موطریب کە لەبەرفرقەتی ئەو
ڕەنەکی ڕوحە لە گوێم نەفخەیی ئاوازی ڕەباب
ساغیری مەی مەدە ساقی کە لەبەر دوریی ئەو
تاڵە وەک ژەهری هەلایل لەمەذاقم مەیی ناب
کاری کردن نەبو ئەم کارە کە گەردوونی دەنی
کردی، رووی ڕەش بێ وەکو بەختی من و پەڕی غوراب
ئەی (ڕەزا) ڕەنگە لەبەر فیرقەتی ئەوموونیسە تۆ
قەت نەبی خاڵی وەکو کورە لە سۆزی تەب و تاب

کەچی لە مەیدانی گاڵتەدا دەڵێت:

شـــد عـــدەد بـازی مـــاسـی دو
(قـــادری وەســـتـــا خلە) ڕیشت بەگـــو

***

### نینۆکی شێخ ڕەزا و کلکی حەسەن ئاغای هەمزە ئاغا

شێخ ڕەزا و حەسەنی هەمزە ئاغا لەسەر مانای (شەم) دەبێتە مشتومڕیان شێخ ڕەزا دەڵێت نینۆکی شێرە و حەسەن ئاغا دەڵێت کلکی شێرە، لەسەر ئەمە گرە و ئەکەن و سەیری کتێب ئەکەن قسەی حەسەن ئاغا دەرئەچێت، شێخ ڕەزا گرەوەکە ئەدۆڕێنێت و لەم شیعرەدا وا باسی ئەکات.

(حەسەنی هەمزە) لەسەر (شەم) کە چییە تەفسیری
دەست بە شمشێر لەگەڵم صاحیبی دەعوا دەرچوو
من وتم ناخوێنی شێرە ئەو وتی کلکی شێرە
لەسەر ئەم لەفزە بەشی شۆڕش و دەعوا دەرچوو
گرەوم کرد لەگەڵی و چووم و کتێبم هێنا
ناخوێنی من نەبوو کلکی حەسەن ئاغا دەرچوو

***

### شێخ ڕەزا لەیاریی شەترەنجدا

شێخ ڕەزا شارەزاییەکی زۆری لەیاریی شەترەنجدا هەبووە. وەکوو دەیگێڕنەوە جارێک لەگەڵ سەید مەحموودی نەقیب گەیلانی یاریی شەترەنج ئەکات و تەسبیحیشی بە دەستەو بەڵێ و ویرد و دۆعا ئەخوێنێت. لەناکاو هاوار ئەکات: "قتلتە ورب الکعبە" سەید مەحموود وا ئەزانێت شای شەترەنجی کوشت، هەر ئەپرسێت: "وین... وین... قتلتە؟" ئەڵێت کوڕە ئەمە نا، شیعرێکی هەجوی موفتی زەهاویی بۆ دەخوێنێتەوە، سەید مەحموود ئەڵێت: ئەمە چ بەڵایەکە، بەچاو شەترەنج بازی ئەکات بەدەست تەسبیح و بەڵێ و ویرد و دوعا و بەبیر شیعر ڕێک ئەخات.

لە شیعرێکی فارسیدا، لە یاریی شەترەنجدا، خۆی هەڵئەنێت و ئەڵێت:

پس از تشـریفت ای مـیـر سـخن سنج

مـفـتش بامن از نوباخت شطرنج

ز حـدت کف زنان بر تخت مـیگفت

مگر مـعنای شطرنج است صـدرنج

بسی دقت نمودی جـهـد فـرمـود

یـک از دنبـال یـک بـردم از او پـنـج

سـه اول پـنـج آخـر هشت نـوبت

بر و غـالب شـدم چون مـار برگنج

چو من مـردی با سـتـادی در این کـار

بناشـد در همـه اسـلام و افـرنج

عـراق و پارس و تبـریز و صـفـاهان

بخـارا و خـطـا و بـلـخ و بـاگـنـج

نبـاشـد چون (رضـا) شطرنج بازی

نـه‌در تـرک و نـه در روم و نـه در زنج

واتا:

پاش تەشریف هێنانت ئەی میری قسە هەڵسەنگێن

موفەتیش، سەر لەنوێ شەترەنجی لێ دۆڕاندم

لە تووڕەییاندا دەستی ئەدا بە لەپی دەسیا و ئەیوت:

بۆچی واتای شەترەنج سەد ڕەنج و دەردە؟

زۆر ورد بوەوە و خۆی زۆر ماندوو کرد

یەک لە دوای یەک پێنج دەستم لێ بردەوە

لە سەرەتادا سێ دەست و لەدواییدا پێنج، هەشت جار

زاڵ بووم بەسەریا وەک مار بەسەر گەنجینەدا

مەردێکی وەک من وەستا و شارەزا لەم کارەدا

لە ناو تێکڕای موسوڵمان و فەرەنگیدا نییە

عێراق و فارس و تەبرێز و ئەسفەهان

بوخارا و خەتا و بەڵخ و باگەنج

شەترەنج بازێکی وەک (ڕەزا) نییە
نە لەناو تورک و نە لە ڕۆم و نە لە زەنگییەکانا

لەسەر باسی شەترەنج کە لەگەڵ مستەفا بەگی باجەلاندا یاریی کردووە ئەڵێت:

لە بەگ وا بوو کە من ماتم کشی کرد
کە من هەستام ئەو داماو و فشی کرد
گەهێ سەیرانی سەر گون بوو گەهێ کێر
حەقیقەت مستەفا بەگ گەردشی کرد
دەبوو باوکی سەگی ناو نایە ئەمما
بەگی ناو نا قورمساغ یا غنشی کرد

***

## سوپاس بۆ عوسمان ئەفەندی - کاتبی تەحریراتی کەرکووک

عوسمان ئەفەندی کاتبی تەحریراتی کەرکووک هەندێک تووتنی شاوری بۆندار ئەنێرێت بۆ شێخ ڕەزا، شێخیش لەم شیعرە فارسییەدا سوپاسی ئەکات.

ای صورت بسان خلیفەء ثالث
وی نیکو سیرت و حمیدە صفات
نەچو من هست شاعری نەچو تو
کاتبی در فنون تحریرات
عنبرین ساختە دماغمرا
بتماکوی عنبرین نغحات
از کلویم بسینە هر نفس
چون فرومیرد مُحد حیات
وز درون جگر نبای ککو
چون همی برگشم مفرح ذات
دوستان زبانیم هستند
باد یکایک فدای عهد و وفات

این قـــدر من دعـــا، مـــیگویم
کـــه خـــلایق همـــه کنند دعـــات

واتا:

ئەی ئەوە بەشێوە لە خەلیفەی سێیەم ئەچێ
ئەی ڕەوشت باش و سیفەت تاریف کراو
نە شاعیرێکی وەکو من هەیە و نە وەکو تو
نووسەرێک هەیە لە هونەری نووسیندا
دەماغی منت وەک عەنبەر بۆنخۆش کردووە
بە تووتنی عەنبەر بۆنت
هەر مژێکی کە بە قوڕگما ئەچێتە خوار
درێژە بەژیانم ئەدا
کە لە درونی جگەریشمەوە دێتەوە دەر
بۆ ناوی قامیشی گەرووم هەڵی ئەکێشم دڵم خۆش ئەکا
کەسانێک هەن بە زوبان دۆستمن
یەک بەیەک بینە قوربانی عەهد و وەفات
هەر ئەوەندە من دۆعا ئەکەم
کە خەلائیقیش هەموو دۆعات بۆ بکەن

***

## بەرخانەی شێخ ڕەزا

شێخانی تاڵەبانی؛ جگە لە کاری کشتوکاڵ، زۆربەیان مەڕداریشیان ئەکرد. لە بەهاردا، کە کاتی مەڕ زێیە، بەڕەشماڵەوە بۆ بەهارە هەوار دەچوونە دەشتی (حەویجە)، ئەم دەشتە جێی بەهارە هەواری ئێلانی تاڵەبانی و داوەدو کاکەیی و سمایل عوزێری و کافرۆشی و ڕۆژبەیانی و جەباریی کورد بوو. لە پاڵی دۆستایەتیدا، لە سالانی وشکە ساڵ، مەڕدارانی عەشیرەتی (آل عوبێد)ی عەرەبیش، لە (شوبێچە)ی لاپاڵی چیای حەمرینەوە دەهاتنە خوارێ و تێکەڵی عەشایەری کورد ئەبوون. لە پاشان، کابرایەکی ڕۆژبەیانی ئاغایەکی سماییل عوزێری ئەکوشێت، ئیتر ئێلانی سماییل عوزێری نایێن و ئێلانی تریشی کورد، هەندێکیان بەدائیمی هەندێ دێهاتیان لەو ناوچەیە ئاوەدان کردەوە و خەریکی کشتوکاڵ بوون. بەڵام لە ساڵی ١٩٣٧-١٩٣٨، حکومەتی عێراق، ئاوی لە ڕووباری زێی

بچووکەوە (الزاب الصغیر) هێنایە ئەم هەرێمە و عەشایری عەرەبی تێدا جێنشین کرد.

شێخانی تاڵەبانی؛ بۆ ئەوەی دەمی شێخ ڕەزا لەیەک بنێن، هەریەکە ساڵی بەرخێکیان بۆ دەنارد و ئەمە بووە باجی (بەرخانە)ی شێخ ڕەزا.

قەومەکان، بەو ذاتە وا حوکمی لەسەر بەحر و بەڕە
بەرخە نێرێ گەر نەنێرێ هەر کەسێ خاوەن مەڕە
دێم بە گژیا ئەیدڕم گەر (في المثل) شێری نەڕە
با نە قەومێت و نەزانن ئەم هەموو شۆڕ و شەڕە
گشت لەسەر بەرخێ شەل و کاوڕێ لەڕ و بزنێ گەڕە

***

## ماینەکەی کوێخا عەلی

کوێخا عەلی ماینێکی کوێتی دابووە شێخ ڕەزا. ئەوەی شتی بدابایەتە شێخ ڕەزا، بەقیمەت یان بەهیممەت، ئەبوایە «نەمر» بێت. هەر شتێکی لێ هات، ئیتر شێخ ڕەزا بەسەر و پۆتەڵاکیدا ئەچێت. ماینی کوێخا عەلی دەکەوێ بەلادا و شێخ ڕەزایش ئەمەی بۆ ئەڵێت:

کێ چوزانێ کووچەڵەی سمتی شکاوە یا ملی
وا لە حاڵی حەلوەلادا ماینەکەی (کوێخا عەلی)
چووم بزانم ماوە یا خ و مردووە، وەختێ کەدیم
شا دەماری سست، نا بزوێ ڕەگی قاچ و قولی
دام بەسەر خۆمدا گوتم: وا حسرەتا بۆ ماینە کوێت
دەک بە میراتم کەوێ دەسبەند و هەوسار و جلی
نابزوێ قاروورەی ئەگەر صد جار تەماشا کا حەکیم
دەردی نازانێ چییە تاکو نەکا بێنی سلی
گەر ئیمامی عەسکەری نوێژی لەسەر کا لایقە
چونکە موشتاقە، بە وەصلی ناڵەکانی چوار پەلی

کەسری ئەنفی دوژمنان و جەبری کەسری دۆستان
هەر بمێنێ چاکە بەخوا شێخ (ڕەزا) و کێری زلی

***

## شێخ ڕەزا و شێخ صاڵحی مامی

شێخ صاڵح کوڕی شێخ ئەحمەدی تاڵەبانە و مامی شێخ ڕەزایە. ئەم وەکو شێخ غەفووری مامی دەوڵەمەند نەبوو کە پێی بڵێت "دەوڵەتی شەددادی هەیە" ڕۆژێک دەچێتە ماڵیان. ئەویش هەر ئەوەندەی بۆ دەکرێت کە نان و کەرەی دەرخوارد بدات. شێخ ڕەزا وای باس دەکات:

گەرچی فەقیر و موفلیسە "شێخ مامە صالحم"
ئەمدی کەسێ وەکو ئەو صاحێبی کەرەم
میوانی بووم نان و کەرەی نایە بەردەمم
ئێستایش بەبێ مواهەنە مەمنوونی ئەو کەرەم

شێخ ڕەزا دەزانێ مەبەستی لە «مەمنوونی ئەو کەرەم» چییە. فەرمون لە جێگایەکی تریدا چی پێ دەڵێت!

تو کە خۆت مەیلی جنێو بازی دەکەی "شێخ صالح"
بۆ دەکەی سەرزەنشی من کە "ڕەزا" هەجاوە
غایەتی بەندە، جنێوم بە دوو سێ کەس دابێ
تو هەتا ئێستە بە قوربان، بە هەزارت داوە!

***

## جەنگی مەحموود بەگی شێروانە و جوکل

شەڕێک لە نێوانی مەحموود بەگی شێروانە و جوکل ڕوو دەدا. لایەنگیرانی مەحموود بەگ باسی ئازایی ئەم ئەکەن. شێخ ڕەزا؛ بە بەکارهێنانی وشەی «شێروانە» بەسێ چەشن، باسی ئەم شەڕە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت:

جەنگ گاهی جوکل و «مەحموود بەگ»، شێروانە بوو
ئافەرین "مەحموود بەگ؛ لەم جەنگەدا شێر وانە بوو

وەقــتێ قــاصــیــد هات و لێم پرسی: چلۆن بوو ئەم شــەڕە
ورده ورده بۆی بەیان کـــردم، کـــەچی شـــێـــڕ وانە بوو

***

## ئەولادی ئەم عەصرە

ڕۆژێک شــێخ ڕەزا لە مــحــەمــەدی کــوڕی، کــە منداڵ بووه، تووڕە ئەبێت و ئەکــاتە کۆچانێکدا و ڕاوی ئەنێت. مـحەمـەد خۆی دەخـاتە پشتی "سـەید ئەمـینی حەپلوس" کە خەلقی گەڕەکی بەرتەکیە بوو. ئەویش لەتکادا:

«یا شێخ صەلەوات دە ئەولادتە» و بەردەمی ئەگرێتەوە. شێخ ڕەزایش یەکسەر:

تڕی ئـەولادی ئـەم عـــــەصـــــرە بە کـــــێـــــرم
کـــە من مـــردم مـــەگـــەر گـــوو بکەن بە خـــێـــرم
بەم جـــووتە گـــونەوە کـــە دەڵـێی عـــەنتـــەری نێـــرم
خـــۆت لادە نەوەک بتـــخـــەمـــە بەر حـــەملەیی کـــێـــرم

هەندێک دەڵێن؛ لەو کـاتەدا دوکـتـۆر حوسـێن بـاباجـان لەوێ بووە و دووا بەیتـەکـە ئەو وتوویەتی.

***

## لەگەڵ عیزەتی تەل

عـیزەت مەئمووری تەل (برید و برق)ی سولەیمانی بووە. پیـاوێکی زیرەک و نوکتەباز و خاوەنی قسەی نەستەق بوو. بێ گومان لەم نوکتەبازییەدا لەگەڵ شێخ ڕەزادا دەمە تەقێیان بووە. لەوانە شێخ ڕەزا ئەڵێت:

پیـــر کـە کـــۆکی و نەتڕی دووره لە مـــردن هێـــشـــتـــا
ورده ئاهەنگی دوای کـــۆکـــە نیـــشـــانەی ئەجـــەلە
پیـــر کـــە کـــۆکی و تڕی، دەنگی وەکـــو بارەزەلە
شـــاهیـــدی مـــوعـــتـــەبەرم عـــیـــزەتی مـــأمـــوری تەلە

هەروا لە شیعرێکی تورکیشدا پێی دەڵێت:

عـــــــــزت يـوزنـى تـيـغ زبـانـمـلـه تـراش ايـت
آب دهـنـكـلـه دەهـنـى گـــــــوتـنـى يـاش ايـت
آندن صــوره يات خــرقــەمـى آلتنده فــراش ايت
پارەم واريســـه آل، يوقـــســـه ســويله بلاش ايت
گـوت سلمك ايچـون تاش آرامه خايەمى تاش ايت
اوردقـــچـــه ديان ديه آمـــان شـيـــخم يواش ايت

واتا:

عیزەت بە تیغی زوبانم ڕووت تەراش کە
بە ئاوی دەمت کونی قنگت تەڕ کە
لەپاش ئەوە پاڵ کەوە خەرقەکەم لە ژێرت ڕاخە
پارەم هەبوو وەرگرە، یان بڵێ بەلاش بیکە
بۆ قنگ سڕین بۆ بەرد مەگەڕێ گونم بکەرە بەرد
تا دەتوانی خۆت بگرە مەڵێ ئەمان شێخم ئیواش کە

***

## غەزەلی هەڵماڵراوی شێخ ڕەزا

چوومـه خـزمـەت یاری مـومـتـازم وتی لاچۆ دزی
پێم نیشان دا ئەسڵی مەقصەد نایە بەردەستم کوزی
چەند هاوارم لەکـێـرم کـرد؛ نـەکـەی فـیلە نەکـەی
گوێی نەدامێ خۆی هەوادا کەوتە ناو قەعری کوزی

غەزەلێکی هەڵماڵراوی تری:

وتم: ئەی شـۆخی پەری چەهرە ئەمـەت پێـوە دەچێ؟
وتی: یـاڕەب جـــەوابم نـیـــــــە خـــۆت ئەیزانی
وتم: هـەر تێی ئەخـەم و لێی ئەبڕم هەرچی بڵـێـی
وتی: هـەر ئەزیـەتی گـیـــانم مـــەدە، خـــۆت ئەیزانی

***

## سوکە گاڵتەی شێخ ڕەزا

جاران فەقێ و سوختەکانی (حوجرە) شەویان بە شەڕە شیعری ڕائەبوارد. یەکێک بەیتێکی شیعری شاعیرێکی دەوت و دوا پیتی چی بوایێ ئەویتر بەو بەیتەی کە بەو پیتە دەس لی پێ ئەکا. ئەوەی دەهێنایەوە. بێ گومان دیواخانی شێخ ڕەزا جێگای ئەم ڕابواردنە بووە. بەڵام شێخ ڕەزا هیچ کاتێک بۆ شیعر دانەماوە و گورج شیعرێکی بە یەکێک لەو دانیشتوانانە هەڵدەدا. زۆربەی تاکە شیعرەکانی لەم بابەتە بوون. فەرموون لەگەڵ هەندێکیان:

عومرم گەیی بە هەشتا، کێرم بەکارە هێشتا
تەصدیق ئەگەر نافەرمووی هەستم بەرم بەرەشتا

دوا پیتی شیعرەکە (ا)ە دەبێت ئەویتر بە (ا) دەس پێ بکات:

ئەحمەق بووم ئەمکرد هەتا ریشم ئەبو گانێ بدەم
(مستەفا بەگ) چاکی کرد تا ڕیشی هات هەر گانی دا

مەبەستی لە مستەفا بەگی باجەڵانە. ئەمیش بە (ا) دوایی هات.

ئەسپەکەت دەرکرد لە دەستم وا دریغ بۆ ئەسپە کوێت
سنگەکەی ماوە (کەریم خان) پێم بڵێ بیکوتمە کوێت!

***

تۆ هەتە تیغی دەبان و من هەمە تیغی زوبان
فەرقی ئەم دوو تیغە هەر وەک ئاسمان و ڕێسمان

***

نان و دۆشاوی ئەمان دابوو بە یاپراغ و پلاو
بووی بە گەورەی ئەهلی (نۆدێ) کاکە لاو

کە حکومەت مەعاشی سەیدەکانی جەباریش دەبڕێت شێخ ڕەزا ئەڵێت:

وام ئەزانی ئێوە ساداتن مەعاشتان نابڕن
داخی داخانم (جەباری) خۆ لە ئێوەیشیان بڕی
بۆم دەنێرێ نیسک و نۆک و سووتەنی و خاکە و خەلووز

لازمــه بۆ کــوڕی حــاجی هەر بخــوێنم (قل آعــوذ)
حــاتەمــیش، ڕاســتت دەوێ، ناگــاتە حــاجی بۆ ســەخــا
مــاهی ئەنوەر کــەی دەبێــتــە نەیــیــری عــالەم فــروز

لەسەر ئاو هەوای قەلادزە دەڵێت:

بەدە آب و هــەوای "قـــــــەلـعـــــــە دزە"
کــە ســەگــیــشی لە عــومــری خــۆی وەڕزە
مــلــی ئــەهــلــی لــەبــەر لــەڕی و چــرچــی
هەر وەکـــو کـــێـــری پشت لە کـــوزە

لەگاڵتەیەک لەگەڵ شێخ صالحی مامی دەڵێت:

تۆ کە خۆت مەیلی جنێو بازی دەکەی «شێخ صالح»
بۆ دەکــەی ســەرزەنشی من کــە (ڕەزا) هەجــجــاوە
غـــایەتی بەندە، جنێـــوم بەدوو سێ کـــەسێ دابێ
تو هەتا ئیـــســـتـــا، بەقـــوربان، بە هەزارت داوە

لەگەڵ مەلایەکی کوێر:

نا بەکـــاری وەکـــو ئەم جـــووتە لەعـــینە لێـــرە
نەبو قـــەت ئەمـــە مـــوددەییێکی مـــەدید و دێرە
ئەو بە تڕ گـــوێز ئەشکێنێت و ئەمـــیش قنگ ئەدڕێ
هەردو عـــاصین لە خـــودا کـــێـــری من و ئەم کـــوێرە

***

هەر کـــــــەسێ نـاوی مـــــــەلا ئەزیـزە
دایم لەبن گـــونی هەر گـــیـــزە گـــیـــزە
بەخـــۆی گـــەواد و ژنەکـــەی حـــیـــزە
خـــواردنی گـــووە و شـــەربەتی مـــیـــزە

***

بەهوودی بەچەیێکم گـرت و لێم برد و تیـا خـووسـا
کە تێم نا چاوی نووسا بانگی کرد: یا حەزرەتی مووسا

***

ئەم قـەحـپـە فـەلەک لەداخی مـردم
مـوحـتـاجی ڕەشی ڕەشـیـدی کـردم

***

موددەتێ نێـر بازی بو ئێـسـتـاکـە مەیلی مێ ئەکەم
ئارەزووی گـانی کـچـێکی کـوز پڕی دەڕپێ ئەکـەم

***

مـاری ڕەشـە خنکاوە لە گـێـژاوی خـەلادا
کـێـرمـە لە قنگی کـاکـە حـەمـەی حـاجی مـەلادا

***

ئاخ لەدەس شـۆڕبای سلێـمـان جـاوش و قـاوەی خلە
ئەو دەڵێـی ئاوی گـەڕاوە، ئەم دەڵێـی نەوتی گلە

***

سلێمان چاوش شۆربای تەکیەی ئەکرد و خلەیش قاوەچی بوو. شێخ ڕەزا باسی نەوتی گل ئەکات کە لە زەمانی عوسمانی و حوکمی عیراق نەوتی دێی (کۆرومۆر)ی ناوچەی (گل) شێخ حەمید و لەپاشان شێخ تالیبی کوڕی لە حکومەت بە (التزام) دەیانگرت بەجۆرێکی بیدائی نەوتێکی زەردیان لێ دەردەکرد و لە دێیەکانی کوردستاندا بۆ (چرا) بەکار دەهێنرا.

هەتیـوی لووس و بێ تووکم لەعـومـری خـۆم گـەلێ گـاوە
لە سـەمتی سـمـتی (حمادی)م نەبرد ئەم حەسرەتەم ماوە

***

هەتیـوی خـوبڕو و مـەحـبـووبی سـادە
کـە دەسـتـت کـەوت سـواری بە و پیـادە

***

هەر لەدەنگی کەرەنا و شەیپووری جەنگیزخان ئەکا
وردە ئاهەنگی دوایی پیر کە وەختێ گان ئەکا

دێی تاڵەبان لە هەرێمێکی دەیمەکاڵە بەرهەمی کشتوکاڵی لەسەر بارانە. هەندێ جار وشکە ساڵ دەبێت ئاغا و جوتیار وەکو یەک بێ وڵەت و دەسکورت دەبن. جوتیاران لەسەر ئەم بەرز و نزمیی سروشت و کەم بارانییە ڕۆژنامەی خۆیان هەیە. دەڵێن: "ئیمڕۆ ئاغا و قەرەیە" گوایە لەپێش ئەمەدا کە وشکە ساڵە، جوتیار ئاغا بەجێ دێڵێت و بەشوێنی گوزەراندا دەڕوات. کە باران دەبارێت پەشیمان دەبێتەوە و لە دوورەوە دەردەکەوێت و دێتەوە.

میکائیل جوتیاری شێخ ڕەزا دەبێت. پەیمانی دەداتێت کە وەرزەکەی بەجێ نەیڵێت بەڵام عەهد و پەیمان نایێنێتە جێ و دەکەوێتە بەر پەلاری شێخ ڕەزا:

جاشک ترێن میکائیل عەهدی بەسەر نەهێنا
عومری گەیشتە هەشتا وازی لە کەر نەهێنا
ئەمبازی بوو تراندی، ئێستا گوتی بەهارە
تا ڕیخی دەرنەهێنا تاریخی دەرنەهێنا

***

گویند اگر وطء کنی عرش بلرزد
عرشی کە بیک وطء بلرزد بچە ارزد
مایيم و یکی حجرەء بی باک نشستم
صد بچە بگاییم و یکی خشت نلرزد

واتا:

ئەڵێن ئەگەر هەتیوێ بگێی عەرش دێتە لەرزین
عەرشێ بەگانێ بلەرزێ چی دێنێ؟
ئێمەین و ژوورێکی کە بێ باک لێی دادەنیشم
صەد هەتیو ئەگێین و خشتێ نالەقێ.

بخرنر برسد شیخ (رضا) میکندش

هر کسرا یافت بزور و برضا میکندش
گر چه درجوف جرم دست دهد مغبچه ء
از خدا شرم ندارد بخدا میکندش

واتا:

شێخ ڕەزا نێرەکەری دەس کەوێ ئەیگێ
تووشی هەر کەسێ بێ، بەزۆر بێ یا بە ڕەزا، ئەیکا لێی
لە ناوەڕاستی حەرەمیشا هەتیوێکی لووسی دەسگیر بێ
شەرمی لە خوا نییە، بە خوا قەسەم، ئەیکا لێی (یا: پێی دائەکەنێ)

گیرم کەسر زلف کند چون جیمی
وقتی که دهان تنگ کندچون میمی
ای کیر هزار عشوه و صد نازکنی
از کس چەکنی مگر بدوزی نیمی

***

بدستم گرفتد مه طلعتی در موقعی خالی
دو پایشرا بگردن در فرازم چون زن والی
هنرمندش نخوانند انکه عالی را کند سافل
هنرمند آن کسی باشد که سافلرا کند عالی

واتا:

ئەگەر جوانێکی ڕوو وەک مانگم دەسکەوێ لەشوێنێکی خاڵی
هەردوو لاقی ئەینێمە سەر شان وەک ژنی والی
هونەرمەند ئەو کەسە نییە شتی بەرز نزم کاتەوە
هونەرمەند کەسێکە نزم بەرزکاتەوە

شنیدم که عرب صدر سینەرا گویند
رسیدم بدیاری که صدرشان پشت است

واتا:

بیستوومە عەرەب بە سنگ ئەڵێن (صدر)
گەیشتمە ولاتێ (صدر)ەکانیان پوشت و حیزن

بـــرای (چـــرخـــی)ای در زیـــر ایـــن چـــرخ
بـــــــان چرخ دائـم مـــــــیـــــــزنم چـرخ

واتا:

لە ژێر ئەم ئاسمانەدا هەمیشە وەک چەرخ
ئەخولێمەوە بۆ (چەرخی)یەک (چەرخی پارەیەکی ئێران بوو)

طـرد کـن ازدر خـــــــــــود ایـن نـاپـاک
(لا تـری الـکـلـب ولا الـکـلـب یـراک)

واتا:

ئەم ناپاکە لەبە دەرگای خۆت دەرکە
نە سەگ ببینە و نە سەگ بتبینێ

غـم ســـــبـق داش ازل درد و ألـم، یـارونـدیم
علـت و زلت، وقـلت رفـــیـــقـــان قـــدیم

واتا:

خەم هاورێی کۆنمە، دەرد و ئازار یارو هاودەممە
هەروا نەخۆشی و زەلیلی و دەسکورتی هاورێی کۆنمن

***

لەسایەی دەهری دون پەروەر ئەمیستە لەک لە لەک ئەدوێ
بە کـۆلێ کلکەوە رێوی لەگـەڵ کـەولی دەڵەک ئەدوێ

***

عـومـەرم دی، عـومـەری پێـشـووتریش گـەر وابێ
گـەردنی شـیـعـە دو صـەد دەفـعـە لەسەب ئازا بێ
رەگی کـێـر ها لە گـونا هەرگـونە ئەیبـزوێنێ
مەسئەلەیێ کۆنە سەگ ئیـسقان بەکلک ئەشکێنێ

ئەمین بۆقە خەڵکی بەرتەکیە و پیاوێکی خراپ بوو بەلاّم عەبدوللا و کوڕی زۆر کوڕی چاک بوو.

سـەیری کـە زبڵ ئەصـڵی گـووە و گـوڵ ئەڕوێنێ
باوکی وەک (ئەمین بۆقـە) کـوڕی وەک عـەبە دێنێ

***

ئـەمـین نـانـەوا و هـەمـین ئـاشـــــــپـــــــەز بێ
یـایـە لـەگـــــەڵـمـــــان وا بـەغـــــــەرەز بێ

***

بەتیـەیی بەصـرەیی یو مـێـزەری هیندیی مـن و تۆ
وەکـو ڕخت و شـەقـەبەندێ کـە لە گا جـووتی بدەی

***

**نانـدان و مێوانداری حاجی حەبیبی قەردار**

بنەماڵەی قەردار لە کەرکووک؛ لە ڕەسەندا لە عەشیرەتی (بڵباس)ی کوردن بەڵام هەر لەسـەردەمی عـوسـمـانیـیـەوە خـۆیان بە تورکـمـان داناوە و لە کـەرکـووک جـێگایەکی کـۆمـەڵایەتیی تایبـەتی و خـاوەن سـامـان بوون. حـاجی حـەبیب یەکـێکە لەو بنەمـاڵـەیە و سامـانێکی زۆری هەبوو. شێخ ڕەزا گاڵتـە بەوە ئەکات کە دەوڵـەمـەندێک وەکـوو حاجی حەبیب لە سێ مانگی زستانا تەنها دەعوەتێک دەکات و لە شیعرێکی تورکیدا ئەڵێت:

مـــوسم قـــیـــشـــده اوچ ایلق بر بریانی
قـیـزاروب عـارض خـوبان گـبی هەر بر یـانی
بویله بریرەء نازک بو گـــبی مـــوســـمـــده
جـــانب اربعـــــەسنده یمگک الوانـی
اولدق بارکـــشی منت انفـــاسی مـــســـیح
صـــانکه ایتـــمش برەیە مـــائدەء ربانی
ایلمـزمی بو گـبی اطعـمـه احـیـای وجـود
بلکه هر بر لقمەسی گوزدن دوشورور لقمانی
خارج حوصله بر دعوت ایدوب حاجی حبیب
نیـــجـه تعـــریف ایدەیم نعـــمت بێ پایانی

واتا:

لە مەوسمی زستاندا لە سێ مانگدا بریانییەک
سوور دەکەنەوە وەکوو لەشی جوانان هەموو لایەکی
گویلکێکی نازکی وا لەم فەصلەدا
لەهەر چوار لایەوە بە خواردەمەنیی ڕەنگاوڕەنگ
بووینە هەڵگرێنت ئەنفاسی مەسیح
وەکوو خوانی ڕەبانی گوێلکێکی لێ دانابێ.
ئەم جۆرە خواردنانە مرۆڤ زیندوو ناکاتەوە؟
بەڵکو هەر لوقمەیەکی لوقمان لەبەر چاو ئەخات
لە حەوصلە بەدەر، حاجی حەبیب دەعوتێکی دا
نیعمەتی بێ پایانی چۆن تاریف بکەم

***

## مەدحی عەبدوڵڵا پاشای ڕەواندز

عەبدوڵڵا پاشای ڕەواندز لە دەوری حوکمی عوسمانیدا قائیمەقامی هەولێر بوو. شێخ ڕەزا لەم شیعرە فارسییەی کە مەدحی دەکات، بە دەمەتەقێیەک لە نێوان شاعیرێکی گەن و پزیشکێک دەس پێ دەکات. لە ئەنجامدا دەڵێت شیعری ناپوختە وەکوو ڕەوانی دەرمانی پزیشکە:

شاعیری گنده طبع همچو جعل
شعر او چون شعور او مختل
رفت پیش حکیم تا دهدش
شربتی از برای دفع علل
مسهلی داد گفت کاین دارد
هفت بارت در آورد بعمل
چون بخورد و چهاربار برید
تاخت پیش حکیم و ساخت جدل
طعنه زد کای حکیم بی تمیز

فــرق ناكـــرده ناقـــه را ز جـــمل

ســخن از هفت و هشت مــيــراندی

هفت اكنون بچـــار شـــد مـــبـــدل

گـــفت البت مـــخـــالفی خـــوردی

كــــه بدارو ازان رســــيـــــده خلل

گـــفت چيـــزی نخـــورده ام لاكن

بودم اندر خـــيـــال شـــعـــر و غـــزل

واتا:

شاعیرێکی تەبیعەت بۆگەن وەک قالۆنچە

شیعری وەک هەست و شعووری شێواوە

چووە لای پزیشک تا شەربەتێکی بداتێ

دەرمانێکی ڕەوانیی دایێ وتی:

حەوت جارت ڕەوان دەکا

کە خواردی چوار جار ڕیا

ڕای کردەوە بۆ لای پزیشکەکە و کردی بە هەرا

تانەی لێ دا؛ وتی: ئەی پزیشکی نەفام

کە وشتری مێ لە وشتری نێرە ناکەیتەوە

قسەی حەوت و هەشتت نەکرد

ئێستا حەوتەکەت بوو بە چوار

وتی هەڵبەت شتێکی خراپت خواردووە

دەرمانەکە لەو شتە خراپەوە زیانێکی تووش بووە

وتی؛ هیچم نەخواردووە بەڵام

لەخەیاڵی دانانی شیعر و غەزەلیات بووم

گـــفت از شـــعـــر ســاخـــتی چيـــزی

گـفت آری ســه شـعـر مـســتـعـجل

گــفت برخـــوان چو شـــعـرها برخـــواند

گـــفت خندان حكيـم كـــای اجـــهل

تو عـــمل هفت كــرده‌ء امــا

ســـەر زبالا چهـــار از اســـفل

شـــاعـــرى چند هست مى زبند

كـــادرى اين حـــديشـــان بمثل

نيك و بدرا ز غـــرفـــه‌ء شـــعـــرا

نشناســـد بغـــيـــر مـــيـــر اجل

انكه قـــائمـــقـــام اربيل است

مـــاه ملك است وآفـــتـــاب ملل

دم تيـــغش لهـــيب نار جـــحـــيم

كف جـودش ســحــاب كـشت امـل

با منش لطف گـــربود چه عـــجب

رغـــبت است آفـــتـــابرا بحـــمل

وصف او در ســـخن نمى گنجـــد

بەكـــه وصـــفش ادا كنم بجـــمل

تـــا ابـــد انجـــنـــابـــرا يـــارب

دســـــتگيـــــرى كند لطف ازل

واتا:

وتى: هيچ شيعرێكت داناوه

وتى: بەڵێ، سێ شيعرى بەپەلە

وتى: بيانخوێنەوه، كه خوێنديانيانييەوه

بەپێكەنينەوه وتى: هەى لەهەمووكەس نەزانتر

تۆ هەر حەوت جارەكە ڕەوان بووى، بەڵام

سيانيان لەسەرەوه و چواريان لەخوارەوه

چەند شاعيرێ هەن بۆ ئەوه ئەشێن

ئەم باسەيان بە نموونه بۆ بهێنيتەوه

چاك و خراپى دەستەى شاعيران

ناناسێتەوه مەگەر ميرى بالا

ئەوەی کە قائیمەقامی هەولێرە
مانگی موڵکە و خۆری میللەتە
دەمی تیغی گڕی ئاگری دۆزەخە
دەستی بەخشنشی هەوری چاندنی هیوایە
ئەگەر لوتتفی لەگەڵ من هەبێ سەیر نییە
خۆر حەزی لە بورجی (حەمەل) هەیە
بە قسە وەصفی ئەو ناکرێ و تێدا جێی نابێتەوە
باشتر وایە بە کورتی وەسفی بکەم
خوایە هەمیشە دەستی جەنابی ئەو
بگرە لە لوتفی ئەزەلی خۆت

***

## هەجوی قاضیی کەرکووک

زۆربەی کاربەدەستان، لەدەوری داگیرکەرانی عوسمانیدا، تورک بوون، قاضیی کەرکووک لە میللەتی (لاز) ئەبێت کە لە بناری قافقاس جێگیرن و هەندێکیشیان وان لەسنووری تورکیا، بەڵام شێخ ڕەزا بە (ئەرنائووت)ی ئەزانێت. لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت:

گوردک می؟ کیمی؟ نائبی گوردم. نیجە برذات؟
اوصافی نەدر، شکلی نەدر؟ بزە اکلات
ایتمش می تأهل، حرمی وارمی؟ وار أما
آرایش آغوش حریفان خرابات
بزدە بیلورز اول جهتی، حوکمی ناصلدر؟
حکم قرەقوش یعنی، بلا شاهد واثبات
ادراکی نە اندازەیە، بر جاهل ابتر
نە شرعی بیلور (ارناؤوط) اوغلی نە نظامات

واتا:

دیت؟ کێ؟ نائیبم دی. چۆن پیاوێکە؟
ئەوسافی چییە، دیمەنی چۆنە؟ تێمان گەیێنە

ژنی هێناوه، حەرەمی هەیە؟ هەیە بەڵام،
لەوانەیە کە ئەگەڕێت بۆ هاوڕێی مەیخانە
ئێمەیش ئەمە ئەزانین، حوکمی چۆنە؟
حوکمی قەرەقۆش، یانی، بەبێ شایەد و ئیسپات
تێگەیشتنی لە چ ئەندازەدایە؟، نەزانێکی کلک بڕاو
نە شەرع ئەزانێت ئەم (ئەرنائووت) باوکە، نە نیزام

ئەندامی صـاری، گـوزلری گـوک چهـرەسی ابرش
شـوم اولدیغنی اورتەیە قـویمش بو عـلامـات
یاشی نەقـدر؟ اللی دن اکـسک، نیـجـه بیلدن؟
باقـدم دیشـنە، دقت ایلە حین مـلاقـات
عـزل اولدی؟ اوەت، واسـیطەء عـزلی کـیم اولدی
انفـاس مـسـیـحـانەء اصـحـاب کـرامـات
سـیـاح اولەرق مملکت رومی گـیـزردم
قـاضی ا و زمـان امـرد ایدی گـوزلری آفـات
ثعلب صـاتەرق گـیـچـدی تصـادف یناشـمـدن
ایتـدی بکا برگـوشـەء چشم ایلە مـبـالات
اسلوب حکیـمـانە ایلە بندە گـوز ایتـدم
خـیلی ارامـزدە جـریان ایتـدی اشـارات

واتا:

ئەندامی زەرد، چاوی شین، ڕووی ئەبرەش
ئەم نیشانانە ئەوە دەگەیێنێت کە شوومە
تەمەنی چەندە؟ لە پەنجا کەمتر. چۆنت زانی؟
کە تووشی بووم بە وردی سەیری دانەکانیم کرد
عەزل کرا؟ بەڵێ. کێ بووە هۆی عەزلی؟
ئەنفاسی مەسیحانەی خاوەن کەرامات
لە وڵاتی ڕۆمدا کە بە سیاحەت دەگەڕام
قازی لەو کاتەدا مووی لێ نەهاتبوو و چاوی عەییار

(ثعلب)ی دەفرۆشت، بە تەصادف لەلامەوە تێپەڕی
بە سووچی چاو خۆی لە قەرەم دا
منیش بە جۆرێکی حەکیمانە چاوێکم لێ هەڵتەکان
گەلێک نیشارات لە نێوانماندا ڕووی دا

ابخـــامی دیدم اول برینی قـــاچه صـــاتارسن؟
بازار ایدەرک چقـــدی ایلی لیـــرەیه فـــئـــات
ویردم پارەیی نزد فـــقـــیـــرانەمـــه گلدی
بیـــچـــاره چابوق اوقـــچـــورینی چزدی دیدم یات
مـعـهـودی دیامـاقله فـغـانی گـوگـه چیـقـدی
حـتی ایشـیـدوب صـیـحـەسنی اهل سـمـاوات
بالواردی، امـــان یاگـــری ال پارەئی یاخـــود
توکـــرەکله انک بر ازەجک باشنی ایصـــلات
ســـــوردم آتمی دیـکـلەمـــــدم آه و انینی
(لیـــلای) آلان قـــاضی یه بســـدر بومکافـــات

واتا:

لە ئەنجامدا وتم ئەویتریان بە چەند ئەفرۆشی؟
هەڕاجی کرد و نرخی گەیشتە دوو لیرە.
پارەکە مداو هاتینە کۆلیتی هەژاریم
بێچارە بە پەلە بەنەخوێنی داماڵی و وتم پاڵ کەوە
لەبەرگە گرتنی ئەوەدا هاواری چووە ئاسمان
تا وەکو خەلقی سەماوات هاواریان بیست
پاڕایەوە، توخوا یان پارەکەت وەرگرەوە یان،
سەرەکەی ئەرم کە بە تف تەڕی کە
ئەسپم لێ خوڕی گوێم نەدایە آهو و نووزەی
ئەو قازییە کە (لەیلانی) برد ئەم بەخششە بەسیەتی.

لەپاش ئەم هەمـوو قـسـه پیـسـانە، جـەنابی قـازی وتوویەتی: شـێخ ڕەزا منی بە (ئەڕنائوت) زانیـوە، بەڵام من (لاز)م. ئەمـجـا شێخ ڕەزا لە شـیـعـرێکی تری تورکـیـدا

ئەڵێت:

نائبی بن (ارناؤوط) صـــاندم مگرســه لاز ایمش
ایتــدیگم هجــویەلر (لاز) اولدیغــیــچــون از ایمش
شکـلی بـنزەر لازە ئـەما ارمـنیـــــدن بـو زمـــــدر
الـغـــــــــــــرز، لاز یـا ایـواز یـا پـاپـاز ایمـش

واتا:

قازی کە من بە ئەرنائوتم دەزانی کەچی (لاز) بووە.
لەبەرئەوە ی لاز بووە ئەم هەموو هەجوانەم کەم بووە
شێوەی لەلاز ئەچێت، بەڵام لە ئەرمەنی چاککراوە
بە کورتی دەبێت یا لاز یا نیواز یا پاپاز بێت*

* نیواز: بە پیاوی ئایینی ئەرثودوکسی بولغارستان دەڵێن و پاپاز: بە قەشەی ئەرمەنی دەڵێن.

***

## هەجوی حوسنی پاشای فەرماندەی سوپای عوسمانی لەکەرکووک

حوسنی پاشا فەرماندەیەکی بەدڕەوشت و بەدخوو بووە و زۆر ئازاری دانیشتوانی شاری کەرکووکی داوە. شێخ ڕەزا بەم شیعرە هەجوی ئەکا:

بەســەگم وت عــەجــەبا خـزمــتــە حــوسنی پاشـا ؟
تووڕە بوو، کلکی لەقـاند و وتی: حــاشــا حــاشــا
ڕاســتی گــەرچی ســەگـیــشم بە خــودا خــۆم دەکـوژم
ناوی مـن بێنی لەگــەڵ ئیــســمی خــەبیــسی پاشـا

***

## لەشیعرە هەڵماڵراوەکانی شێخ ڕەزا

وەکوو زانراوە، شێخ ڕەزا، یەکێک لەو دەرگای شیعرانەی کە لێی داوە، دەرگای شیعری هەڵمـاڵراوە و دەسـتێکی باڵای تێدا هەیە. شێخ ڕەزا خۆی لە شـیـعرێکی فارسـیدا کـە مەدحی ناظم پاشا ئەکات ئەڵێت:

عــشق باســادە روخــان ازپی ســمت است و ســرین

نـه رخ و زلـف خـم انـدرخـم و چـین درچـین اسـت

آن دروخـسـت کـه من شـیـفـتـه، خـال و خطم

شـیّخ راهم غـرض از سـاده پرسـتی این است

واتا:

عشق لەگەڵ سادە رووان بۆ پووز و کەفەڵە

نەک بۆ ڕوو و زولفی لوول و چین لەسەر چینە

ئەوە درۆیە کە ئەڵێ من شێت و شەیدای خەت و خاڵم

شێخیش هەر ئەم مەبەستەی هەیە لە سادە پەرستی

فەرموون لەگەڵ ئەم چەند شیعرە هەڵماڵراوانەی:

لە شیعرێکی کوردیدا ئەڵێت:

کـێر کـه هەسـتـا، نـه لە بێگانە دەپرسێ و نە لە خـوێش

گورزی خۆی هەر دەوەشێنێ، چە لە پاش و چە لە پێش

هەمـە کـێـرێکی قـەوی، هێند بە کـونی تەنگا چوو

سەر و چاوی هەمـوو زامـدار، پەراسـووی هەمـوو ڕێش

تا ملی غـەرقـە لە چەرمـا، وەکـو سـیـواکی مـەلا

پرچی ئەفـشـانە لەسـەر پشـتی ملی وەک دەروێش

پاڵەوانێکی قـەوی و قـۆڵە لە مـیـل بازیشـدا

مـەحکەمـە ڕیشـە و بنجی وەکـو شـاخی گـامـێش

لەشیعرێکی تری کوردیدا دەڵێت:

هەر وەکو ئەشکم بە ڕەنگی سووری خۆی خوێنینە کوز

داسـتـانی شـاهنامـەی خـوسـرەو و شـیـرینە کـوز

ئینشـیـقـاقی هەر وەکـو کـاڵەک لەبەر شـیـرینیـیـە

هەر کـەسێ نەیچـەشـتـبێ نازانێ چەن شـیـرینە کـوز

***

## واقه واقی دڵ

هەر واقــه واقی دڵــمــه به دەســـتی فـــیـــراقـــەوە
وەک ڕێوی کـــه هەردوو گـــونی ببێ بەفـــاقـــەوە
ئیـــمـــان له تەوقی ســەرمــەوە وەک واشــه دەرپەڕی
ســـمـــتی کـــه دەرپەڕاند و ســـەری نا به تاقـــەوە
مـــوطرب له عــەشــقی عــیـــراقی به حــەســرەتم
بۆم هەســـتـــه ورده ورده له پەردەی (عـــیـــراقـــەوە)

***

بەسەر بۆ دەفعی ئەعدا چاوەکەم قەڵغانی سیمینت
هەزار مارتین به قوربانی تفەنگی لوولە چەرمینت

***

کێر ئەگەر مەیلی کونی کرد سەرەکەی بگرە لەمشت
همه جا خانهء عشق است، چەمسجد، چەکنشت

***

مـوددەتێ نێر بازی و ئێستا کە مەیلی مێ ئەکەم
ئارەزووی گانی کچێکی کوز پڕی دەرپێ ئەکەم

***

ئەم قـــەحـــپـــه فـــەلەک له داخی مـــردم
مـــوحـــتـــاجی ڕەشی ڕەشـــیـــدی کـــردم

***

گەلێ سمتی سپیم دەس کەوت نەمتوانی پیاکێشم
درێغ بۆ مەتراقی کێرەکەی چەند ساڵ لەمەوپێشم

***

هێندە به تەعریف و کینایەت له بنی سینگت بەم
بەگ ئەفەندی به سەراحەت له کونی قنگت بەم

... ئەفەندی خەلقی بەسرە دەبێت و لە کەرکووک مەئمووری حکومەت بوو. هەندێ قسەی ناشرینیان نایە ژنەکەیەوە و لەبەرئەوە گەڕایەوە بۆ بەسرە و شێخ ڕەزا دەڵێت:

لێرە گایان ژنەکەی... ئەفەندی بەسرە

ایستە بۆ (بەصرە) دەچێ (بعد خراب البصرە)

هێند گەووادە گەر ئەولادی لەپێش چاوی بگێی

ڕیشی ڕادەگرێ کەها کێر و گونی پێ بسڕە

عەینی بەغدایە بە خۆی چونکە لەبەر ئاوی مەنی

مەقعەدی بەحرە، گونی قایغە، کێری جسرە

بە موتەسەریفی کەرکووک ئەڵێت:

موتەلەووین میزاجی گوونا گون

موتەسەڕیف کە دیدە بۆ قەلەموون

موتەسەڕیف جیگەرەکەی لە دەما

دێ و دەچێ وەک مریشکی چیلکە بە قوون

***

**ماینە کوێت**

کوردستان بریتییە لە چیا و هەردە و دەشت. کورد هەر لە کۆنەوە، بۆ هاتوچۆ و گوێزانەوەی دەغڵ و دان و کووتاڵ بەرزە وڵاغی بەکار هێناوە. بەرزە وڵاغ بریتییە لە ماین و هێستر. هێستر لە چیاکان و ماین لە هەردە و دەشتدا. ماین بە پێی ڕەسەن و ڕەنگ ناو دەبرێت. ئەوەی بۆ سواری بێت لە ڕەسەندا لە ماینی عەرەبە و ئەوەی بۆ بار هەڵگرتن بێت پێی دەڵێن (بەرگیر). ناوی ماین بە پێی ڕەنگ؛ ڕەش، کوێت، شێ و بۆرە... هتد.

شێخ ڕەزا لەم شیعرەدا باسی ماینە کوێتی خۆی ئەکات و ئەڵێت:

ماینە کوێت جاران دەتوت ڕەوتی ڕەوتی ئاهووە

ئێستە هەستانی لەسەر ئاخوڕ بە یاهوو یاهووە

قەت لە یەک قسناغ کەمی جۆ نادەمێ هێشتا لەڕە

ساڵ دوانزە مانگ سواری نابم هەر ماندووە

عومقی چاڵی مەقعەدی بێ شک مەسافەی قەسر ئەبێ
درزی دەروازەی کـــوزی لۆچ لۆچ بەســەر یەکـدا چووە
گـەر بە ئاوزەنگی پەراســووی ئەم ســەروســەر هەڵدڕم
هێـنـدە نابزوێ بزانم مـــــاوە یاخـــــو مــــردووە
خـاوەنی پێـــشـــووشی نازانێ کـە تەئریخ و سـەنەی
چەندە ئەمما من لە پیـــرانی قـــەدیم بیــســـتـــووە
وەختێ نادر شا هجوومی کـردە سـەر ئیـقلیـمی ڕۆم
تازە، گـۆیا، ئەو لە کـوز دایکی خـرووجی کـردووە

***

## هەواڵ پرسینێک

ناسیاوێکی شێخ ڕەزا دەستی دەشکێت و بەم شیعرە فارسییە هەواڵی ئەپرسێت:

شـکـســــتـــــه باد دو دست فلک ازین کـــردار
برید باد دوپای ســـپـــهـــر ازین رفـــتـــار
دلاوری کـــــــه دری آهـیـن زجـــــا کـنـدی
ببـــازوان قـــوی هـمـــچـــو حـــیـــدر کـــرار
بچـشم زخم حـســودان شکســتــه شـد دسـتش
بلی زمـــانه عـــجب روبهی است شــیـــر شکار
ولی تو هیچ مــخـور غم شکســتــه بســتــه شـود
بشـاهراه حــقــیــقت شکســتــه کـیــست بکار

واتا:

یاخوا هەردوو دەستی چەرخی گەردوون بشکێ کە ئەم کارەی کرد
هەردوو پێی ئاسمان ببڕێنەوە کە ئەم ڕەفتارەی کرد
قارەمانی کە دەرگای ئاسنین لە شوێنی خۆی هەڵئەکەند
بە بازووە بەهێزەکانی وەک حەزرەتی عەلی
بە چاوی پیسی حەسوودان دەستی شکا
بەڵێ، زەمانە ڕێوییەکی سەیرە کە ئەتوانێ ڕاوی شێر بکا

بەڵام تۆ هیچ خەفەت مەخۆ، شکستە نەگێڕێتەوە
لە شارێی ڕاستیدا شکان کەڵکی هەیە

براه عـــشق کــه از مـــا و من پیــــر هیــــزند
زپـای دست بـشـــــــوی و زدسـت دسـت بـدار
نه آخـر آن فلک است، این فلک کـه روز (أحــد)
شکـست گـــوهر دندان (احـــمــد مـــختـــار)
نه آخـر آن فلک است این فلک کـه روز (صـفین)
خــــراپ کـــرد جـــهـــانرا بشکتن عـــمـــار

واتا:

لە ڕێی عیشقدا کە لە من و ئێمە ڕێز نەگرن
دەست لە پێ داشۆرە و دەس لە دەست هەڵگرە
ئەم گەردوونە هەر هەمان گەردوون نییە کە لە ڕۆژی (ئوحود)دا
گەوهەری ددانی پێغەمبەری شکاند؟!
ئەم گەردوونە هەر ئەو گەردوونە نییە کە لە ڕۆژی (سەففین)دا
بە کوشتنی (عمار کوڕی یاسر) دونیای وێران کرد؟

***

## دۆستایەتیی شێخ ڕەزا و ئەمین فەیزی

زۆر ئاشکەرایە، لە ژیانی شێخ ڕەزادا، کەس ئەوەندەی ئەمین فەیزی خۆشەویست و جێ ڕێز نەبووە. شێخ ڕەزا خۆی لە بابەت پێوەندیی لەگەڵ ئەمین فەیزییا دەڵێت:

نـــــبـت من بـا أمین فـــــیـــــضـی ازلی است
همـــچـــو سنی بعـــمـــر، نەچو روافض بعلی است

واتا:

پێوەندیی من و ئەمین فەیزی هەر لە ڕۆژی ئەزەلەوەیە
وەک هیی سوننییانە لەگەڵ عومەر، نەک وەک هیی ڕافزییان لەگەڵ عەلی.

هەروا دەڵێت:

در حـــضـــر ممتـــاز و ممتـــاز از ســـفـــر آمـــدی

اول و آخـــر (امین فـــیـــضی) تو ممتـــاز آمـــدی

واتا:

تۆ لە ماڵا هەڵاوێردەی و، بە هەڵاوێردەییش لەسەفەر گەڕایتەوە

لەسەرەتا و لە دواییدا، ئەمین فەیزی، تۆ بە هەڵاوێردەیی هاتووی

لە لایەکی تریش لە شیعرێکی تورکیدا باسی خۆش گوفتاری و ڕەوشت جوانی دەکات و دەڵێت:

اســـتـــاذ ســـخن، مـــیـــر ســـخن سک

خـــلاق مـــعـــالی دینلان وارایســـه سن سک

ای کـــان کـــمـــالات (امین فـــیـــضی) افندی

مـجـمـوعـهء خلق (حـسـن)، خلق (حـسین) سک

واتا:

مامۆستای قسە و میری قسە تۆی

ئەگەر دروست کەری مەعانی هەبی وەکوو دەڵێن تۆی

ئەی کانی کەماڵ ئاغای ئەمین فەیزی

دەستەیی ڕەوشتی (حەسەن) و ڕەوشتی (حوسێن) تۆی.

ئەمین فـیـضی بەگ لە ساڵی ١٨٦٠ لە شاری سولەیمانی هاتووەتە دونیـاوە. لە پاش تەواوکردنی قوتابخانەکانی ئەوێ، چووەتە شاری بەغدا و لەوێ لە قوتابخانەی سەربازی دەرچووە و چووەتە ئەستەمـوڵ لە کـۆلیـجی سەربازی خوێندویەتی و بە روتبەی مـولازم دەرچووە و لە سوپای عوسمانیدا گەیشتووەتە روتبەی میر ئالای تۆپچی و لەم روتبەیەدا خانەنشین کراوە.

ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە شام و حەلەب رابواردووە و لە پاشا گەڕاوەتەوە ئەستەموڵ، و لە پاش نەخۆشییێکی دوور و درێژ لە ساڵی ١٩٢٨ لە ئەستەموڵ کۆچی دوایی کردووە.

ئەمین فەیضی بەگ سەرەڕای شارەزایی زۆر لە زانستی ریازیات، ئەدیب و شاعیر بوو، یەکەم دیوانی بە تورکیبە ناوی (شعاعات) لە چاپ داوە. لە زانستی ریازیاتدا کتێبی (ئیجمالی نەتایج)ی لە چاپ داوە و لە زانستی فیزیک کتێبی (هەوای نەسیمی) بڵاوکردووەتەوەو لە زانستی (جبر) کتێبی (تەفرەقەی ریاضیـه) چاپ کراوە. ئەمین

فەیضی ئەندامی لیژنەی زانستی ئەکادیمیای پاریس بووە. زۆریش دروست و جێ ڕێزی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بوو و لە کتێبی (ئەنجومەنی ئەدەبیانی کورد) گەلێک لە شیعرەکانی شێخ ڕەزای تێدا بلاوکردووەتەوە.

***

شێخ ڕەزا لەم شیعرانەی خوارەوەدا غەمباریی خۆی، لەبەر دووریی ئەمین فەیضی دەردەبڕێت و سکاڵای تەندروستی و تەمەن درێژی بۆ دەکات

انچنانم زهجر کاکه أمین
کندانم یسار را ز یمین
آن کند بخت قط نبینم یار
تازنم خنده بر زمان و زمین
چند ریزم بیاد روی تو اشک
چند باشم ز دوریت غمگین
تا غمیرا بحیله چاره کنم
دیگری سر بر آورد ز کمین
مستم از جام بادهء فیضت
چو مسیحا ز روح فیض أمین
سالهای دراز باقی باد
بسلامت امین ما آمین

واتا:

لەبەر دووریی کاکە ئەمین فەیزی لە حاڵێکام
ڕاست و چەپ لێک جوێ ناکەمەوە
بەخت هەر ئەوەندەم بۆ بکا دۆست ببینم
تا (لە بەختەوەریی خۆما) بە عەرز و عاسمان پێبکەنم
چەند لە یادی ڕووی تۆدا فرمێسک بڕێژم
چەند لە دووریی تۆ خەفەتبار بم

تا بە فرۆفێڵ چاری خەمێ نەکەم
خەمێکی تر لە پەناگاوە سەردەردێنێ
لە جامی بادەی بەرەکەتی لێشاو کردووی تۆ مەستم
وەک مەسیح لە (روح الامین)ی پڕ بەرەکەت کە جوبرەئیلە
خوا بکا ئەمینی ئێمە بە سەلامەتی بژێنێ
ساڵەهایەکی دوور و درێژ. ئامین

ئەمین فیضی چەند نامەیەکی هۆنراوەی جوانی بۆ شێخ ڕەزا ناردووە، ئەم شیعرانەی ئەمین فەیضی، بە شێوەیەکی زۆر نازک و دڵسۆزانەن. لە وەڵامەکانی شێخ ڕەزا دەردەکەوێت، کە چەند پیاوێکی خۆش مەشرەب و ڕەوشت بەرز بووە. لەبەرئەوە شێخ ڕەزا، نەوەک تەنها هیچ هەجوێکی بەرامبەر ئەو نەوتووە، بەڵکو بە ئەوپەری ڕێز و دلسۆزی ئەم دۆستایەتییەی لەگەڵیدا بردووەتە سەر. لە وەڵامی یەکێک لەو نامە هۆنراوانە، شێخ ڕەزا ئەمە دەڵێت:

مشربت خوب و لهجه شیرین است
دهنت درج گوهر آگین است
فکر بکر تو بینی بین الله
نغز دوشیزهء نگارین است
عرش بلقیس و فرش براقش
در حقیقت کمینه کابین است
این نه شعر است، رشتهء شهرت
این نه‌نظم است عقد پروین است

واتا:

ڕەوشتت باش و زمانت شیرینە
دەمت قوتووی پڕ لەگەوهەرە
فیکری بە خەیاڵی کەسا نەهاتووی تۆ، بەینی بەینەڵلا
کچێکی جوانی ڕەنگینە
عەرشی بەلقیس و فەرشە بریقەدارەکەی
لە ڕاستیدا کەمترین مارەییە (بۆ ئەو کچە)

ئەمەی تۆ شیعر نییە، هۆنراوەی ناو و بانگە
ئەمە هۆنراوە نییە، ملوانکەی ئەستێرەی سورەییایە

مـــصــــرعی از قـــریحـــــهء عـطار
کـــــه عـــــجب آبدارو رەنگین است
گــر بتـــضــمین بیـــاورم چه عـــجب
یکـی از فـن شـــعـــــر تضـــمین آست
بمعـــــانی گـــــران، بـنظم ســـبک
گـــــر بـود ســــــهل ممتنع، ایـن اسـت
تـا بـضــــــرب المثـل همی گـــــویند
کـــــه دعـــــــا أز بـرای آمـین اسـت

واتا:

نیو بەیتی بەرهەمی شیعری فەرەیدوددینی عەتتا
کە زۆر ئاودار و ڕەنگینە
ئەگەر بیخەمە ناو شیعری خۆم سەیر نییە
چونکە یەکێ لە هونەرەکانی شیعر ئەوەتە شیعری کەسێکی تری بخەیتە ناو
بە واتا گران و بە سەنگ سووکە
ئەگەر (ئاسانی کەس پێ نەوێراو) هەبێ ئەوەیە
ئەوەتا مەسەلە دێننەوە و ئەڵێن
دوعا لەبەر خاتری ئامینەکەیەتی

خـــاطرت شـــاد باد (آمین فـــیـــضی)
زان کــــــــه دریـای دانـش و دیـن اسـت
دوشــــمنت خـــاکـــســـــار و زیر و زبر
زان کـــه در خـــورد و لعن نفـــرین است
فـــــضلرا داند از خــــدای (رضــــا)
نه از آن شـــــاعــــران خــــود بین است

واتا:

دڵت هەر شاد بێ ئەمین فەیزی!

چونکە دڵت دەریای زانست و ئایینە
دوژمنت لە خۆڵا بگەوزێ و سەرەو ژێر بێ
چونکە شایانی ئەوەیە لەعنەتی لێ بکرێ
ڕەزا هەموو گەورەییێ لەخوداوە ئەزانێ
لەو شاعیرە خۆپەرستانە نییە.

لە وەڵامی نامەیەکی ئەمین فەیضی دۆستی، شێخ ڕەزا ئەم شیعرە فارسییەی بۆ دەنێرێت.

ز رشحهء قلمت در مشیمهء قرطاس
نتیجه هاست بقیمت گرانتر از الماس
رسیده کار بجای ترا امین فیضی
که جبرئیل امین خوانمت ز روی قیاس
صحیفه معجزه پیراست بسکه چون مریم
ببر گرفته موالید عیسوی انفاس
هزار سال بمانی و این عجب نبود
شرافتت به مثل خضر زینده و الیاس
در این دیار (رضا) را بهرزه عمر گزشت
بجان رسیده گناهش بگردن افلاس

واتا:
لە نووکی قەڵەمتەوە لەناو منداڵدانی کاغەزا
ئەنجامی وا زۆر هەیە بە نرخ لە ئەڵماس گرانترن
کار گەیشتووەتە ڕادەیەک ئەمین فەیزی
بەقیاس بە جوبرەئیلی ئەمینت ئەخوێنمەوە
تەنها موعجیزەی پیر کاغەزە، کە منالی بە هەناسەی عیسا
لە دایکبووی زۆری گرتووە بە بەرسنگیەوە وەک مریەم کە عیسای بە موعجیزە بوو
یاخوا هەزار ساڵ بمێنی و ئەمە سەیر نییە
چونکە شەرەف و گەورەیی تۆ وەک هینی خدری زیندە و ئیلیاسە
عومری (ڕەزا) لەم وڵاتەدا بە هیچ و پووچ بەسەرچوو

ئەوەتا کردوونە گیانەلا، گوناهی بەگەردنی بێ پوولییە

لە وەڵامی نامـەیەکی تریدا، شـێخ ڕەزا، دووبارە ئەو پەڕی ڕێزی بەرامبـەری دەردەخات کە دەڵێت:

الا ای هـنـرمـنـد یـار قـــــــــدیـمی
تـوی خـــــــروانـرا ســـــزای نـدیـمی
ز حکـمت بپـــــرداخــــتی نامــــەء ت و
بـدادی درآن نـامــــــەداد حکـیــــــمی
هوای نسـیــمی از ان گــشـتــە نامش
کـــە جـــان پروراند هوای نســیــمی
بدانـش تـرا هیچ همـــتـــا ندیـدم
مـگـر جـــوهر فـــرد و در یـتـــیـــمی
تـو خـــواهی ســـفـــر از یمن دورتـر کن
امین فــیـضـیـا در دل من مــقـیــمی

واتا:

ئەی یاری هونەرمەندی دێرینە
تۆی شایانی هاودەمیی پادشایانی
لەوێڵ و کەماڵی خۆتەوە نامەکەی خۆت ڕازاندەوە
جارێ خاوەن حیکمەتیی خۆتت لەو نامەیەتدا دا
بۆیە ناوی نراوە (هوای نسیمی)
چونکە هەوای شنەبای بەیانیان (هوای نسیمی) گیان پەروەردە ئەکا
لە زاناییدا کەسم بە هاوتای تۆ نەدی
مەگەر تۆ جەوهەری فەرد و دوڕڕی یەتیم (تاقانە گەوهەر)
حەزت لێیە سەفەر بۆ لە یەمەن بەولاوەیش بکە
ئەمین فەیزی تۆ لە هەر کوێ بی، لە دڵی منا جێت گرتووە

کە داوا لە شێخ ڕەزا دەکرێت بچێت بۆ بەغدا و ببێتە شێخی تەکیەی تاڵەبانی، ئەم ئەرکە لەگەڵ بیری کراوەی شێخ ڕەزادا نەدەگونجا. ناتوانێت، وەکو شێخانی تەریقەت ئیدعای "کەرامەت" بکات. ئامادەیە بچێتە بەغدا، بەڵام بەم مەرجە:

مـشـربم مـشـرب امين فـيـضی است
هـر دوو از هـرد و عـالـم ئـازاده
ای (رضـا) تـا بمرگ رنـدی کـن
ایـن بـود دولـت خـدا داده

واتا:

ڕەوشتی من ڕووشی ئەمین فەیزییە
هەردووک لە هەردوو دونیا ئازادین و کارمان پێ نییە
(ڕەزا)، تا ڕۆژی مردن هەر بێ موبالات بە و گوێ بەهیچ مەدە
دەوڵەتی خووا دادە ئەمەیە

کە باسی یەکیەتی بیر و باوەڕی خۆی و ئەمین فەیضی دەکات دەڵێت:

ز اربـاب دانـش امـین فـیـضـی یـا
ترا امـتـیـازیست کـز فن ضـیـارا
نـشـانـهـا ست بـر اتحـاد من تـو
زیـک مـایه گـویی سـرشـتند مـارا
زیـاد و کـم از نـام نـامـیـت نـبـود
برسم جـمل گـر شـمـاری (رضـا) را

واتا:

ئەی ئەمین فەیزی، تۆ هەڵاوێردەییەکت لە زانایانی تر هەیە وەک
زۆر نیشانە بۆ یەکێتیی من و تۆ هەیە
وەک بڵێی من و تۆیان لەیەک مایە دروست کردبێ
ئەگەر ناوی (رضا) بە حەرفی ئەبجەد بژمێری
زیاد و کەمی لەناوی ناوداری تۆ نابێ

چونکە ژمارەی ناوی هەردوویان بە پێی (ابجدی) (١٠٠١)ە.

ئەگەر ئەمین فەیضی بچێتە میوانیی شێخ ڕەزا، چۆن چاکەی بداتەوە؟

کـە تەشـریفی شـەریفی هات (ئـەمین فـەیضی) بـە مـیـوانی
لە عـوهدەی شـوکـری دەرناچم مـەگـەر خـۆم کـەم بـە قـوربـانی

***

# کۆچی دوایی شێخ ڕەزا

هەندێ لە نووسەرەکان ساڵی کۆچی دوایی شێخ ڕەزای تاڵەبانییان بە ١٩٠٩ میلادی داناوە. بەڵام بەڕێزان د. کەمال مەزهەر و حەمە بۆر و ئەحمەد تاقانە، لەسەر ئەوەی کە لە کێلە قەبرەکە نوسراوە، بە شەوی هەینی مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی دایانناوە. مامۆستای بەڕێز د. کەمال، لە ژمارەی یەکی گۆڤاری کۆڕی زانیاری ساڵی ١٩٧٣ دەڵێت ئەمە بەرامبەری ١٩١٠ میلادییە و بەپێی بۆچوونی محەمەد ئەمین زەکی بەگ کە لە کتێبی (ناودارانی کورد)دا دەڵێت؛ ڕۆژی مردنی بە یەکەم ڕۆژی مانگی موحەڕەم داناوە کە بەرامبەر ئێوارەی پێنج شەمەی ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٩٠. بەڵام مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمار لە ڕۆژنامەی (الرقیب) کە عبدوللەتیف ثنەییان لە بەغدا بە زوبانی عەرەبی دەری دەهێنا، وای بینیوە کە لە ژمارەی ٨٢ کە لە ٩ موحەڕەمی ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی بڵاوکراوەتەوە وا دەڵێ:

«لقد اسفنا كل الاسف، لما بلغنا من مرض جناب الفاضل الاديب الذي سارت يذكر فضائله ورصانة اشعاره الركبان، الشيخ رضا افندي الطالباني، مرضاً اصاب رجليه فاقعده وآلمه، فنسأل الله له من صميم القلب سرعة الشفاء».

بەڵام لە ژمارەی ٨٣ لە ١٠ی موحەڕەم ١٣٢٨ کۆچیدا دەڵێت:

«لقد استأثرت رحمه الله بالفاضل والشاعر اللبيب، الذي كان يعد وجوده فلتة من فلتات الزمن الذي عقمت عن مثله الايام منذ زمن، الشيخ رضا افندي الطالباني، عصر الخميس عند قول المؤذن "الله اكبر" توفاه الله عن عمر ناهز السبعين قضاه في التحصيل والادب. اما نظمه في اللغات الاربع عربية وتركية وفارسية وكردية، فهو الذي قد سارت به الركبان وتناقلته الألسن لسلامته ورقته، حتى اني اذكر اعتراضي عليه رحمه الله في عدم تدوينه اياه، فاجاب بالواقع بان (ديوانه صدور الرجال لا بطون الدفاتر) وقد احتفل العموم احتفالاً يليق بنعش الفقيه، وواروه جدثه في مقبرة الشيخ عبدالقادر الكيلاني قدس سره، واقيمت له تعزية حافلة في زاويته (تكيه) الواقعة في الميدان. فنسأل الله له العفو والمغفرة والرضوان، ولحضرة كل من اخوانه وانجاله وعائلته الصبر لينالوا الأجر».

کەوابوو شێخ ڕەزا لە ٩ موحەڕەمی ١٣٢٨ کۆچی کە بەرامبەری ٢١ کانونی دووەمی ١٩١٠ی میلادی دەکا کۆچی دوایی کرد و ئەو بولبولە خۆش ئاوازە بێ دەنگ بوو.

## دوا قۆناغی شێخ ڕەزا

شێخ ڕەزا لە ڕۆژی هەینی ١٠ موحەڕەم ١٣٢٨ھ کە دەکاتە ٢١ کانونی دووەمی ١٩١٠م، لە گۆڕستانی شێخ عبدولقادری گەیلانی، بە هاتنی جەماوەرێکی زۆر، بە خاک سپێررا و لە تەکیەی تاڵەبانی لە گەڕەکی (مەیدان) ماتەمینی بۆ دانرا و لەسەر کێلە قەبرەکەی ئەم شیعرە فارسییە نوسراوە:

یا رسول الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف
داخلی جنت شوم در زمره‌ء اصحاب تو
او رود در جنت من در جهنم کی رواست
او سگ اصحاب کهف من صگ اصحاب تو

واتا:

یا (رسول الله) چ دەبێت وەک سەگی (اصحاب کهف)
بچمە بەهەشت لەگەڵ زومرە هاوڕێیانی تۆ
ئەو دەچێتە بەهەشت کەی ڕەوایە من بۆ جەهەنەم
ئەو سەگی اصحاب کەهفە، من سەگی ئەصحابی تۆ

***

## شینی شێخ ڕەزا

ڕۆژنامەی (الرقیب) کە لە بەغدا بە زوبانی عەرەبی دەردەچوو دوو شینی بڵاوکردەوە کە دوو شاعیری عەرەب بۆیان وتووە. یەکەمیان «عطاءالله خطیب زادە» کە دەڵێت:

اترضی المعالي ان تناح سواها
وقد علمت ان الفقید رضاها
ام الصبر هل یقضي بحسن اصطبارنا
وانفاس محیاء الرضاء قضاها
قضی نحبه والمکرمات تحفه
وتبکیه، لکن ما افاد بکاها
وکم بکت العلیاء ترجو
وهیهات ان یعطي البکاء مناها

قضى نحبه ايام عشر محرم
غريباً وحيداً مثل أهل عباها
فلا ابن يبيعه الشراب، ولا اخاً
ولا بنت تجلو همه بعداها
فتباً لدنيا لا ثبات لها، ولا
وفاء، ولايرجى البقاء. بحماها
وطوبى لأرض قد حوت منه اعظما
بها طالما الدهر الخؤون تباهى
وطوبى لقبر قد حوى العلم والتقى
واصناف فضل لم تكن تتناهى
وطوبى لقبر حل منزلة الرضا
اخو العلم من للمكرمات حواها
لطيف، رقيق القلب، شفّاف طبعه
لقد كان من عين الكمال جلاها
فكم عالجت يمناه مرضى ضلالة
فما مسها الأ استرد هداها
وكم مدنف اشفت من الجهل نفسه
فرد بآيات القريض شفاها
وكم كبد حرى شكت من اوارها
رواها بابيات اليه رواها
فلو رقموا يوماً على الطور نظمه
لكنت ترى الطور استحال مباها
فصيح ترى الحر البليغ امامه
كمعدوم نطق لايلم شفاها
كليم، واقلام المعاني عصيّة
متى هزها تلف الرجال شباها
كأن القوافي كنّ في اسر نطقه
تدحرج انى شاء حيث اتاها

فلو لطمت عشر العقول بعشرها
على مثله حزناً يحق أساها
ولو رأت الخنساء بعض فعاله
لما ادكرت من بعد ذاك أخاها
فلا كل مفقود من الحر مؤلم
ولاكل نار يهتدي بسناها
ولاكل مغمور بجفن مهنداً
ولا كل عضب للكمأة وقاها
ولاكل ذي جاه عريض بسيد
ولا كل من ساد الرجال حماها
ولا كل مفقود يناح لفقده
ولا كل ذات تفتدي بسواها
لمثل الرضا تجري الجفون بخيعها
لمثل الرضا تفني العيون ضياها
لمثل الرضا تغري الخوادر جيبها
لمثل الرضا تدمي الاسود جباها
لمثل الرضا في الكون تجرى مآتم
لمثل الرضا تهوى النفوس أذاها
لمثل الرضا يستصعب الحر صبرة
لمثل الرضا تجفو الكرام كراها
حباه اله العالمين جنانه
ولا زال مسروراً بضحبة طه

هەروا سید مهدی البغدادی لە شاری (نەجف) ئەم شیعرە عرەبییەی لە ژمارە ٩٣ رۆژی ٢١ شباطی ١٣٢٥ رومی لە رۆژنامەی (الرقیب)، لەمەئنتەمی شێخ رەزادا بلاوکردووەتەوە.

قولوا لاطناب العلوم قوضي
هذا الرضا وهو العماد قوضا

من للعلوم الغر يبدي ماخفى
منها بفكر يسبق السيف مضا
من للقوافي اللؤلؤيات التي
كانت نجوم جبهة الدهر وضا
اصبح وجه الدهر وهو اسود
وكان وجه الدهر فيه ابيضا
جوهرة لم يحتملها الدهر ان
تبدو، فضمها لقلبه القضا
فللقضا اجاب في رواحه
"ارخ لربه وفاه برضا"

به پیتی ژمارەی ابجدی دەکاتە ١٣٢٨هـ

***

## شێخ ڕەزا و بنەماڵەی (خادم السجادە)

بنەماڵەی (خادم السجادە)، لە پێشا نیشتەجێی شاری کۆیە و لەپاشان هاتوونەتە شاری کەرکووک. هەر لە کۆنەوە بەرماڵێکی پێغەمبەر، سەلامی خوای لێ بێت، کەوتووەتە لایان و پشتا و پشت پاراستوویانە و ماڵیان بووەتە زیارەتگای موسڵمانان. هەرچەنێک لە ساڵانی دواییدا، عەلی ئەفەندی خادیی سوججادە، لە نووسینێکدا لە ڕۆژنامەکان بڵاوی کردەوە ئیددیعای ئەوەی کرد کە ئەم بنەماڵەیە، لەڕەسەندا، لە بنەماڵەی (ئەمەوی)ن، لەبەرئەوە ئەم یادگارە کەوتووەتە لایان. بەڵام هیچ بەڵگەیەک بۆ ئەم بۆچوونە نەبوو.

هەر وەکوو ئەو قورئانە پیرۆزەی کە خەلیفە (عثمان کوڕی عفان) کۆی کردەوە و لە ساڵانی شەڕی رووس و تورکدا کەوتە دەستی ئەفسەرێکی رووس و ناردی بۆ مۆزەخانەی (پترسبرگ) و لە پاشان نێررایە (تاشقەند)ی پایتەختی کۆماری ئۆزبەکستانی سۆڤیاتی، هەروایش، لە هەلێکدا ئەم یادگارە کەوتووەتە لای ئەم بنەماڵە کوردە، کە کورد لە مێژووی دەوڵەتانی ئیسلامدا ڕۆڵێکی گەورەیان بووە.

لەکاتی حوکمی عوسمانی و لە سەردەمی حاجی ئەمینی خادیم سوججادە، کە پیاوێکی

مەلا و زانا و ناودار بوو، سوڵتان عبدولحەمید فەرمانی داوە ئەم زیارەتگایەی ئێستا کە لە کەرکووکە، لە ساڵی ١٣٢٣ کۆچی دروست کراوە.

لەم بنەماڵەیە، ڕەفیق ئەفەندی خادیم سوججادە، لەکاتی دامەزراندنی حکومەتی عێراقدا لەگەڵ شێخ حەبیبی تاڵەبانی و عەبدوڵلا صافی، بوونە بەنوێنەری شاری کەرکووک و لە (مەجلیسی تەئسیسی) بەشدارییان کردووە،. وە لەپاش ئەو عەلی ئەفندی کوڕی لە پەرلەمانی عێراقدا نوێنەری شاری کەرکووک بووە.

ئەم بنەماڵەیە، پشتا و پشت دۆستایەتییەکی قووڵ و خزمایەتییان لەگەڵ شێخانی تاڵەبانیدا هەیە. حاجی ئەمین لەگەڵ شێخ عەلی و ڕەفیق ئەفەندی لەگەڵ شێخ محەمەد عەلی و عەلی ئەفەندی لەگەڵ شێخ جەمیل. لەمە بەولاوە هیچ هۆیەک نییە کە شێخ ڕەزا ڕێزی بەرامبەر بەرماڵی پێغەمبەر (س) و هێرشی توند بەسەر نۆکەرانی بەرماڵ بێنێت.

شێخ ڕەزا لەگەڵ ئەو هەموو هەجوە ناڕەوایەی حاجی ئەمینی خادیم سوججادە، ڕێز و خۆشەویستی بەرامبەر ئەم یادگارە پیرۆزەی پێغەمبەر (س) دەردەخات و لەچەند شیعرێکدا سوپاسی سوڵتان عەبدولحەمید دەکات کە جێگایەکی لایق بەم یادگارەی دروست کردووە. لە شیعرێکی تورکیدا دەڵێت:

سجادهء شریفه‌یه تقبیل ایدنلره
بی شبهه‌در شفاعت سجاده صاحبی
زحمت ویرردی زائرینه ضیقت مکان
دگمزدی ذیل پاکنه هر عاشقک لبی
تا استلام شهر اول انشا بیوردیلر
عەبدولحەمید خان بو مقامی مرتبی
وارد سمای هفتمه تاریخکز (رضا)
بتدی طواف خانهء سجادهء نبی

واتا:

ئەوانەی ماچی سوججادەی شەریف ئەکەن
هیچ گومانی نییە کە بەر شەفاعەتی خاوەن سوججادەء ئەکەون
تەنگی جێگا سخڵەتی دەدایە زیارەتکەران
لەپی هەر عاشقێک نەدەگەیشتە داوێنی پاکی.

تاکو لە مانگی یەکدا فەرمانی دروست کردنیدرا
ئەم مەقامەی دا عەبدولحەمید خان
مێژووت گەیشتە ئاسمانی هەفتەم ئەی (ڕەزا)
کۆتایی هات زیارەتخانەی سوججادەی پێغەمبەر
١٣٢٣ کۆچی.

لە هۆنراوێکی تریدا مێژووی دروست کردنی ئەم ئابیدەیە دووپات دەکاتەوە و دەڵێت:

دولسون همیشه جیب همایون پادشاه
کیم جود (معنی) (حاتمی) افسانه یاپدیلر
سجادهء شریفەیه عبدالحمید خان
پک منتظم عمارت شاهانه یاپدیلر
مرکز جهانه گلمدی ماننذی بر ملک
هر کاری یاپدیلرسه ملوکانه یاپدیلر
تاریخی مطابق واقع دیدی (رضا)
(سجادهء پیمبر ایچون خانه یاپدیلر)

١٣٢٣ کۆچی

واتا: هەمیشە پڕ بێت گیرفانی هەمایوون پادشاه
ئەوە کێیە بەخشندەی (مەعن) و (خاتەم)ی کردە ئەفسانە
بۆ سوججادەی شەریف، عەبدولحەمید خان
کۆشکێکی زۆر ڕێکی شاهانەی کرد.
نەهاتووەتە جیهان شاهێکی وەکو ئەو
هەر کارێکی کردبێت شاهانە کردوویەتی

بەپێی ژمارەی ئەبجەدی، مێژووی دروست کردنی ئەم کۆشکە دەکاتە ١٣٢٣ . هەر لەبابەت ئەم کردەوەیەدا دیسان دەڵێت:

پادشاه آل عثمان یعنی خان (عبدالحمید)
قابل انکار دگل احسان فوق العادەسی
پادشاه؛ انبیایی مس ایدەن سجادەیه

گـور مـدی لائق، زیـارتخـانـه ء مـعـتـادەسی.
بر زیارتخـانـه ء شـاهانه انشـا قـیلدیلر
آسـمـان دورنجه دورسون شاه ایله شهزادەسی
پک کـوزل دوشـمش رضـا جـوهرلی تاریخکر
(امـجـد پـیـغـبـەرک مـوقف سـجـادەسی)

واتا:

پادشای آل عوسمان یانی خان عەبدولحەمید
قەد ئینکار ناکرێت چاکەی فەوقەلعادەی
بۆ ئەوانەی زیارەتی بەرماڵی پادشای پێغەمبەران دەکەن
ئەو زیارەتخانەیەی بەلایق نەزانی.
زیارەتخانەیەکی شاهانەی دروست کرد
تاکو ئاسمان وەستاوە بوەستێ شاه و شازادەی
زۆر جان کەوتووە (ڕەزا) مێژووی جەوهەردارت
(جێگای بەرماڵی پێغەمبەر خاوەنی مەجد)

شێخ ڕەزا لەگەڵ ئەم هەموو ڕێزەی بەرامبەر زیارەتگای بەرماڵی پێغەمبەر، لە هەموو دەرفەتێکدا هەجوی حاجی ئەمینی کردووە و هەتا لە هەجوی شێخ محەممەد عەلی برازای ئەم جنێوە بە حاجی ئەمین دەدات:

شـێخ کـە گـەووادێ وەکـوو (خـادمی سـوجـجـادە) لەلای
سـەیدی حـور لە سـولالەی عـەلی و فـاطـمـە بێ

لە شیعرێکی تریدا کە باسی نان و خوانی حاجی ئەمین ئەکات ئەڵێت:

خـادم سـجـادەیی پـیـغـمـبـری
کـشـتـی جـود و سـخـارا لەنگەری
اغنیـا خـواهند از انعـام تـو
سـینیـێ شـەگـرا و پلاو دوو لەنگەری
ئەو کـەسـەی خـوانی لە بۆ دێ صـوبح و شـام
چی لە ئێـمـە زیاترە غـەیرەز کـەری؟

واتا:

ئەی نۆکەری بەرماڵی پێغەمبەر

تۆ لەنگەری کەشتیی سەخا و بەخششی

دەوڵەمەندان لەنان و نیعمەتی تۆ

سینییێ شەکراو و دوو لەنگەری پلاویان ئەوێ

ئەو کەسەی سینی بۆ دێ بەیانی و ئێوارە

چی لە ئێمە زیادە غیرەز کەری یا کەڕی و

مەبەستی شێخ محەمەد علی کەڕەیە.

وا دیارە ئەم بگرەوبەردەی نێوان شێخ ڕەزا و خادمی سوججادە تەنیوەتەوە و شێخ ڕەزا لە شیعرێکی فارسیدا ئەم هەجوە توندەی کردووە.

مـــیــخــوارەینم من کـــه مــرا بادە بیـــارید

من ســادە پرســتم، پســری ســادە بیــارید

چندان خــوشم از بچــە ء کــون دادە نیــاید

گـــرهست یکی بچــە ء ناگـــادە بیـــارید

واتا:

من مەیخۆر نیم مەیم بۆ بێنن

من بێ تووک پەرستم، هەتیوێکی بێ تووکم بۆ بێنن

من ئەوەندەم حەز لە هەتیوی قنگ داو نییە

ئەگەر هەیە هەتیوێکی نەگاویاوم بۆ بێنن

نی‌نی غلطم بچــە ء ناگـــادە در این شـــهــر

پیــدا نشـــود گـــادەو، ناگـــادە بیـــارید

بایک کـــفلی گـــرد قناعت نتـــوان کـــرد

کـــونرا بتـــرمـــوای و بەعـــرادە بیـــارید

واتا:

نەنە، هەڵە بووم، هەتیوی نەگاویا و لەم شارە

دەست ناکەوێ، گاویاوو نە گاویاو (هەرچی دەس کەوت) بهێنن

پیاو ناتوانێ بەتەنها کەفەڵێکی خڕ داکەوێ

قنگی وا زل بێنن بە ترامواى و عەرەبانە بگوێزرێتەوە

زان مکتب حربیه که سرچشمه ء کون است
چندین نفـــر و ضـــابط و بگزاده بیـــارید
آن صـــبـــر ندارم کـــه ز پایش کنم ایزار
دامن بکمـــــر بر زده آمـــاده بیـــارید

واتا:

لەو قوتابخانەی جەنگییە کەسەرچاوەی قنگە
چند نەفەر و ئەفسەر و بەگزادە بێنن
ئەوەندە خۆم پێ ناگیرێ تا دەرپێکەی لەپێ دائەماڵم
یەکێکم بۆ بێنن حازر و ئامادەبێ داوێنی دیزداشەکەی کردبێ بەبەر پشتێندەکەیا

مـــقـــصـــود همین آتش شـــهـــوت بنشـــانم
گـــر پیـــر و جـــوان، گـــر نر و گـــر مـــاده بیـــارید
گـــر زانکه فـــرســـتـــاده فـــرســـتـــیـــده نیـــاورد
از بهـــر مـــجـــازات فـــرســـتـــاده بیـــاریده

واتا:

مەبەست ئەوەیە ئەم ئاگری شەهوەتەم دامرکێنمەوە
پیر بێ و جوان بێ، نێر بێ و مێ بێ، هەرچی هەیە بۆم بێنن
ئەگەر ئەو کەسەی ئەینێرن هەتیوەکە بهێنێ نەیهێنا،
لە سزادا خۆی بهێنن

از طالع نحـــســـم اگـــر آن هم ندهد دست
یک پیـــر نود ســـاله ء افـــتـــاده بیـــارید
گـــر پیـــر نود ســـاله مـــیـــســـر نشـــود نیـــز
فـــرتـــوت شـــده (خـــادم ســـجـــاده) بیـــارید

واتا:

ئەگەر لەچارەی ڕەشم ئەوەیش دەست نەکەوت
پیرێکی نەوەد ساڵەی لێکەوتوو بێنن،
ئەگەر پیری نەوەد ساڵەیش دەست نەکەوت
(خادیموسوجادە)ی فەرتووت و پەک کەوتووم بۆ بێنن

## شێخ ڕەزا لە مەیدانی عەشیرەت ئاراییدا

بنەماڵەی تاڵەبانی، لە پاش بڵاوبوونەوەی یانزە کوڕی شێخ ئەحمەد، لە شێخانی تەریقەوە بوونە عەشیرەتێکی گەورەی شەڕەنگێز، لە سەرتاب و حاجیلەری قەزای خانەقینەوە تاوەکو نزیکی ناوچەی «دووبز» لە سەر (زێی بچووک) دەستیان بەسەر زەوی و زاری هەرێمێکی فراوان داگرت. لەمەدا لووتیان تەقییە لووتی هەندێ لە عەشیرەتانی ئەو هەرێمە. لە قەزانی خانەقین لەگەڵ ئێلی باجەڵان و جموور، لە قەزای کفری لەگەڵ بەگزادانی جاف و لە ناحیەی کۆشک (گل) لەگەڵ عەشیرەتی داوودە و جەباری و بەگەکانی گل و شێخانی بەرزنجە. لە قەزای داقوق لەگەڵ عەشیرەتی کاکەیی و داوودە و لە تەیناڵ لەگەڵ شێخانی بەرزنجە و عەشیرەتی هەمەوەند.. هتد.

لەم گێرە و کێشەیە، کە بۆ داگیرکردنی زەوی و ئاو بوو، گەلێک شەڕ و شۆڕ لە نێوانی تاڵەبانییەکان و ئەم عەشیرەتانە ڕووی داوە. شێخ ڕەزایش وەکوو یەکێک لە تاڵەبانی، بە زمانە تیژەکەی، بەهەق و ناهەق، لایەنگیری عەشیرەتی خۆی کردووە و هەجوی عەشیرەتانی تریشی کردووە. ئەوانەی لەو هەجوانەدا وتوویەتی، هەرچەنێک زۆربەیان ڕاست نین، بەڵام لەبابەت هونەرییەوە بەهایەکی زۆریان هەیە و دەبێت تەنها لەم سووچەوە تەماشا بکرێن و نەبێتە هۆی دڵگیریی ئەو کەسانەی کە بە خراپە ناویان هاتووە. لەسەر ئازایی عەشیرەتی تاڵەبانی دەڵێت:

بارەکەڵڵا ئافەرین ئەی عەشرەتی نەصرەت شیعار
مەردی مەیدان شێری جەنگ ئاوەر هوزەبری کارزار
چوار عەشیرەت، کاکەیی و هەمەوەند و جەباری و داوودە
ئیتتیفاقیان کرد و هاتن چوار صەد و پەنجا سوار
هەر بە ئەووەل حەملە چەندتان کوشت و چەندتان سەربڕی
چەند لەشیان لێ بەجێ ما، بوون بە طوعمەی مور و مار
نێستەکەش لەو دەشتە شەڕیانە لەسەر لاشەی ڕزیو
کەرگەس و شاهێن و گورگ و مامە ڕێوی و کەمتیار
بەینی بەینەڵڵا (عوبێد)ی فیلەتەن کارێکی کرد
هیچ کەسێ نایکا مەگەر حەیدەر بە زەبری ذولفیقار

هەر سـواریَ فـیـرقـەییَکی ڕارفـاند و دایە پێش
کـەوتە سـەر کـوێخـا مـەخـۆل (عـەبدولوەهاب)ی نامـدار
لێی خوڕی وەک شـێـری غـورڕان: سـامـەڕۆ ڕاوەسـتـە بۆم
ئەی تلـێـشی (دایەڕێزوار)ت بەڕیشی (یادگـار)
چەکـمـەیێ سـووری لە پێـدابوو بەجـاریَ زەردی کـرد
تس لە ملیـۆن تێپـەڕی کـرد، تڕ گـەیشـتـە صـەد هەزار
یەک لە یەک ئازاترن تەعـریفی کـامـێکتـان بکەم
دەک فـیـدای دەست و تفـەنگت بم سـولالەی شێخ سـتـار
شـەهسـوارێکی وەکـو تۆمـان هەبێ باکـمـان چیـیـە
تۆیش لە حـەقـیـقـەتدا سـوارێکی وەکـو ئەسـفـەندیار

لێرەدا شێخ ڕەزا خۆی دەیسەلمێنێت کە ئەم مەدحە هەمووی مەجازە. بەڵام ئەوەی ڕاست بێت لەم شەڕەدا تاڵەبانییەکان شکستیان نەهێناوە.

ئەم قـسـانە گـشت مـەجـازن گـەر حـەقـیـقـەتتـان دەویَ
بەذلی نان و هیـمـمـەتی پیـرانە بۆتان کـەوتە کـار

بێگومان شێخ ڕەزا ئەم هەموو هەڵنانەی بە بەلاش نییە:

جـائـیـزەم مـەطلووبە ئەم مـەدحـەم بە خـۆڕایی نـیـیـە
هورتمانیش بێ (رضـا)م گـەر هیچ نەنێـرن یا سـتـار

لەم شیعرەیشیدا دووبارە باسی ئەم شەڕە دەکات و دەڵێت:

سێ عەشیرەت بوون بە یەک تا ڕیشەمان دەرکەن بە یەکجاری
جـەباری و داوودە و کـاکـەییێکانی (دایە ڕێزواری)
قەسەمیان خوارد بە ڕووحی سەید براکە و گۆڕی خان ئەحمەد
بە کەللەی خووگ و شاخی گاوە حۆل و گـۆشتی مرداری
دەبێ ئیـمـڕۆ بەجـاریَ قـەطعی نەسلی (تاڵەبانی)کـەین
تەقـوتۆقـیـان کـە هەسـتـا گـوللە هەر وەک تەرزە دباری
سـوارەی تاڵەبانی دەریەڕین، وەک ڕۆسـتـەمی دەسـتـان

فـــيـــراريان اخـــتـــيـــار كـــرد ســـەيدەكـــانى باوە يادگـــارى
فـيـرارى كـاكـەيى هەرنەيسـە ئەمما گـوێى فـەلەک كـەڕ بوو
لە جـــرت و فـــرتى ئاغـــاى داوودە و ســـاداتى جـــەببـــارى

***

**لەشكرى تاڵەبانى بۆ سەر داوودە**

لەبەر سـەرنەكـەوتنى لەشكرى داوودە و ئێـڵـە سـوێنخـوارانى بەسـەر تاڵەبانيـدا شـێخ حـەمـيـدى تاڵەبانى كـە زانى داوودە خـەريكى كـۆكـردنەوەى لەشكرێكى ترييـە بۆ تـۆڵە سەندنەوەى شـەڕى شكسـتى پێـشـوو، دەس پێشكـەريى كرد و لەشكرێكى لە تاڵەبانى و گل و زەنگنە و ڕۆغـزايى جاف كۆكردەوە و دايە سەر دێهاتى (تاوێر و تالا و نەيجول)ى داوودە. ئەوەى سـەيرە، شێخانى تاڵەبانى لەگـەڵ زۆربەى ئاغـاكانى داوودە، لە ڕێگاى ژن و ژنخوازەوە زاوا و غـەزوور و خاڵۆزا و پوورزان. لەگـەڵ ئەم هەمـوو خزمـايەتييـەيش ئەم هەموو شەڕە خوێناوييە لە نێوانيانىدا ڕووى داوە.

لەم شەڕەدا گەلێک پياوى ئازا لە هەردوو لا بەشداربيان كردووە. وەكو شێخ حەميد كە پياوێكى كەڵەمێرد و نەترس بوو شێخ ڕەزا بەم شيعرەدا باسى لەشكر ئارايى شێخ حەميد ئەكات و وەكو لەشكرى نيزامى بۆ شەڕ ڕێكى دەخات. لە زەنگنەكان باسى ئازايى ئەمين قادر زلێخا ئەكات. لەم بنەماڵە قادر زلێخا و ئەمينى كوڕى و ڕۆستـەم كوڕى ئەمـيـن بە يەكـە سوار و كـەڵەمـێردى ناويـان دەرهێنابوو. هەروا بـاسى ئازايى و نەترسيى جـافـەكـان ئەكات و بە گيـان پۆلا ناويان دەبات. لە داوودەكانيش پياوانى ئازا وەكو مەمەد و ئينجە بەگ عەباس ئاغا بە ئازايى ناويان دەرهێنا بوو.

لەم شـەڕەدا داوودەكان شكست دێن و خۆيان لە قـەلاكانيـان قاييم دەكەن. شێخ حەميد هەڵمـەتى قـەلاكـان دەدات و ژنە تاڵەبانيـيـەكـانى ئاغـايانى داوودە هەلهـەلە بۆ خـزمـانى تاڵەبانيـيـان هەڵدەدەن و: «حيـزانە خۆتان بگرن لە بەردەم حەمـيـد» تانە لە مـێردەكـانيـان دەدەن. يەكـێک لە ئاغـايانى داوودە بە بريندارى بەجێ دەمـێنێت. و شـێخ تەهاى شـێخ صـەمـەدى پوورزايى خـۆى دەداتە سـەرى بۆ پاراسـتنى، سـوارێكى ڕۆغـزايى سـوێنى لێ دەخوات: «بە كـەلامـى خوا چەكـمەى زەردى لە پێدايە هەر ئەيكوژم و تەقـەيەک ئەكات و هەردووكيان ئەكوژێت».

داوودەیش لەم شەڕەدا ئازاییەکی زۆریان نواندووە شێخ ڕەزایش دانی پێ دەنێت بەڵام دەڵێت:

عـەشرەت ئازایش بێ. کە نامووس نەبێ بێ فـەیدەیە
عـەشرەتی بێ غـیرەت ئەمڕۆ عـەشرەتی (داوودە)یە

فەرموون لەگەڵ باسی ئەم شەڕەدا وەکو شێخ ڕەزا دەیگێڕێتەوە:

ازان ســو چ و (داوودە) لەشکرکـــشـــیـد
ازیـن سـو بجنبـــیـد (عـــبـدالحـــمـــیـد)
بفــــرمـــود تا (تـالبــــانی) گـــروه
نـســــتـند برخــــانەء زیـن چوکـــوه
بـرانگیـــــخت آن اشـــــقـــر دیـو زاد
چو روســــتم یکی ســــان لشکر بداد
جـنـاح ازچـپ و راست بـرپـای کـــــرد
بقلب اندرون خـــویشـــرا جـــای کـــرد
گـــروهی فـــرســـتـــاد بر مـــیـــمنه
ز گـــــردان گـــــردن کـــــشی (زنـگنـه)
بـە رنج انـدرون دریـکـن مــــــصـــــاف
گـــروهی ز فـــولاذ جـــانان (جـــاف)
پی چرخ گــــــردون گــــــروهی دیگر
ز چابـک ســـــواران ســـــەتا بســـــر
بەمـــــســـــتی دگـــــر رزم جـــوّیان (گل)
زیـر دست زور آورد شـــــیـــــــــر دل
نخـــســـــتین از (گل) علـم بر فـــراخت
بـ (تاویر) و (تالا) و (نیـــجـــول) تاخت
ز ان دوده جــــــــــــای (داوودە) بــود
بمردان جـنـگـی بـر آمـــــــــوده بـود

(محمد نـام ســـــالار آن انجـــــمـن
کـه گـفـتی کـسی نیـست همـتـای من

واتا:

کە (داوددە) لەولاوە لەشکریان هێنا
عەبدولحەمید لەم لاوە بزووت
فەرمووی کە دەستەی (تاڵەبانی)
وەکو کێو لەسەر پشتی زین دانیشتن
ئەو ئەرژنگە بێچوە دێوە ڕاپەڕی
یەکێکیش وەک ڕۆستەم لەشکری ریز کرد
قۆڵێ لە ڕاست و قۆڵێ لەچەپ دانا
جێی خۆی لەناو جەرگەی لەشکردا کردەوە
دەستەیەکی نارد بۆ لای ڕاست
لە کەڵەمێردانی مل دانەنەوانی (زەنگنە)
بۆ شەڕی چەرخی گەردوون دەستەیەک تری
ئامادە کرد لە چابوک سوارانی سێ تا بسەر
لەلایەکی تریشەوە شەڕەنگێزانی (گل)
زەبەردەست زۆر هاورد و شێر دل
یەکەم کەس لەگلان ئاڵای هەڵگرت
هێرشی بردە سەرن (تاوێر) و (تالا) و ئەیجول
جێی داوودە لەو دوو دێیەدا بوو
پڕ بوون لەکەڵە مێردانی شەڕکەر
گەورەی ئەو کۆڕە (مەمەد) ناوێ بوو
ئەیوت کەسێ نییە هاوتای من

مـنـم وارث تـخـت (اسـکـنـدری)
جـهـانـرا سـزاوار سـر عـسـکری
نژادم ز (خـورشـیـد خـاور) زمین
منم تـس خـاقـان و سـالار چین
بمن راست شـد پشـت (داوودی)یان

زین بر کنم بیخ (محمودیان)
بگفت این دو لشکر بینجول ماند
خدا صد سواری بتعجیل نارد
رسیدند سرره گرفتند تنگ
بر انگیخت دهمان آمد بجنگ
برادرش مدحت پس پشت او
تفنگ سیه لوله درمشت او
بر آورد چند آتش کارزار
بسی برنیامد که برگشت کار
جوانی ز خویشانی او گنجه نام
همی راند برتو سن بتزگام
زنندش یکی گله برتو سنا
بغلطید برخاک لرزان تنا
دلیران گرفتند پیراهنش
کفن گشت بر گنجه پیرآهنش
بر آن خاک شد پیکرجان چاک
یکی گنجهرا کرد باید بخاک
تنی چند که بودند خویشان او
دران حمله گشتند قربان او

واتا:

منم میراتگری تەختی ئەسکەندەری
شایانی سەر لەشکری جیهانم
لە ڕەگەزی خورشید زەمینم
منم نەوەی خاقان و سالاری چین
بە من پشتی داوودە ڕاست بووەتەوە
لەبن ڕیشەی مەحمودیان دەردێنم

وتی ئەم دوو لەشکرە لە ئەیجول بێنن
خوا سەد سواری بەپەلە نارد
گەیشتن و سەرە ڕێگەیان تون گرت
«دەهمان» ڕاپەری و هاتە کۆڕی شەڕ
(مەدحەت)ی برای لەپشت سەرییەوە
تفەنگێکی سێ لوولەی لەمشتیا بوو
چەند تەقەیەکی کرد و شەڕ هەڵگیرسا
ئەوەندەی پێنەچوو بارودۆخ گۆڕا
لاوێکی گەنجە ناو لە خزمەکانی
بەپشتی ئەسپە سەرکێشەکەیەوە تاوی ئەدا
گوللەیەکیان نا بە ئەسپەکەیەوە
بە لاشەی پەلەقاژەکەرییەوە لەناو خاکا گەوزا
قارەمانان جلەکانی ژێریان گرت
گەنجە ئەو جلانەی بوون بە کفن
لاشەی بەسەر ئەو خاکەوە لەت لەت بوو
دەبوا یەکێک لەخاکدا بیشارێتەوە
چەند کەسی کە خزم و کەسی بوون
لەو هێرشەدا بوون بە قوربانی

چو (داووده) دید اتش تیـــزخـــیـــز
همـــان گـــه گـــرفـــتند راه گـــریز
بطاس اندرون مـــهـــره انداخـــتند
تکا در ســـوی قلعـــهـــا تاخـــتند
دبیـــری کـــه خـــوانند اورا امین
بر آغـــا حـــمـــد حـــمله پرداز کـــمین
بر او بانگ یرزد کـــه ســـرعـــسکرا
مـــرو تا بدانی نشـــان مـــرا
منم پور قـــادر زلیـــخـــای شـــیـــر
چه قـــادر زلیـــخـــا و چه (اردشـــیـــر)

شنیدم که آغا دران گیروار
همی راند مرکب سرا سیمه‌دار
فرومانده گفتی بدست اجل
چو مسهل خو رانش عمل بر عمل
عنانش زکف رفته لرزان چوبید
امین درپسش همچو دیو سفید
دراین بود کار و سرشرا ببند
چو جاد و گرانرا کنند حیله بند
بزیر زمین کشته شد باذپا
بتمثال آن مرد جنگ آزما
به اسب دیگر تا امین شد سوار
بزد خیمه آغا بصحن حصار
چو پوشیده رویان بی آبرو
بکنجی در آن قلعه بنهفت رو

واتا:

که (داووده) بلیسه‌ی ئاگریان دی
ڕێگای هه‌ڵاتنیان گرته به‌ر
موریان خسته تاس و ناوژووره‌وه
هه‌ر به‌غار به‌ره و قه‌ڵاکان تاویان دا
بنووسێ که پێیان ئه‌وت ئه‌مین بوو
له که‌مینه‌وه هێرشی برده سه‌ر ئاغا مه‌مه‌د
لێی خوڕی وتی: ئه‌ی سه‌رله‌شکر
مه‌ڕۆ تا ناونیشانی من بزانی
منم ڕۆڵه‌ی قادر زوله‌یخای شێر
چه قادر زوله‌یخا و چه ئه‌رده‌شێر
بیستم ئاغا له‌و بگره و به‌رده‌یه‌دا
به‌سه‌را سیمه‌یی ئه‌سپه‌که‌ی تا و ئه‌دا

ئەتوت بە دەستی ئەجەلەوە داماوە
وەک دەرمانی ڕەوانی خواردی جار
لە دوای جار عەمەلی ئەکرد
جڵەوی ئەسپەکەی لەدەس دەرچوو بوو
وەک بی ئەلەرزی ئەمینیش وەک دێو
سپی هەر بەدوایەوە بوو
لەم حاڵەدابوو ئەو بەم جۆرە کەوتە داوەوەی
وەک جادووگەر بە فێڵ ببەستنەوە
ئەو تیژ ڕەوە لەژێر زەویدا کەوت
وەک ئەو مەردە شەڕ تاقی کەرەوە
تا ئەمین سواری ئەسپێکی تر بوو
ئاغا لە حەوشەی حەسارەکەدا دەواری هەڵدا
وەک ئەو بێ ئابڕوویانەی کە ڕوویان ئەشارنەوە
لە گۆشەیەکی ئەو قەڵایەدا ڕووی خۆی شاردەوە

دریده شـــــدش پرده‌ء نـام و نـنـگ
زنـام آوری یـاد مـــــانـدش بـچـنـگ
بســـر برد آن روز بـاصـــد هـراس
در آن قـلـعـــــه تـا رفت از شب دوپـاس
شـبـی تیـره فـرصت غنیـمت شـمـرد
بیـــرون رفت راه دراجی ســـپـــرد
بدراجی آمـــد جگر خـــســـتـــه باز
چو دراج بر جـــســـتـــه از چنگ باز
جنان ملک و مـــالش بتـــاراج شـــد
بـیـک بـازی‌ء چـرخ دراج شـــــــد
کـــسی را کـــه برداشت پاشــای جــاف
تـوانـد کـنـد بـر نـظـر کـــوه قـــاف
چو مـحـمـود پاشـا دراین ملک نـیـست

دراجی کـــدامـــــست داووده کــیـــــست
سـگ کـــــیـــــست (داووده‌ء) دودکی
زند پـه‌نجـــه با جـــعـــفـــر برمـکی
عــــشـــــایر همـــــه بندگـــان دیند
بـــر آورده‌ء دودمـــــــــــــــــان ویـــنـد
پس این دودمـــــان واجب الحـــرمـــــتند
اکـــر ڕاست خـــواهی ولی نـعــمـــتند
یکی از دوعــا گــوی ایشــان (رضــا) است
(رضــا) را کــه گـرخـشم گـیـرد قـضـا است

واتا:

بەڵام پەردەی ناو و شورەتی دڕا
تەنها بیرەوەرییەکی بەدەستەوەما
ئەو ڕۆژەی بەصەد ترس و لەرز بردەسەر
تا دوو پاس لەشە و تێپەڕی
شەوی تاریکی بە فرصەت زانی
هاتە دەرەوە و ڕێی دراجی گرتەبەر
بە دڵی ماندووەوە هاتەوە دراجی
وەک پۆڕێ لەچنگ باز هەڵاتبێ
ماڵ و موڵکی وا بەتالان ڕۆیی
بەتاقە یارییەکی بازی گەردوون بوو بەپۆڕ
کەسێ کە پاشای جاف هەڵیبڕێبێ
ئەتوانێ بە ڕوانینێ کێوی قاف لەبن هەڵکەنێ
وەکوو مەحموود پاشا لەم ئارادا نەبێ
دراجی کامەیە و داووده کێیە؟
داوودەی حیز سەگی کێیە
تا پەنجە لە پەنجەی جەعفەری بەرمەکی بدات
عەشیرەتان هەموو بەندەیی ئەون
بەرز کراوەی بنەماڵەی ئەون

لەبەرئەوە ئەم بنەماڵەیە پێویستە قەدریان بگیرێ
ئەگەر ڕاستت ئەوێ وەلی نیعمەتن
(ڕەزا) یەکێکە لە دۆعا گۆیانی ئەوان
ئەو ڕەزایەی ئەگەر ڕقی هەستێ ئەبێتە بەڵای خوا

شێخ ڕەزا زۆر شانازی بە ئازایی شێخ حەمیدی ئامۆزایەوە کردووە و دەڵێت:

حەیدەری کەر ڕاە یاخو خالیدی ئیبنی وەلید
ڕۆستەمێکە ڕۆژی دەعوا بەینی بەینەڵلا (حەمید)

هەروا دەڵێت:

(شێخ حەمید) گەرچی لە قەبیلەی ئێمەیە
(ئەحمەد ئاغای یەعقووب ئوغڵی) ئێمەیە

کەچی لە دژی ئاغای جەباری دڵی سارد نابێتەوە و دەڵێت:

لە سوورەی سەر خەرم ئاگر دەباری
کوتامە ژێر گونی ئاغای (جەباری)

***

### هەجوی کاکەیی

هیچ گومانی تێدا نییە کە شێخ ڕەزا لەبەر ناکۆکیی نێوان عەشیرەتی تاڵەبانی و کاکەییەکان ئەم هەجوەی خوارەوەی کاکەیی کردووە. بەڵام کە تەماشای ئەم هەجوە دەکەین، لەگەڵ هەجوی عەشیرەتی داوودە و جەباری جیاوازە و بە جۆرێکی وا باسی، نهێنییەکانی ڕێبازی کاکەیی دەکات، پێویستە هەندێک لە بنچینەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کاکەیی قووڵ ببینەوە، چونکە هەموو ڕێبازێکی سیاسی و ئایینی نوێ گەلێک ناتۆرەی بۆ هەڵبەستراوە، بەتایبەت ئەگەر ئەو ڕێبازە بەجۆرێکی نهێنی بوو بێت.

### کاکەیی چین و بۆچ ڕێبازیان نهێنی بووە؟

لە کوردستانی خوارووودا ناوی کاکەیی بەو تایەفە ئایینییە دەڵێن کە لە ڕۆژئاوای ئێران بە (عەلی ئیلاهی) ناودەبرێن. بەڵام پیاوە ئایینییەکانی خۆیان ناوی «ئەهلی حەق» لەخۆیان دەنێن. دەبێت ئەوەیش بزانین کە هەندێک ڕێبازی مەذهەبی تریش هەن ئەم ناوە

لەخۆ دەنێن، کە هەمووی؛ ڕێز و خۆشەویستیی ئەم ڕێبازانەیە بەرامبەری یەکێک لەهەرە گەڵە ڕەهبەرانی ئیسلام، عەلی کوڕی ئەبی طالب دەگەیێنێت. دەبێت ئەوەیش بزانین کە خاوەنی ئەم بیر و باوەڕانە ناتوانن بەبێ باکی ڕاستی بیروباوەڕیان بخەنە ژێر دەستی ئەوانەی کە باسیان دەکەن، چونکە ئەم بیروباوەڕانە وەنەبێت تەنها بە دەرکەوتنی ئیسلام و ڕەهبەرێکی وەکو عەلی کوڕی ئەبی طالب دەرکەوتبێ، بەڵکو بنو بنچینەیان تێکەڵی گەلێک لەبیری کۆنی کورددا بووە و بەچەشنێکی جۆرا و جۆر دەرکەوتوون.

ئەهلی حەق؛ تایەفەیێکن زۆربەیان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات و کوردستانی خوارووودا، لەیەکەم پلەدا لە نێوان کوردانی کۆچەری ڕەشماڵ نشین و صەنعەتکارانی شاراندا بڵاوبووەوە.

جێگا و بنچینەی بڵاوبوونەوەی ڕێبازی ئەهلی حەق، بەپێی دەسنووسەکانی خۆیان، تاوەکو صەدەی هەفتەمی کۆچی، لوڕستان بووە و لەوێوە بەرەو ڕۆژئاوای کوردستان؛ کرماشان و سنە بڵاوبووەتەوە و ئێستا زۆربەی کوردانی گۆران و هەموو ئێڵی قەلخانی و سنجاوی و بەشێک لە کەڵهوڕ و زەنگنە و عوسمانەوەند و جەلالەوەند و لە شارەکانی قەسری شیرین و کرند و سەرپێڵی زەهاو لەسەر ڕێبازی ئەهلی حەقن. لە کوردستانی خوارووودا؛ لە ناوچەکانی سولەیمانی و کەرکووک و خانەقین و دەوروبەری مووصڵ و هەندێ لە کوردستانی ژووروو لە تورکیا لەسەر ئەم ڕێبازەن.

بۆ زانینی ڕاستی بیروباوەڕی ئەهلی حەق، لەژێر تەئسیری کۆمەڵایەتی، کە لە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردستان جیا نابنەوە، کە بێگومان کە پاشماوەی بیروباوەڕی زۆر کۆنی کورد لە نێوان باوەڕی ئەهلی حەق بەشێوەی شەڕ لە نێوان لایەنگیرانی «عەلی» و لایەنگیرانی «معاویە»دا خۆی دەرنەخات. لەبەرئەوە ناتوانین بڵێین ئەم بیروباوەڕە ئایینێکی کۆنی کوردە تێکەڵی ئایینی ئیسلام بووە یان ڕێبازێکی ئیسلامییە هەندێ باوەڕی کۆنی کوردی تێدا ماوەتەوە.

لەکتێبێکی پیرۆزی خۆیاندا بە زوبانی کوردی گۆرانی دەڵێت:

یارسـان وراه، ڕای هەق ڕاسین، برانان و ڕاه
پاکی و ڕاستی، نیستی وردە ئا قەدەم و قەدەم تامنزڵگاه

کتێبی پیرۆزی ئەهلی حەق، وەکوو گۆرانی سۆزی دەروێشان، لە عیبادەتدا بە ئاهەنگێکی تایبەتی لەگەڵ سازی (تەموورە) دەوترێت.

ئەهلی حەق باوەڕیان بەوەیە کە هەفت فریشتە هەن، لە دەورانی جیاواز بە ناوی جیاجیا، لەگیانی هەندێ پیاوچاکاندا دەردەکەون، وەکوو لە کتێبی پیرۆزیان لە (شانامەی حەقیقەت)دا دەڵێت:

کە عدل خدا این بود درفنون
هر انکی بمیرد بدوران برون
هر آن بودش بە دونیا مکان
بیاید بەعقبی بود آن چنان
چو موزون بگردد حسابش بکار
دو بارە بیاید بدون شمار
چنین تا کند طی همە آن هزار
در آن اخر روز از امریار
وگر دون بدون در زمان نیست راست
خدا در کجا عدل او کجاست

نیشانەی ئاشکەرای ئەهلی حەق هێشتنەوەی سمێڵە کە دەبێت لێوی سەروو داپۆشێت، لەسەر ئەو باوەڕە کە ئیمامی عەلی قەیچی سمێڵی نەدەبڕی.

هەروا لە بیر و باوەڕیاندا پاراستنی سر (نهێنی) کە بناغەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی هەیە. «دشت پیر و دلیل، جم و جمخانە، خانەدانانی حەقیقەت، روژە ء سە روزدا نام برد».

ئەوەی جێی سەرنجە: لە صەدەی هەفتەمی کۆچیدا، بە دەرکەوتنی نوێ کەرەوەی ئەم ڕێبازە، کە هەندێک بەدامەزرێنەری دادەنێن، کە «سوڵتان سوهاک» شێوەیەکی تری وەرگرت، کە میللەتی کوردی بۆ ڕۆژی تەنگانە ئامادە دەکرد. وەکو دەسنیشان کردنی خانەدانانی حەقیقەت و سڕ پاراستن و سزای سڕ دەرخستن و هەڵبژاردنی (پیر و دەلیل) و دامەزراندنی کۆڕی ئایینی (جمخانە) و ئادابی تایبەتی «ڕۆژی سێ ڕۆژە» و یاسای تری کە سوڵتان ئیسحاق (سان سهاک) بە بنەڕەتی حەقیقەت دایناوە، هەر لەسەر هەمان ڕێباز دەڕۆن.

هیچ گومانی نییە کە هۆی دارشتنی هاوکاری و یەک گرتنی دەستەکانی ئەهلی حەق

لەلایەن سولتان سوهاکەوە دوو شت بووە، یەکەمیان؛ هەڕەشە و مەترسی سوپای (مەغول) کە لەو کاتەدا، ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات و کوردستانی خواروو بوون و دووەمیان؛ بۆ پاراستنی ڕێباز و ئادابی میللەتی کورد کە لە ژێر پالەپەستۆی ڕێباز و ئادابی میللەتانی ترەوە بوو.

سولتان سهاک، لەپاش داگیرکردنی بەغدا و پامال کردنی خیلافەتی عەبباسی لەلایەن (هۆلاکۆ)وە. بۆ بەرهەلستی مەغۆلەکان، بارەگایەکی تایبەتی، بەشێوەیەکی ڕێبازی ئایینی دادەمەزرێنێت، بۆ یەک گرتن و هاوکاری لە نێوان هەمو و تایەفەکانی ئەهلی حەق و هەموو ئەهلی حەق لەژێر سەرکردەی حەوت خانەداندا دەبەستێتە یەکەوە. ئەمانەیش؛ خانەدانی شا ئیبراهیم، خانەدانی عالی قەلەندەر، خانەدانی باوە یادگار و خانەدانی سەید ئەبولوەفا، خانەدانی میرە سوور، خانەدانی سەید مستەفا و خانەدانی بابو عیسا. ئەم خانەدانانە بە «هەفتەوانە» ناو دەبرێن. لەپاشاندا بەپێی پێویستی، خانەدانانی ذولنوور و ئاتەش بەگ و شاهەیاس و بابا حەیدەریش خرانە پالیان.

ئەم بنەمالانە، کە بە سەید ناسراون، تاکو ئێستایش لە نێوان میللەتی کورد جێی ڕێزن.

لەبەرئەوە ، ئەگەر شێخ ڕەزا لەو شیعرەیدا کە بە سەر کاکەییەکاندا هەلیداوە، بەهۆی دوو بەرەکیی نێوان ئەوان و عەشیرەتی تالەبانییەوە و لەبەرئەوە ی ئاداب و ڕێبازی کاکەییەکان تاکو ئێستا زۆربەی نهێنین، لەبەر نەزانینی ڕاستیی ئەو ڕێبازە، گەلێک بالۆرەیان بۆ ڕێک خستوون.

هەر لەبەر دەرخستنی هەندێ لەڕاستیی ڕێبازی ئەهلی حەق، کە کاکەیی بەشێکن لەوان، بەپێی زانینمان ئەمەمان ڕوون کردەوە. کە ئەوەی شێخ ڕەزا، لەبابەت ئادابی کاکەییەوە دەلێت ڕاست نییە. لەگەل ئەوەشدا شیعرەکانی شێخ ڕەزا، لەگەل هەموو ئەو بالۆرەیەی کە بۆ کاکەییەکانی ڕێکی خستووە، ڕەونەقی هونەری هەر هەیە. خوالێخۆش بوو، سید فەتاح ئاغای سەید خەلیل کە یەکێک بوو لە پیاوە ناسراوەکانی کاکەیی، گوێی بۆ شیعرەکانی شێخ ڕەزا شل دەکرد و هیچ دلگیر نەدەبوو. بەو هیوایەوە کە برا کاکەییەکان وەکوو هەموو ئەوکەسانەی بەر پەلاری هونەری شێخ ڕەزا کەوتوون و دلگیر نەبوون ئەوانیش دلگیر نابن.

تالەبانی، لەناوچەی لیوای کەرکووک، لەسەر حیسابی عەشیرەتانی ئەو ناوچەیە تەنینەوە و ڕوو بەروویان بوونەوە. لەوانە کاکەیی و داوودە و جەباری و هەمەوەند.. هتد.

شێخ ڕەزا دەڵێت:

چوار عەشیرەت، کاکەیی و هەمەوەند و جەباری و داوودە
ئیتیفاقیان کرد و هاتن چوار صەد و پەنجا سوار

شێخ ڕەزا لایەنگیری عەشرەتی خۆی و هەجوی ئەوانیتری کردووە لەم هەجوەی کاکەییدا دەڵێت:

بابان باشندە بر باطمان یشیل وار*
امام القوم فی تقسیم شەلوار
هەتانە هەر وەکو بیستوومە بەزمێ
لە ساڵێکا شەوێ یارانی دیندار
دەبەستن حەلقەیێ وەک عیقدی پەروین
لە جێگایەکی خاڵی لیس فیە دەییار
بەچۆکا دێ قوتەی مل نێرکە کاردو
وەکو و بولبول ئەخوێنێ وەعضی گوفتار
دەخوێنی مرثیەی مالووسی مەرحوم
یەکانەی گون ڕەش و گا حوولی شاخدار
وەکوو باران بەکلکی پیرە صەگدا
بەریشی دادەچۆڕێ ئەشکی خون بار
لە پاش ئیکمالی ڕەسم و ماتەم و شین
وەڕین دەس پێدەکا وەک کەلبی هەوشار
مەعاذەللا دەڵێ (یا ایها القوم)
درۆیە حەشر و نەشر و جەننەت و نار
لەگوێ مەگرن قسەی ئاخوونی شیعە
بە ئاشوین مەلای سەر لنگە دەستار
غەرەز لەم چرت و پرت و فاک و فیکە

* بابان.. جەمعی بابا، یان باوەیە. کە بە سەید ناسراون.

ئیطاعـەی ئەشقـیـایە و دەفـعی ئەشـرار
حلوولی مـەذهەبێکە بێ گـرێ و قـۆرت
تەناسـوخ ڕێگەیەکـە ڕاست و هەمـوار
بیحەمدیللا نەما (کاک ئەحمەدی شێخ)
زەهاوی مـرد و گـۆڕی گـوم بوو (چاومـار)
ئەگەر بێ (شێخ عەلی)ش دەفعولبەلا بێ
ئیـتـر دونیـا دەبێـتـە عـەینی گـوڵزار
بمینێ یا نەمـێنێ چی لەدەس دێ
بە تەنهـا (شێخ ڕەزا)کەی هەرزە گوفـتـار
ئەگـەر مـشـتـە و مـشـاریش بێ زمـانی
عـیـلاج دەکـرێ بەمـشـتێ پڕ لە دینار
بە دیناری عـیـلاج کـەن یان بە سـمـتی
بلووریـنی کـوڕێکی سـادە ڕوخـسـار
ئەزیزان مـەذهەبی یارانی جـەم جـەم
لەسـەر سێ ڕوکنە، ئەووەل: تەرکی ئازار
دووەم ئیکرامی ضـەیف و شـەرتی ثالث،
لە هەردوو عـومـدەتر کـیـتـمـانی ئەسـرار
ئەمانەش جوملە پەشمن ئەصلی مەقصەد
چوارە پێت بڵـێم ئەی پیـری هوشـیـار
شکسـتـەی جەوز و تولی سـەوز و کەڵبەی
بەرازی بۆز و کـەللەی خـوگی مـردار
ئەگـەر دەرچێ لەسـەر ئەم دینە ڕووحت
دەچێـتـە قـاڵبـێکی شـۆخ و نازدار
ضـەعیف بێ خوانەخواسـتە ئیعـتـیقادت
بە ئایین و بە ئەرکـان و بە ئەطوار

ئەگەی تەرسێک بەرِیشی خەلفە باپیر
ئەدەی گانێ لە رِێگەی (باوە یادگار)
شیاکەی کاوە حوول ئەگری لە رِیشت
ئەچێتە ژێر کولینی (دایە رِێزوار)
قەپۆزت دائەپۆشێ بەر سمێڵت
بەسەر ملتا ئەیێ وەک یاڵ کەمتار
لە قیبلەی (مستەفا) رِوو وەرئەگێرِی
لە رِێگەی شەرعدا ئەمری گوناهکار
لە پەشمی رِیخناکی بەر سمێڵت
ئەرِێسن سەرکەلە و دەسبەند و هەوسار
کە مردی رِووحی ناپاکت بە چوستی
لە ئینسانی ئەچێتە شەکلی سەگسار
وەرن یاران شەوی میعادە ئەمشەو
لە پێ دەرِپێ فرێدەن یار و ئەغیار
شەواڵی زەرد و سوور وەک خەرمەنی گوڵ
لەسەر مافووری زەرد رِووی کەن بەخەروار
شەواڵی خامەک و زەر بەفت و خارا
لەسەر یەک دابنێن وەک ماڵی توجار
کەنیز و خانم و خاتون و خادیم،
فەقیر و مونعیم و دەروێش و سالار
ئەدیم و نۆکەر و ئاغا و ئەفەندی
لە دەوری دانیشن وەک خەتتی پەرگار
لە ئەزمی بەزمی جەم ساقی بگێرِێ
شەراب و لێ بدا موطریب لە مزمار
ئەبیذ و شەربەت و نوقڵ و مەزە و مەی

دەف و تەمبوور و ساز و بربط و تار
دەبێ ئەم بەزمە هەر بەم نەزمە بڕوا
هەتا دوو حیصصە ڕابووڕێ لە شەوگار
کە دونیا بوو بە ڕووی قەیماس زەنگی
سەرەی بەشکردنی شەڵواره ئەمجار
بە قورعەی مەعدەلەت یەک یەک بەشی کەن
مەپرسن ئەقرەبا و قەوم و کەس و کار
مەپرسن دایک و پوور و خوشک و خوارزا
لەژێر کورکەی بەرن بێ قەول و گوفتار
مشالی قەولی باوە باوە و میرە میرە
میشالی کێر و کوز هەر وەک کون و مار
بەشەرعی مەزدەک و ئایینی بابەک
دخوولی جائیزە ئیسمی کونادار
(فهیا سادتی للواطء والنیک
لقد علمتکم تقسیم شلوار)
چرا پف لێ کەن و شێرانە هەستن
شەقێ هەڵدەن لە پەردەی عیصمەت و عار
سەرو دەرپێ بەرن بێ فەرق و تەمیز
مەپرسن ئەقریبا و قەوم و کەس و کار
شەواڵی هەرکەسێ بەر هەرکەسێ کەوت
ئیتر فەرقی نەکا، بیگرێتە بەر کار
کە ئەم وەعظەی تەواو کرد پیرە ئاخوون
ئیتر هەر پف لە شەمع و تف لە حەتیار
ئیتر هەر ئەتکی دین و کەسری نامووس
ئیتر هەر تەرکی شەرم و عەففەت و عار

ئیـــتـــر هەر لنگ ئەبێـــتـــە لام ئەلف لا

ئیـتـر هەر کـێـر دەبێـتـە باسکی هەوجـارِ

ئیـتـر هەر گـومـەزەی سـمـتـە دەسـوورِێ

بە سـوورەی سـەرخـرِا وەک چەرخی دەووار

ئیـــتـــر هەر لێ بەرینە و لێ خـــورِینە

بەرەو ژوور و بـەرەو ژێـرو بـەرەو خـــــوار

ئیـتـر هەر دایکە پیـرە و هەڵنـەنیـشێ

بە کـەللەی کـێـرەوە وەک ورچی سـەردار

ئیـــتـــر هەر پاوەنـەی زیـوە و زرەی دێ

لەبەر کـــوت پێـــوەدان ئەخـــشێ لە دیوار

ئیـتـر هەر خـەپلەیە وەک چاوی گـازەر

بەمـــەترەق دەیکوتـن ســـاداتی ئەبرار

ئیـتـر هەر ناوگـەڵی خـوویانی بیکرە

لە خـوێن سـوور دەبێ وەک بەرگی گـوڵنار

ئیـتـر هەر کـێـرە وەک پەیکانی گـۆشـتێن

بەژێر بنیـــا دەچێ وەک پەرِی ســوفـــار

ئیـتـر یاخـوا نەصـیـبی دوژمنت بێ

بـریـنـی نـێـــــزە و نـووزەی بـریـنـدار

لە وەصفی (کـاکـەیی) گـەر صـەرفی عومـرم

بکەم، ناکـەم بەیانی عوشـری مـیـعـشـار

عـــەمـــوودێکم هـەیە وەک توولی داوود

کـــوتامـــە ژێری کـــورکـــەی دایە رێزوار

تسـێکی کـەند بەرِیشی سـەی براکـە

ترِێـکـی دا بـە یـادی بـاوە یـادگــــــار

***

## شەڕی زەنگنە و هەمەوەند

زەنگنە و هەمـەوەند دوو عـەشـیـرەتی کـوردن، یەکـەمـیـان لە دێـیـەکـانی داوێـنی چیـای قـەرەداغـەوە تاکـو نزیکی شـاری کـفـری، لە لێـواری ڕووباری (ئاوە سـپی) و ڕێگای سولەیمانی - کفری جێ نشین. دووەمـیـشـیـان لەدێهاتی نێوان بازیان و چەمچەماڵ لە هەردوولای ڕێگای سولەیمانی - چەمچەماڵ خەریکی کشتوکاڵ و مەڕدارین.

لەبەر ئەوەی ناوچەی زەنگنە دەکەوێتە سـەرەڕێی هاتوچۆی کاروانی بازرگـانی لەنێـوان سولەیمانی و بەغدا و ئەم ڕێگایە، هەر لە (گەلی سەگرمە)وە تاکو نزیکی کفری بەناوی ئەم عـەشـیـرەتەدا تێدەپەڕێت، ئاغـاکـانی ئەم عـەشیرەتە سوودیان لەوە وەردەگرت و چەند کاروان سەرایەکیـان دروست کردبوو بۆ وچان دانەوەی ئەم کاروانی بازرگانییـە و هەروا بۆ پاراستنی ئەم کاروانانە دەستـەیەکی چاپوک سواری پرچەکیان ڕێک خستبوو و باجیان لە بازرگانان وەردەگرت و دەیانپاراستن.

هەمـەوەندەکـانیش، بۆ وەرگـرتنی باج ڕێگـیـریان لەم کـاروانانە دەکـرد و زۆرجـاریش تالآنیـان دەکردن لەمەدا لوتیان دەتەقـییـە لوتی سوارانی زەنگنە و زۆر جاریش لە نێوان ئەم دوو عەشیرەتە شەڕەنگێز و ئازایە شەڕی گەورە ڕووی دەدا و لەشکریان لەیەکتر دەکرد و شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە بنچینەیان دەچێـتە سـەر مەلا مەحموودی زەنگنە لایەنگیری ئەمانی دەکرد.

شاعیر و ئەدیبی ناسراوی کورد (پیرەمێرد) لە شیعرێکدا بەناوی (ولآتی هەمەوەند) باسی ژیانی ئەم کاروانانە دەکات و مەترسیی جەردە و باجی ئاغایان، کە دەڵێت:

هەر سـوارێک دەرکـەوێ ئەڵێی ئای جـەردەیە ئەوە
باج و پیـتـاکی زەنگنە، گـیـروگـرفـتی جـاف
هەچیش کـە هاتە ڕێی هەمـەوەند بردی سـاف و لەسـاف

لەشـیـعـرەکـانی شێخ ڕەزا ناوی چەند ئازایەکی ناودارانی زەنگنە و هەمەوەند هاتووە. لەمانە؛ برایم خانچی و فرود ئاغا و غەفوور ئاغا و جاسم ئاغا و کەریم ئاغا و ئەوڕەحمان شـەشـە لە عـەشـیـرەتی زەنگنە و لەناوی هەمـەوەندەکـانیش، فـەتاح و عـەزە مـوسم، «جەوامێر» کە پێشـەوایی عەشیرەتی هەمەوەندی کرد، کە حکومەتی عوسمانی دووریانی خستـەوە بۆ (بەن غـازی) لە لیبیا، لەوێوە بە شەڕ و تالآن دژی حکومەت و عـەشایەرانی

عەرەب، بە ماڵ و منداڵەوە گەیشتنەوە وڵاتی خۆیان.

باسی زیرەکیی برایم خانچی دەکرێت کە جارێک یەکێک لە میرزاکانی ئەردەڵان بۆ زیارەتی کەربەلا و نەجەف دێت و ڕێگای دەکەوێتە خانی برایم خانچی و زۆر لە خزمەتگوزاری مەمنون دەبێت و کە دەکەوێتە ڕێ، دەستەیەک لە شۆڕە سوارانی کوڕ و برازای سوار دەکات کە لە خزمەتی میرزادا تا سنووری وڵاتی زەنگنە بچن. میرزا دەپرسێت: «برایم خانچی، تۆ بەم گەڕ و بچووکییە کەچی کوڕەکانت لەشازادە دەچن، ئێمەی میرزادە کوڕەکانمان وا بەشان و شەوکت نین؟!» برایم خانچی لە وەڵامدا، «جەنابی میرزادە، ئێمە لێرە هەمیشە خەریکی خزمەتگوزاری میرزاکانی وەکو جەنابتانین و ئاگامان لە خێزانمان دەبڕێت. ئێوەی بەڕێزتانیش هەر خەریکی لەشکر ئارایی و ئیش و کاری دەوڵەتین و ئاگاتان لە خێزانتان نییە. وەکوو خێزانی ئێمە ڕەنگە بۆ میرزاکان بخرچێن، خێزانی ئێوەیش بۆ نۆکەرانتان دەخرچێن لەبەرئەوە کوڕانی ئێمە وەکوو شازادە بەشان و شەوکەت و کوڕانی ئێوەیش وەکوو نۆکەرانتان نابوود دەبن». میرزا سەری لەزیرەکیی برایم خانچی سووڕ دەمێنێ و خەڵاتی دەکات.

شێخ ڕەزا کە باسی ئەم شەڕەی نێوان زەنگنە و هەمەوەند ئەکات، وەکوو فیردەوسی لەشاهنامەدا باسی شایان و پاڵەوانان دەکات ئەویش وای دەگەیێنێت و دەڵێت:

(همــــاوەند) از بهـــــر ســـــازان و خــــان
شــــبــــیـــــخـــــون نمودند از بازیـان
تکـا پوی جـــولان بســـــرحــــد جنگ
در انجــــــــا بـهـم بـرزدنـد چـون پـلـنـگ

واتا:

هەمەوەند سەرلەبەر شەبەیخوونیان کرد
لە بازیانەوە بەشەو پەلاماری سالاران و خانیان دا و
هاتوچوو هەڵمەت گەیشتە سنووری شەڕ و
وەک پلنگ لەیەک بەربوون

پس از حـــرب و جنگ و جـــدال کـــشـــیــــر
ز خــــانچی بر امـــــد یـکی نره شـــیـــــر
فـــــرود امـــــد از اسب فـــــرزند زال

غــــفـــــور دلاور تهـــمتن مـــــثـــال
تـفـنـگی بـکمــــدار ازر کـــــشــــاسـپ
بــر آورد و بــنــهـــــــــاد بــر زیــن اسـپ
بـســــوراخ جـــاســـوس بر دوخت چشم
بـابــرو گـــــــره بـرزد از روی خــــــشم

واتا:
پاش جەنگ و هەرا و تێک ڕشانێکی زۆر
نەڕە شێرێک لە خانچییەوە هات
کوڕی زاڵ لە ئەسپەکەی دابەزی
کە غەفوری قارەمانی وەک توهمتەن بوو
تفەنگێکی وەک بروسکە بەپەلە دەرهێناو
لەسەر زینی ئەسپەکەی داینا
چاوی خۆی دوو بەکوی جاسوسەکەیا و
لە ڕق گرێ خستە برۆکانی

چـوانـگـشـت بـرپـای چقـــــــمــــــاق زد
تـو گـــــفــــتی کـــــه آتش در افـــــاق زد
چـو زد گــــوللـه برســــینه فــــتـــــاحـــــرا
بـدست اجـل داد مـــــفــــتـــــاحــــرا
بـخـــــــاک انـدر آورد ســـــــرچـنـگـنـه
نـه خـــــوب است پـرخـــــاش بـازنـگـنـه
چـو دیـدنـد ان گـــــــــونـه زحـم درشـت
ســـپـــاه مـــخـــالف نـهـــادند پـشـت

واتا:
کە پەنجەی نایە سەر چەغماغەی تفەنگ
ئەتوت ئاگری بەردایە ئاسۆ.
گوللەیەکی نایە سینگی فەتاحەوە
کلیلی دەرگای ژیانی دایە دەستی ئەجەل

سەری لە خاکدا گەوزاندەوە
هەرا لەگەڵ زەنگنە شتێکی باش نییە
کە سوپای ناحەز ئەم برینە گەورەیان دی
پشتیان پێ لە دوژمن هەڵکرد

گــــریزان زبیم ســــواران خــــان
تپش درلب و لـرزه در اســـتـــخـــوان
زجـنـگ آوران روی بـر تـافـــــتـنـد
بزی چند بـاخـــــویش پرداشــــتـند
تلف شـــد اگــر گـــوســـفندی دویست
بسی دیده برگـشـتــه ها خــون گــریست
اگـــــر گـلـهء چـنـد تـاراج شـــــد
بس کـلـه بـر تـیـــــزها تـاج شـــــد

واتا:
لە ترسی سوارانی خان هەڵات
تا مێسک لەسەر لێو لەرز لە ئێسقاندا
روویان لەشەڕکەران وەرچەرخان
چەند بزنێکیان لەگەڵ خۆیان برد
ئەگەر دوو سەد سەری مەڕ فەوتابێ
چاوێکی زۆر خوێنی بۆ کوژراوەکان ڕشت
ئەگەر چەند گەلە مەڕی بەتاڵان برابێ
کەللە سەری زۆر بەسەر نووکی نێزەوە بوو بەتاج

دلــــیـــــری شش آتش در آن کــــــارزار
شنیـــدم فـــرومـــانده اســـپـــدش زکـــار
پیـــــاده بر آویخت بـاســـر کـــشـــان
تفنگی بەکف داشت آتش فـــشـــان
امـین حـــــاجی آن بـرگـــزیده ســــوار
نـهـــان شـــد ز پـیـــچش بـتــاریک غـــار

دوید دریی او بغـــــــــار انـدرون
ربوده چو گـــرگ گـــشـــیـــدش بیـــرون
بضـــربی ســـر شـــرا زتن دور کـــرد
بسی چشم بدخـــواهرا کـــور کـــرد
گـــــــرو بـرده از بـهـلـوانـان پـیـش
بمردی (شـشـه) روسـتـم عـصـر خـویش
در انجـــا کـــه جـــولانگه (جـاسم) است
چهجـانی (فـتـاح) و (عـزه مـوسم) است

واتا:
قارەمانی شەس تیر (ئەورەحمان شەشە) لەومەیدانی جەنگەدا
بیستم ئەسپەکەی لە کار کەوتبوو
بە پیادە لەگەڵ سەرکێشەکاندا
تفەنگێکی ئاگر پرژێنی بەدەستەوە بوو
ئەمینی حاجی ئەو شۆڕە سوارە هەڵبژاردەیە
لەبەر پێچی سکی خۆی لە ئەشکەوتێکی تاریکدا شاردبووەوە
بە دوایا ڕای کردە نا و ئەشکەوتەکە
وەک گورگ فڕاندی و ڕایکێشایە دەرەوە
بەیەک شیر لێدان سەری لە لەشی کردەوە
زۆر چاوی بەدخوای کوێر کرد
(شەشە) کە ڕۆستەمی سەردەمی خۆیی بوو
گرەوی لە قارەمانی پێشوان بردەوە

هد آنکه ببـــیند جـــهـــان بخـــشـــرا
فـــرامـــوش کند رســـتم و رخـــشـــرا

واتا:
لەو شوێنەی کەمەیدانی جوولانی (جاسم) بوو کەی جێگای (فتاح) و (عەزە موسم)ە
ئەوەی لەوێدا جهان بەخش ببینێ
ڕۆستەم و ڕەخشەکەی لەبیر ئەچێتەوە

ســـپـــر بر ســـر آورد آغـــا (کـــریم)

بقلب سـپـــه تاخت بی ترس و بیم
بس پشت او تارسـیـــده پسـر
شنیـــدم همین کـفت با او پدر
تو کـــه آیدت از دهان بوی شـیـــر
کــه کـفـتـد بیـای بجنگ دلیـر
چنان پاســخش داد آن شـیــرزاد
کــه فــرزند چنین را زمــادر مــبــاد

واتا:

کریم ئاغا سەری لە سپێر دەرهێنا
بێ ترس و لەرز هێرشی برد بۆ ناو جەرگی سوپا
تا کوڕە گەیشتە پشت سەری
گوێم لی بوو باوکی پێی وت
تۆ کە هێشتا بۆنی شیر لە دەمتا دێ
کێ وتی وەرە ناو جەنگی قارەمانان
ئەو بێچوە شێرەیش وا وەڵامی باوکی دایەوە:
مناڵێ کە پشتی باوکی بەرەڵلا کا بۆ دوژمن با هەرگیز لەدایک نەبێ

کـــه پشت پدر را بـدشــمن دهد
همــان یەکـــه خـــودرا بـکشـتن دهد
تو گـــوی فـــرامـــرز من بیـــر نم
بـهـــر جنـگ پشـت و پـنـاهـت منـم

واتا:

دەبێت کوڕ خۆی بەکوشت بدات
توو وەکوو (فلامەرز ) و من (بیژەن)م
لەهەر جەنگێکا من پشت و پەناتم

وەکوو دەیگێڕنەوە، هەمەوەند لەشکر ئەکەن کە تاڵانی عەشیرەتی زەنگنە بکەن. لەبازیان بەشەو خۆیان ئامادە ئەکەن و بەرەو هەرێمی زەنگنە دێن. لەم شەڕەدا گەلێک لە پیاوە کەڵەمێردەکانی هەردوو عەشیرەت بەشداری و ئازایی دەنوێنن.

هەمەوەند چاوەڕوانی دەرچوونی ئاژەڵی زەنگنە ئەکەن و لەگەڵ دەرچوونیان بۆ لەوەڕاندن چەند مێگەلە مەڕ و بزن و تالآن ئەکەن. سوار و پیادەی زەنگنە ئەکەونە شوێنیان. غەفووری جاسم ئاغا بۆیان دادەنیشێ و بەگوللەیەک فەتاح ئاغای هەمەوەند ئەپێکێ و ئیتر لەشکری هەمەوەند تالآنی خۆیان ئەبەن و چەند کەسێکیان لێ دەکوژرێت. ئەوڕەحمان شەشە، کە یەکێک لە کەڵەمێردانی زەنگنە بوو ئەسپی نابێت و بە پا دێتە کۆڕی شەڕەوە. ئەمینی حاجی هەمەوەند خۆی ئەکوتێتە ناو ئەشکەوتێک و ئەورەحمان شەشە، بە خەنجەرێکەوە بۆی ئەچێتە ژووری و هەرچەنێک ئەمینی حاجی چەند دەمانچەیەکی پێوە دەنێت بەڵام ناپێکێت و لەوێ ئەمینی حاجی دەکوژێت و بەمە شەڕ کۆتایی دێت.

***

### شێخ ڕەزا و ئێڵی جاف

**ئێڵی جاف:** ئێڵی جاف ئێلێکی زۆر گەوەرەیە، هەرچەنێک ئێستا زۆریان لەناو سنوری عێراق و ئێراندا نیشتەجێ و بەکشتوکاڵەوە خەریکن، بەڵام هەر نیو صەدە لەمەوپێش زۆربەیان کۆچەر و لەنێوان قزرەبات (سعدية) و تا دەگاتە سنە و سابلاغ گەرمیان و کوێستانیان کردووە و ئاژەڵێکی زۆریان بۆ لەوەڕی نوێ لەم نێوانەدا لەوەڕاندووە.

لە یەکەم جاردا کە لە پەیمانی نێو دەوڵەتیدا ناوی ئەم ئێڵە هاتبێ لە پەیمانی شاە صەفییوددینی صەفەوی کە لەگەڵ سوڵتان موورادی چوارەمی عوسمانی، لە ١١ی موحەڕەم ١٠٤٩ی کۆچیدا بەستراوە. باسی ئێڵی جاف دەکات. جاف لە ڕێگای کۆچەریدا تووشی گێچەڵێکی زۆر دەبوون و گێچەڵێکی زۆریشیان بە ئێلانی گەرمیان و کوێستانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور دەکرد. ئەو وتەیە بەناوبانگە کە دەڵێن: «من مێی خۆم لێرە ئەلەوەڕێنم تۆ دەغڵی خۆت بگوێزەرەوە» لەبەرئەوە حکومەتانی ئێران و عوسمانی لەم گەرمیان و کوێستانەی جافدا تووشی سەرئێشەیەکی زۆر دەبوون.

وا دەردەکەوێت وشەی «جاف» لەناوی ئێڵی (جاوان = جافان)ەوە هاتبێت هەرچەنێک لەشەڕی نێوان ئێران و عوسمانیدا کە بەدابەش کردنی کوردستان کۆتایی هات، ئێڵی جاف لایەنگیری عوسمانی گرتووە، بەڵام لەکاتی میری کەیخەسرە و بەگەوە بەتایبەتی لەدەوری حەمە پاشاوە ئەم لایەنگیرییە، بۆ مسۆگەر کردنی هاتوچۆی نێوان هەردوو حکومەت، کز بووە، ئەمەیش بووەتە هۆی کوشتنی حەمە پاشا لەلایەن تیرەی

میروەیسییەوە کە لە هاندانی عوسمانییەکانەوە دوور نییە. لەپاش کوشتنی حەمە پاشا، هەرچەنێک سوڵتانی عوسمانی دەستەڵات و سەرۆکی مەحموود پاشا و وەسمان پاشای بەسەر ئێلدا سەلماندووە، بەڵام وەکو میرنشینانی تری کوردستان، عوسمانی بۆ لەناو بردنی دەستەڵاتی ئەمانیش دریغی نەکردووە، هەتا جارێک مەحموود پاشا لە ئەستەموڵ هەست بەوە دەکات، بەنهێنی بەرگی دەروێشی دەپۆشێت و هەڵدێتو لەرێگای «باکۆ»وە دەگەرێتەوە کوردستان.

بەگزادەی جاف خۆیان بە نەوەی پیر خدر شاهو دەزانن. وەنەبێ تەنها ئەم تیرەیە ناوی بەگزادەیان لێ نرابێت، تیرەی تریش هەن کە بەگزادەیان پێ دەڵێن، وەکو بارام بەگی و وەلەد بەگی و کەیخەسرە و بەگی.

تیرەکانی جافی ناو سنووری عیراق ئەمانەن: تەرخانی، شاتری، میکائیلی، کەماڵەیی، رۆغزایی، عیسایی، هارونی، دەداخی، تیلەکو، یەزدان بەخشی گاکولی، سادانی، صوفی وەن، زردوویی، تاوەگۆزی، نەجمەددینی، گەلکەنی، میر ناصری، شێخ سمایلی، جنکنی.. هتد. جافانی ناوچەی زەهاویش، جوانرۆیی، باوەجانی، قبادی، ئیناخی، وەلەد بەگی، میروەیسی و یار ئەحمەدی.. هتد.

شێخ رەزا دۆستییەکی قووڵی لەگەڵ میرانی جافدا و بەتایبەتی لەگەڵ وەسمان پاشا و مەحموود پاشادا هەبووە. هەمو و ساڵێک چەند جارێک سەردانیانی کردووە و ماوەیێک لە کۆشک و دیواخانیاندا لەگەڵ بەگزادەی جافدا رایبواردووە. ئەوەی شایانی سرنجە، شێخ رەزا، لەمەیدانی گاڵتە و گەپدا نەبێت، هیچ هەجوی بەگزادەی جافی نەکردووە.

مەحموود پاشا هەست دەکات کە شێخ رەزا وەسمان پاشای لە هەموو پتر خۆش ئەوێت و رۆژێک پێی دەڵێت؛ ئەگەر هەجوێکی وەسمان پاشا بکەیت یەکێک لە دێیەکانی خۆمت پێ دەبەخشم. شێخ رەزا لەوەڵامدا بە بەیتێکی فارسی دەڵێت:

من حـــقـــوق نعم دولت عـــوســـمـــانیـــرا
نفـروشم بهـــمـــه حـــشـــمت سلطان مـــحـــمـــود

لێرەدا مەبەستی لە «عوسمانی» و «سلطان محمود»، عوسمان پاشا و مەحمود پاشای جافە.

واتا:
من حەقی نیعمەتی دەوڵەتی عوسمانی

نافرۆشم بەهەموو جاهو حیشمەتی سوڵتان مەحموود

میرانی جاف بەرامبەری شێخ ڕەزا دەس کراوە بوون. شێخ ڕەزا باسی بەخششیان لە شیعرێکی فارسیدا دەکات و دەڵێت:

حق شناسم ندهد از کف دامن و صـــافـــرا

آل برمک یافـــتم بگ زادهایی جـــافـــرا

خــواســتم در مــدح ایشــان قطعــهء انشــا کنم

خــامــه گــفــتــا کــه‌ی توانم شــرح این اوصــافــرا

گــر قــیــاسی جــودشــان با (حــاتم طائی) کنی

فــرق بس باشــد ازینجــا تابه کــوی قــافــرا

واتا:

بەگزادەی جافم وەک ئالی بەرمەک هاتە بەرچاو

ویستم پارچە شیعرێ لە تاریفیانا دانێم

قەڵەم وتی: کەی ئەتوانی باسی ئەم وەسفانە لێک بدەمەوە!

ئەگەر بتەوێ قیاسی سەخاوەتیان لەگەڵ حاتەمی تەی بکەی

فەرقیان زۆرە لێرە و تا کێوی قاف

کەچی لەلایەکی تریشەوە لە دەسکاری کردنی شیعرێکی فارسی (حافظی شیرازی)دا باسی ڕەزیلیی مەحمو پاشا دەکات و دەڵێت:

مگر یزدان کند کـشف کف (مــحــمــود پاشــا) را

کـه کس نگشــود و نگشـاید به حکمت این مـعـمـارا

بەدەست کــونه و لقی گــەر ببــیند صــورتی جلقی

(چنان برباید از دسـتش کـه ترکـان خـوان یغـمـارا)

واتا:

مەگەر خوا خۆی ناولەپی مەحموود پاشا هەڵبێنێ چیی تیایە

ئەگینا کەس ئەم مەتەڵەی هەڵنەهێناوە و هەڵی ناهێنێ

ئەگەر وێنەی جلقێ لە دەستی کۆنە

وای لە دەست ئەفرێنێ وەک تورک خوانی تالانی ئەفرێنێ

هەر کە تورەیشی دەکەن؛ دەڵێت:

جاف و جیف و جاتره          صەگ لە جافان چاتره

وەکو وتمان ئێلی جاف لە کۆچی گەرمیان و کوێستاندا لووتیان ئەتەقایە لووتی هەندێک بە ئێڵەکانی کوردی ناوچەی مەریوان و موکریدا و هەندێ جاریش تووشی شەڕی گەورە دەبوون. جاف لەم شەڕانەدا، لە ماڵ و منداڵ و ئاژەڵ بەولاوە هیچیان نەبوو کە پارێزگاری بکەن، لەم شەڕانەدا خێزان و ئاژەڵیان دەرباز ئەکردو دەستی خۆیان ئەوەشاندو دەگەڕانەوە. یەکێک لەم شەڕانە شەڕی نێوان جاف و ئێلی فیزوڵڵا بەگیی ناوچەی موکریانە، کە شێخ ڕەزا لە شیعرێکیدا باسی دەکات و لایەنگیری ئێلی جاف دەگرێت و دەڵێت:

خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا
مێروولە نەچێ چاکە بە گژ قوللەیی قافا
کێ بێ لە دلێرانی عەشایر کە نەچوو بێ
وەک تیری ئەجەل نووکەر می جافی بە نافا
خوێنرێژ و شەڕەنگێز و عەدوبەند تەنومەند
کامیان کە گەنە، شێرە لە مەیدانی مەسافا
چونکە ڕەسەنی وردودرشتیان هەموو جەنگێن
مەی ساریە نەشئەی چە لە دوردا چە لە سافا
وا بێ غەم و پەروا دەچنە عرصەئی هەیجا
تو ناچییە سەر دۆشەکی بووکێ لە زەفافا
(یبغون الی الامر صغارا وکبار
یسعون الی الحرب ثقالا وخفافا)
وەسمان بەگیان ئامیرە وەختێ کە بلێ: دەی
دێنە جەوەلان هەر وەکو حاجی لە تەوافا
خواهم زخدا آنکە شود دشمن جاهت
کۆتی لە دەسا دەس لە ملا مل لە تەنافا
لوتفێ بکە با (شێخ ڕەزا) بێتەوە گوفتار

حەیفە بڕژێ تیغی موجەوهەر لە غیلافا

ئێڵی فەیزوڵلا بەگیش گەلێک پیاوی ئازا و کەڵەمێردی بەناوبانگیان تێدا هەڵکەوتووە. کاتێ ئەم دوو ئێڵە گەورەیەی کورد، جاف و فەیزوڵڵا بەگی، لە دێهاتی سەقز و بۆکاندا بەیەکدا چوون، لە هەردوولا کوشتار و دیل بووە. جاف دەستی خۆی وەشاندووە و لەو ناوچەیە دوور کەوتووەتەوە و خۆی بەسەرکەوتوو داناوە و فەیزوڵلا بەگیش توانوویانە جافی کۆچەر لە دێهاتی خۆیان دەرپەڕێنن و ئەمەیان بەسەرکەوتن داناوە، هەرچەنێک لە نێوان کوردستانی بن دەستی حکومەتی قاجاری و کوردستانی بن دەستی حکومەتی عوسمانی سنووری دەوڵەتی هەبووە، بەڵام کورد ئەم سنوورەی نەسەلماندووە و نەبووەتە بەربەست کردنی هاتوچۆیان. سەرۆکی ئەو سەردەمەی فەیزوڵڵا بەگی (حاجی سەلیم خان) دەستی شاعیریی بووە، لەسەر هەمان کێش و قافیە و هەر بە وشەکانی شێخ ڕەزا وڵامی دەداتەوە و دەڵێت:

(شێخ) نەیبستووە چەند ساڵێ لەمەوبەر لە مەسەفا
هەر جافە چووە نووکی ڕمی موکری بە نافا
تیپی عەدوو وەک پۆلی قولنگ ئەو وەکو شەمقار
تێکی دەشکاند یەک یەک و ئەیخست لە مەسافا
(شێخ) بێخەبەرە لەم قسە مەشهوورە لە ئافاق
حەربە و ڕمی ئەو بوو بەجێ ما لە غیلافا
هەر ئەو کوڕە جافە بوو لەبەر چودبی دلێران
نالینی دەهات هەر وەکو بووکێک لە زەفافا
زۆر کەس لە جەوانانی ئەوان بوو بە ئەسیر هات
دەست بەستەوو تەنێ خەستەوو گەردن لە تەنافا
چاک وایە نەکات مەدحی ئەوان نەک بڵێ مونسیف
ئەم مەدحە کە فەرموویەتی (شێخ) لاف و گەزافا
بۆ مەدحەییان کافییە (شێخ) بێت و نەزەر کات
مەعلوومە کە مەعنای لە لوغەتدا چییە (جافا)

بێگومان وەکو حکومەتی عوسمانی لەشەڕی برا کوژی دوو ئێڵی گەورەی کورد وەکو

جاف و فەیزوڵلا بەگی دەس خۆشی لە ئێلی جاف کردووە، ناسرەدین شای قاجاریش سوپاس و دەسخۆشی لە ئێلی فەیزوڵلا بەگی کردووە بەرامبەر ئەو سەرکەوتنەی بەسەر ئێلی جافا. ئەم سوپاسنامەیە لە ساڵی ١٨٦٥ی زایینە. (نامەیەکی مێژوویی بۆ شێخ ڕەزای تاڵەبانی و هەواڵی تازە - محەمەد حەمە باقی - گۆڤاری مامۆستای کورد ١٩٩٥ - سوید)

ڕۆژێکیان شێخ ڕەزا بەمیوانداری دەچێتە لای وەسمان پاشا. پاشا فەرمان دەدات کە کەس بۆ کار و باری عەشیرەت نەیەتە لای چونکە شێخ ڕەزا لێرەیە و ئیمشەو بەزمان بۆ دەگێڕێ. شێخ ڕەزا موتریب نییە بەزم بگێڕێت و دەڵێت:

ئەسبابی طەرەب زیل و بەمە ئەی بەگی جافان
بەزمێ بگێڕین چاکە لەمن زیل و لەتو بەم

زیل و بەم دوو ئالەتی موسیقان، لە وتەی (لەمن زیل و لەتو بەم) دوو مەعنا دەگرێتەوە. یان من (زیل) لێ دەدەم و تو (بەم) لێدە، یان «لەتوو بەم» بەو مەعناکەی تریەوە دێت.

***

## عادیلە خانمی خێزانی وەسمان پاشای جاف

عادیلە خانمی خێزانی وەسمان پاشا لە میرزاکانی ئەردەڵانە. خانمێکی زیرەک و بە هۆش و بیروڕا ورد و بەڕێوەبەری کاروباری عەشیرەت بوو. لەپاش کۆچی دوایی وەسمان پاشا، بەعەقڵ و دەستەڵات، لەناوچەی هەڵەبجە و شارەزووردا سەرۆکی عەشیرەتی جافی وەرگرتە دەستی خۆی و بەرامبەر ئەوە حکومەتی بەریتانیا، کە هێشتا حوکمداری ئەو ناوچەیە بوو، لەقەبی (خان بەهادور) کە دەدرایە راجاکانی هیندوستان و هاوتای لەقەبی (سێر)ی ئینگلیزییە، پێی بەخشی. خانم هەمیشە دیواخانی یانەی ڕۆشنبیران و شاعیران و ئەدیبان بوو. لەپاش مردنی وەسمان پاشا ئەو دۆستایەتییەی لەگەڵ شێخ ڕەزادا هەر پاراست و شێخ ڕەزایش ئەو ڕێزەی بەرامبەری هەر بەردەوام بوو.

جارێ خانم گفت دەداتە شێخ ڕەزا کە هێسترێکی بۆ بنێرێت. بەڵام هێستر لەپێش ناردنی دەتۆپێت. دەیەوێت سەر بنێتە سەر شێخ ڕەزا و لێی دەپرسێت، ئایا هێستری زیندووی دەوێت یان هێستره مردووەکە. شێخ ڕەزا بەم شیعره وەڵامی دەداتەوە:

ئێســـتـری زیندوو بڵــێم، بۆم چاکــە، یا مــردووم دەوێ*
ئیــحـــتـیـــاجـیـم زۆرە خـــانم با بڵـــێم هەردووم دەوێ
بێــچــووەکــانم ســەر لەســویحــەینێ هەمــوو دەورم دەدەن
ئەو ئەڵــێ پــوولــم نــەمـــــاوە ئەم دەڵــێ بـێ چووم دەوێ
با و جــوودی ئەم هەمــوو تەکلیــفــە گــێــژیان کــردووم
کــوڕ خــەیاڵــی ژن ئەکــات و کچ دەڵــێ مـن شــووم ئەوێ

* «هەر دووم دەوێ» دوو مـانای هەیە، یان بە مـانای هەردوو هێسـتـر، زیندوو و مـردوو، بەڵام شێخ ڕەزا هێستری مردووی بۆچییە؟! لێرە مەبەستی هەردووی خانمە. خانمیش وەکو وەسمان پاشا بەچاوی هونەرمەندانە گوێ لە شیعرەکانی شێخ ڕەزا دەگرت.

مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ دەیگێڕێتەوە دەڵێت: خانمی خێزانی وەسمان پاشا هەموو ســاڵێک دیاری و خــەڵاتێکی زۆری ناردووە بۆ شــێخ ڕەزا. وا دەرئەکــەوێ ئەو ســاڵە دیارییــەکــەی دواکــەوتووە. لەبەر ئەوە شـێخ ڕەزا ئەیەوێ پەلارێک بهـاوێ بەڵام ڕێزی بەرامبەر عادیلە خانم ڕێی نادات بیگرێتە ئەو ناچار پەلارەکە ئەگرێتە نووسەری خانم کە مەلا محەمەدی سنەیی بووە و ئەم شیعرە فارسییەی بۆ ئەنێرێت:

کـجـا شـد آن کـرامـتـهـای دیرین
کــجــاشــد آن عناتهـــای پیـــشین
نەگــاهی پرســدم پاشــا نه خـــانم
نەیادم مــیکند خـســرو نه شـیـرین
از این جـانب نمیدانم سـبب چیـست
از این جـــانب مگر مـــلای بی دین
نتـــــرســـــد از زبان اتشـــــینم
جــعلناها رجــومــا للشــیــاطین

واتا:

بۆ کوێ چوو پیاوەتییەکانی جاران
کوا بە تەنگەوە بووەکانی پێشوو
نە جارێ پاشا لێم ئەپرسێ و نەخانم
نە جارێ خوسرەو یادە ئەکاو نە شیرین

هیچ هۆیەک نابینم لەلای پاشاوە و خانم
مەگەر هۆ هەر لەلای مەلای بێ دین بێ
بۆ ناترسێ لە زوبانی ئاگرینم
کە دام ناوە بۆ ڕەجمی پیاو خراپان

کەسێک نابێت وەڵامی شێخ ڕەزا بداتەوە. لەوکاتەدا حاجی تۆفیقی مەحمود ئاغا کە تەحسیلدار نەبێت پەیدا نەبێت. شیعرەکانی شێخ ڕەزای بۆ دێنن کە وەڵامی بداتەوە. پیرەمێردیش ئەم شیعرەی بۆ ئەنووسێت:

رضـای تلخ کـامت خـواند شـیـرین
دهانش ریش باد آن مـردی کج بین
که کی خسرو به کیخسرو شبیه است
کـجـا شـیـرین بود چون حـوری عین
تو آن جـوری کـه از پاداش نیکی
مـلا مـحـمل کش و نادر ندیم است
رضـا نبـود کـه خـوانندش شـیـاطین

واتا:
ڕەزای دەم بۆگەن (ئەی خانم) تۆی کرد بەشیرین
دەمی داوەشێ ئەو مەردوومە کە چ بینە کەوا ناوی خانم بەشیرین ئەبات
لەکوێ خوسرەوی پەروێز ئەبێ بەکەیخوسرەوی کەیانی،
لەکوێ شیرینی دڵداری خوسرەو ئەبێ بە حۆری عین.
تو ئەو حورییەیت، کە لەپاداشی چاکیدا، لە بەهەشتەوە هاتوویت
مەلای نووسەری خانم کەژاوە ڕاکێش و هاودەمێکی نایاب و یەکتایە
ڕازی نییە کە پێی بڵێن شەیتان
(شێخ محەمەدی خاڵ - گۆڤاری کۆڕی زانیاری - ١٩٨٧)

***

## شێخ ڕەزا لەشاری کۆیێ

**مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە:** شێخ ڕەزا شاری کۆیێی خۆش ویستووە. لە سەردەمی

فەقێیەتیدا بەشێکی ژیانی لەکۆیێ لەلای مامۆستای دانا مەلا ئەسعەدی جەلی زادە خوێندوویەتی و رێزێکی زۆری بەرامبەر ئەو بنەماڵەیە هەیە. لەپاشان بۆ جارێکی تری لە کەرکووکەوە بە تۆراوی هاتووەتە کۆیێ، بەڵام لەگەڵ شێخ غەفووری مامی و شێخ ڕەشیدی ئامۆزای نەگونجاوە و بە پەشیمانی گەڕاوەتەوە کەرکووک. دڵگیری لە خزمانی خۆی لە کۆیێ بووەتە هۆی بێزاری و هەندێ جنێویش بە کۆییەکان بدات. بەڵام ڕێزی بەرامبەر مامۆستایانی جەلی زادە هەر ماوە و بەتایبەت بەرامبەر مەلا عەبدوڵلا.

مەلا عەبدوڵلا کوڕی حاجی مەلا ئەسعەدی حاجی مەلا عەبدوالڵای جەلییە.

لەساڵی ١٢٦٠ لەدایک بووە و لە دەوری هەرزەکاریدا لەلای باوکی و لەپاشان لەلای مەلا موحەمەدی خەتێ خوێندوویەتی. زۆربەی ژیانی بەمامۆستایی رابواردووە و لە ساڵی ١٢٩٢ چووەتە بەغدا و زۆر جێی ڕێزی موفتی زەهاوی و زۆربەی داناکان بووە. لەیەکێک لە گفتوگۆ دیبلۆماسییەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران؛ نوێنەری عوسمانی بووە و لەکارەکەدا سەرکەوتووە. شێخ ڕەزا لەشیعرێکی فارسیدا ڕێزی خۆی دەردەبڕێت و دەڵێت:

عیب در ذات تو ای کان کرم معدوم است
مگر این عیب که لحم علما مسموم است
شعر من در همه سو از همه کشور ساری
علم تو در همه جا برهمه کس معلوم است
میرود شعر من و علم جهانگیر شما
هردو بی فائده، تا جای اقامت روم است
نامه بنویس بهر طرز دلت میخواهد
همه سحر است، اگر نثر و اگر منظوم است

واتا :

ئەی کاتی بەخشش خەوش لە شەخسی تۆدا نییە
تەنها ئەوە نەبێ کە گۆشتی زانایان ژاراوییە
شیعری من بە هەموو لایەکی هەموو وڵاتێکدا ڕۆییوە
زانستی تۆیش لەلای هەموو کەس دیارییە
شیعری من و زانستی جیهانگیری ئێوە

هەردوو بێ سوودن تا شوێنی دانیشتنمان ولاتی ڕۆم بێ
به هەر جۆرێ دڵت نارەزووی لێیە نامە بنووسە
هەمووی هەر جادووە ئەوەی ئەینووسی؛ چ شیعر و چ پەخشان

دانیشتوانی کۆیێ بە زیرەکی و قسەزانی ناوبانگیان دەرچووە. ئەوەی لە ناویاندا بژێت دەبێ لەوان زیرەکتر بێت ئەگینا دەری دەپەڕێنن. شێخ ڕەزا دەڵێت:

حاجی عەبدوللا لە ئادەم فیلترە
باوجودی مەرتەبەی پێغەمبەری
ئەم بەصەد شەیتان لە کۆیێ دەرنەچوو
ئەو بەشەیتانێک لە جەننەت دەرپەڕی

***

## شێخ ڕەزا و قاضیی کۆیێ

لە کردەوەیەکی قازیی کۆیێ، شێخ ڕەزا وای پێ گەیشتووە کە غەدری لە (لامیع ئەفەندی)ی دۆستی کردووە. لەبەرئەوە هەجوی قازی کۆیێ دەکات و دەڵێت:

شێخ (ڕەزا) بێت و لەسەر تو هەجوی قازیێ کۆیی بکا
سەیری کە چیی پێ بکا دۆم بێ و کلاشی بۆ خۆی بکا
چونکە غەدری کرد لە (لامیع) شەرت بێ قازی وا بگێم
هەر گەن و گوێێ لە زگیایە بە جاری ڕۆی بکا

شێخ ڕەزا کە باسی دلبەرانی شاری کۆیێ دەکات دەڵێت:

شاری کۆیێ کە لە بالەب لە بۆنی غونچەلەبە
گەر فەلەک لێی بگەڕێ، مەنبەعی عەیش و تەرەبە
دلبەرانی بە مەسەل هەر وەکو ئەشعاری منن
کامی لێ ئەگری ئەبێژی ئەمەیان مونتەخەبە

کەچی کە ڕقی لە کۆیییەکان هەڵدەستێ ئەڵێت:

دەوری وەسمان بەگ لە کۆیێ ژن نەما نەیگێن بەبە
نسبەتی کۆیی لەگەڵ من نسبەتی ئیبن و ئەبە

ئەلغـــــەرەز ســــــۆزانی یـو زانـی لە کــــــۆیی چاتـرە
مـوختـەسـەر چاکـە قـسـە، کـوونی ببـە کـۆیی مـەبە

کە پتر ڕقی هەڵدەستێت ئەڵێت:

هەرکـەسێ ئەصل و مـیـزاجی فـیـتنەیی و بەد گـۆییـیـە
دەسـتی حـیـزیشی هەبێ ئەمـجا بەتەحـقـیق کـۆییـیـە

وادیارە داندۆکی لەگەڵ موفتی کۆیەش نەکولاوە و ئەڵێت:

مـــوخـــبـــیـــر خـــەبەری داوە لەســـەر مـــوفـــتی کـــۆیە
حـەسـرەت کـەشی شـیــری صـەگ بۆ کـەوچکە دۆیە

***

## لەگەڵ سمایلی مەلا خالد

گەلێک تەقەللام دا تا بزانم ئەم سمایلی مەلا خالیدە کێیە، نە خەلقی کەرکووک و نە خەلقی سولەیمانییە. ئەوەی کە گومانی تێدا بێت، دەبێت خەلقی کۆیە بێت و شێخ ڕەزا ئەمەی پێ دەڵێت:

هاتەوە ئـاشـــوبی دەوران مـــەردی مـــەیدان هاتەوە
شـێـــری یەزدان، لەندەهۆری ئـیـبنی سـەعـدان هاتەوە
بۆ قـــڕانی لەشکری ئەعـــدا لەناکـــاو مـــیـــثلی بەرق
ئەصـــغـەری صـــاحـبـقـڕان و لەعلی خـەفـتـان، هاتەوە
هەوری مـیـحنەت باڕەشی غـەم سـەیلی مـاتەم بۆ ئەفـام
بەرقی تابان، مـیـهـری ڕەخشـان، ڕەعـدی غـوڕڕان، هاتەوە
پاڵەوانی پایی تەخـتی صـــەفـــدەری شـێـــرزاد خـــان
تاج بەخشی، کـیـشـوەری، مـەغـریب آلوب خـان هاتەوە
سـەعـدی صـــەفـدەر، مـــالکی ئەژدەر، هوزەبری پرهونەر
بێـــژەن و گـیــوو، طوس و ئەوزەر، پوری دەســتـــان هاتەوە
حـــەمـــدولیللا باز لە بۆ قـــەتلی ســـەری تۆرانیــــیـــان
ڕۆســـتـــەمی مـــازەندەران، ســـامـی ئەریمان هاتەوە

ژێر دەستی ئەسعەد ئاغا بووین وەکو مووری زەعیف
بۆ خەلاسیمان سمایل وەک سولەیمان هاتەوە
دۆستان لەب تشنە بوون ناگاه لە فەیزی لوطفی حەق
جۆیی (نیل) دەریایی (قیلزەم)، بەحری (عەممان) هاتەوە
(لامعی) شاعیر بەهەر مەجلیس بچێ، خەڵکی دەڵێن
بولبولی دەستان سەرا، مورغی غەزەل خوان هاتەوە

***

## شێخ ڕەزا و فەتحوڵڵا کەیفیی جوانڕۆیی

فەتحوڵڵا کەیفی جوانڕۆیی هاودەمی شێخ ڕەزا و حاجی قادری کۆیی بووەو لەلای مەلا ئەسعەدی جەلی زادە خوێندوویانە. کەیفیش شاعیر بوو و لەگەڵ شێخ ڕەزادا هەجوی یەکتریان کردووە. لە شیعرەکانی کەیفی ئەمە ئەخەینە پێش چاوی خوێندەوارانی ڕێزدار: لە غەزەلێکدا دەڵێت:

ئەم دڵ ڕەقی بێ ڕەحمە فەرەنگێکی تەواوە
عەینی شەڕە، جێ فیتنەیە قوربان بڵێی چاوە
قەوسی بەسویەر کردووە گرتوویەتە دەستی
صەد خەنجەری خوێنرێژ و دوو صەد تیری سواوە

ئەوەی زانراوە، کەیفی نەیتوانیوە وەکوو شوکری پەنجە لەگەڵ شێخ ڕەزا بدات و مامۆستا مەلا ئەسعەدی جەلی زادەیش ڕێگای بە کەیفی نەداوە جینۆ و بە شێخ ڕەزا بدات و لەسەر ئەوە کەیفیی دەرکردووە.

شێخ ڕەزا لە بەیتێکی فارسیدا ئەمە بە کەیفی ئەڵێت:

شاعیر چو توی بلب لبانت ریدم
واز فرق سرت تا بدهانت ریدم

واتا:

شاعیر کە تۆ بی بڕیم بە قەراغی لێوەکانتا
لە تەوقی سەرتەوە تا دەمت پیادا بڕیم

کەیفیش لە وەڵامدا دەڵێت:

فـــــرقـی نبــــود بمیـــــان فــــرق و کـــیــــــرم
ای ریـدی بـەکــــــیــــــرم کـــــوزت بـکـیـــــرم

واتا:

جیاوازی نییە لەنێوان تەوقی سەرم و کێرما
ئەی ئەوەی ڕیای بەکێرما تڕت بە کێرم

***

## شێخ ڕەزا و شێخ غەفووری مامی

شێخ غـەفـووری کـوڕی شـێخ ئەحـمەدی تاڵەبان کـوڕی مـەلا مـەحـمـودی زەنگنەیە. لە کوڕانی شێخ ئەحمەد تەنها شێخ عەبدولڕەحمان، لە کەرکووک بووە پوست نشینی تەکیەی تاڵەبانی، ئەوانیـتر بڵاوەیان لێ کرد و شێخ غـەفوور، لە کۆیێ لقێکی تەکیەی تاڵەبانیی کـردەوە و بەهۆی ئەم تەکیـەوە، سوڵتـانی عـوسـمـانی چەند دێیـەکی بەناوی «ئیـطعـامی فوقەراء» دایە و توانی سامانێکی باش بنێتە یەکەوە.

شـێخ ڕەزا، لە پاش کـۆچی دوایی شـێخ عـەبدولڕەحـمـانی بـاوکی، لەسـەر پێـویسـتی گـوزەران، لەگـەڵ شـێخ عـەلیی کـاکی تێک چوون و بە تۆراوی چووە لای شـێخ غـەفـوری مـامی، بۆ ئەوەی هەندێ پارەی لێ وەرگـرێت و بچـێت بۆ ئەسـتـەمـووڵ. شـێخ غـەفـوور نەیویسـتـووە، برازاکـەی، بەسـەرگـەردانی بکەوێتـە وڵاتانی غـەریبی! و لە کـۆیێ گلی دەداتەوە و شەش مانگ میواندارىی دەکات و گفتی ئەوەی دەداتێ کە کچی خۆی لێ مارە کات و پێویستی گوزەرانی بۆ جێبەجێ بکات. شێخ ڕەزا ئەمەی پێ خۆش دەبێت و بڕیار دەدات ئیتر نەچێتەوە کەرکووک.

بەم حـاڵە ئەگـەر دەفـعـەیێ تر بچـمـەوە کـەرکـووک
مـــعلـومــــە بە مـــەردی ئەڕواوە لـەســــەرم تووک
بۆچ بچـمـەوە کـەرکـوکی قـوڕمـسـاغ کـە لەگـەڵ من
ئەهلی هەمـــوو ناســازە وەکــو ئاوی حـەمـامـۆک
پێم خــۆشــە لەبەر جـــەوری براو لۆمـــەیی ئەقــوام
صــەد جـار لە غــەریبی بکەوم مـوفلیس و مـەفلوک

ڕۆژێ بە مــــرادی منیش ئەڵبـــەت دەگـــەڕێ چەرخ
ئەم مــیـچـە قــەراری نیــیـە گـاهی جگە گـەه بووک*
شـــاهی کـــە نەبێ، ڕادەبوێرین بە فـــەقــیـــری
بۆ ئەهلی قـــەناعـــەت لە پلاو و خـــۆشــتـــرە داندووک
شــەش مـــانگە زیاتر کـــە لەپاش مـــەرگی پدەر، من
مــەغــدوورم و مــەظلووم و جـەفــادیدەوو مـەهتــووک
تا ســاکنی کۆی مـامــە غـەفــوورم، وەکــو فــەغــفــوور
کـــیـــــســـــەم پڕە دایم لە زەڕو لیـــرەیی مـــەسکووک
پابەندی خـــەلایق نیـــیـــە طەبعم وەکـــو خـــەڵکی
بێ کـــولفـــەتم و ڕەندم و ســـەییـــاحم و ســـالوک
من خـــواجـــەیی ئەحـــرارم و ئامـــێـــزشی دونیـــا
هێـــشـــتـــاکـــە نەمــیکردووەتە بەندەیی مـەملووک
وەک (لامـیـع)ی شـاعـر نیـیـە نیـستێ لە جـیـهـاندا
شـیـرین سـوخـەن و قـابل و خـۆش طەبع و (ڕەزا) سـووک

* میچ قاپەکە لە ئەژنۆی مەڕ دەبێت و یاریی پێ دەکەن. کە هەڵدرێت گاهێ لەسەر پشت (جگ) دەوەستێت و یاریکەر دەیدۆڕێنێت و گـاه (بووک) لەسەر تیـرک دەوەستێت و دەیباتەوە.

. شێخ غەفوور تێدەگا کە شێخ ڕەزا هەوای سیاحەت کەوتووەتە کەللەیەوە و بە کەس ڕاناگیـرێت، ئیـتـر کچی چیی بداتێ، وا دیارە لەو گفتـەی پەشیـمان بووەتەوە و شێخ ڕەزایش لێی دەکەوێتە تەقەوە و بڕیاری ئەوە دەدات کە بچێتەوە کەرکووک و لەگەڵ شێخ عەلیی کاکی ئاشت بێتەوە.

ئەو ڕۆژە کـــە تۆرام و لە (کـــەرکـــووک) ســـەفـــەرم کـــرد
مـــانەندی عـــەقـــاریب لە ئەقـــاریب حـــەزەرم کـــرد
گـــەردوون سنگی کـــردم و هێنامـــیـــــە کـــۆیێ
مـــیـــوانی لەکن مـــامـــە غـــەفـــووری لەجـــەرم کـــرد
خـــواســـتم کـــە بڕۆم بۆ ســـەفـــەری ڕۆم بە ســـیـــاحـــەت

نەیهێشت و دووسەد ئەهلی عەمامەی لەسەرم کرد
دانیشێ نەچێ من کچی خۆم مارە دەکەم لێی
ئەو طالبی دونیایە ئەوا موعتەبەرم کرد
چورسا لەبەرم جوببەو و فیسا لەسەرم فێس
نە فێسی لەسەر نام و نە جوببەی لەبەرم کرد
شەش مانگە بەم ئەفسانە گلی داومەوە لای خۆی
نەمزانی، ملم بشکێ، تیا چووم، زەرەرم کرد
(واللە) دەکەم دەر حەقی ئەو بەڵکە زیاتر
ئەو کارە کە دەرباری رەشیدی پسەرم کرد
کارم تەڕ ئەبێ ئەمموت ئەگەر لوتفی ببێ مام
ئەی لایقی ریشی، بەخودا، کاری تەڕم کرد
بۆ موجتەهیدان گەرچی جەوازی نییە تەقلید
بۆ موجتەهیدم، هاتم و تەقلیدی کەرم کرد
ئەی گووی خلە بەم لوتفە کە ئەو کردی لەگەڵ من
لەم مەرحەمەت و لوتفە ئەوا من گوزەرم کرد
هەر چەندە وتم وەختێ کە دیم نەخوەتی قەلبی
یارەب کە لەگەڵ شێخ عەلی بۆچی شەڕم کرد
هەر دەچمەوە لای گەرچی بڵێ هاتەوە دیسان
ئەو خوێرییە بێکارە کە من لێرە دەرم کرد
هەر چەندە (رضا) باعثی بەدنامییە عەودەت
لەم سوکی یو بەد نامییە، صەرفی نەزەرم کرد

ئیتر دەکەوێتە شانو باڵی بەرەی شێخ غەفوور و لە پاشاندا جنێو:

چایەکەی مامە غەفوورم زەردە وەک میزی نەخۆش
ئیحتیاج ناکا بە ئاگر بە دوو تڕ دێنێتیە جۆش

ئینجا دەکەوێتە هەجوی کوێێ:

هەرکەسێ ئەصڵ و میزاجی فیتنەیی و بەد گۆییە
دەستی حیزیشی هەبێ ئەمجا بەتەحقیق کۆییە

هەروا بە موفتی کۆیێ:

موخبیر خەبەری داوە لەسەر موفتیی کۆیێ
حەسرەت کەشی شیری سەگ بۆ کەوچکە دۆیێ

دەکەوێتە دژی ڕەشیدی کوڕی شێخ غەفوور و بەهیچ جۆرێک دانوولەی لەگەڵ ئەودا ناکوڵێت و لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێت:

فریاد کە از (نصیبینم) گشتند
واز خشم مرا بخون آغشتند
ای وای از این مردم بی شرم و حیا
مانند رشید پور عمویم پشتند

واتا:

فریاد کەلە نوصەیبین کوشتمیان
لە ڕقا لە خوێنیان گەوزاندم
ئەی هاوار لەم خەڵکە بێ شەرم و حەیایە
هەموو وەک ڕەشیدی کوڕی مامم پوشتن

کە دەگەڕێتەوە کەرکووک، شێخ عەلی دێی (قرخ) و (تاڵەبان) تەرخان دەکات بۆ گوزەرانی و لەتەکیەیش مووچەیەکی بۆ دەبڕێتەوە و ئیتر لەگەڵی شێخ غەفووری مامی وەکو جاوی نەشۆرراو دایدەدرێت و ئەم هەموو جنێوانەی دەداتێ:

مامەکەم قەحپە ژنە دەوڵەتی شەددادی هەیە
طالعی ڕاهبەر و بەختی خودا دادی هەیە
یەک دوو دێی داوەتێ سوڵتان پەیی ئیطعامی طعام
هەر یەکێکی بە قەدەر خەزنەیێ ئیرادی هەیە
چ فرووش و، چ زرووف و چ ضیاع و چ عەقار
لە هەموو جنسە مەتاعێ صەد و هەشتادی هەیە
ئەم هەموو گەنج و خەزینەی هەیە هێشتاکو تەرەس

نە هەوای جوود و نە مەیلی کەرەم و دادی هەیە
ڕەسمی ئابائی کیرامی بووە ئاثاری سەخا
نە لە ئابائی حەیائو نە لە ئەجدادی هەیە
گەر سەر و ڕیشی پیاوانەیە باوەڕ مەکە پێی
باطنی جوولەکەیە، زاهری زوهادی هەیە
خۆی بەهەر صوورەت ئومێدی کەرەمم پێی هەیە لێک
ڕقی زۆرم لە (ڕەشید)ی کوڕی گەووادی هەیە
ڕەنگی کەر دەنگی بەقەر هەیئەتی سەگ خوویی چەقەڵ
چاوی کوێر مەخزەنی کێر، مەقعەدی بەربادی هەیە
ذیکر و ئەورادی لەسەر کێر و ذەکەر مونحەصیرە
سەیری ئەو حیزە قوورومساغە، چ ئەورادی هەیە
تف لە کوز دایکی لەکن خۆی کوڕی هێناوەتە دەر
گو بەڕیش باوکی، لەکن خۆی ئەمیش ئەولادی هەیە
ئەمە گشت باوکی سەر و مەشقی لەبۆ داداوە
سەربەخۆ سالکی ڕەهرەو نییە ئوستادی هەیە
لە گرووهی حەرەما کارەکەر و دایک و خوشک
فاطم و عاصم و ئامان و پەریزادی هەیە
شەو و ڕۆژ چەپلە بەکوز لێ دەدەن و هەڵدەپەڕن
فەرجیان تاب و تەبی کوورەیی حەددادی هەیە
بێ حەیان جوملە خصوصەن ژنە سۆزانییەکەی
ڕەووشتی دێڵە سەگ و قەحپەیی بەغدادی هەیە
من لە کەرکووکەوە دێنێتە کن ئەم قەحپە ژنە
لەگەڵم خەصمە فەلەک، نییەتی بێدادی هەیە
کونی و حیز بووە مانەندی ڕەشید طبعی (ڕەزا)
هێند لەبەر جەوری فەلەک خاطری ناشادی هەیە

شێخ ڕەزا کە لە شێخ ڕەشیدی ئامۆزای تووڕە دەبێت لە چوار خشتەیەکیدا ئەمەی پێ دەڵێت:

ڕەشە ڕەشـــشـــاشی کـەڕی ڕەش بە ڕەشت
تا ڕەشت مـــاوە ڕەش و ســـوور بە ڕەشت
چڵ و چێـــوی چەمی ڕەشنەش بـە ڕەشت
بـە بەشت هـەم بە لـەشت هـەم بە ڕەشت

(لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری - دەستەی کورد - مامۆستا شێخ محمدی خال ١٩٨٧).

شێخ محەمەدی خاڵ کە شانازی بە شێخ ڕەزا و پیرەمێردەوە دەکات، شیعرێکی پیرەمێرد دێنێت کە بە خزمێکی خۆی وتووە لەگەڵ شیعرەکەی شێخ ڕەزادا هاوتای ئەکاتەوە کە وتوویەتی:

پەندی پێـــشـــینانە بۆز بە لەڕی
جاشە ڕەشمان بە دەنکە جۆیێ زەڕی
ڕەشە بەختم بە خەڵقی سەگ ئەوەڕی
ڕەشـە مێ بوو بە من پشـــیلە وەڕی

***

### شێخ ڕەزا لە مەیدانی عەشق و غەزەلدا

شێخ ڕەزا دەوری هەرزەکاری لە کەرکووک و کۆیێ بووە. لەبەر ئەوە شیعری عەشقبازی و غـەزەلی لـەم دوو شـارەدا بووە. هەڵبـەسـتی «دولبـەری بێ وەفـا» لەکـەرکـووک بوبێت. «دلبەرانی کۆیسنجق »ی لەکۆیێ بووە. ئەم هەرزەکارە کە تەمەنی هەرزەکاری لەنا و شێخ و دەروێشدا ڕابووردووبێت، غەزەلی ئەم کاتانەی بە عەشقی ئیلاهییەوە دەربڕیوە، بەڵام ئایین، ڕێگای دڵداری و غەزەلی لە هیچ شاعیرێک نەگرتووە.

لە هۆنراوی «دڵبەری بی وەفا»دا دەڵێت:

ڕۆژێ نەب و ئەم دڵبـــەرە بێ ڕەحـــمـــە وەفـــا کـــا
جـــارێ نە بو ئەم کـــافـــرە شـــەرمێ لە خـــودا کـــا
حـــیـــرانن ئەطـیـــبـــا لە عـــیـــلاجی مـــەرەزی من

لوقمانی ویصالت مەگەر ئەم دەردە دەوا کا
کاریّ کە غەم و دەردی فیراقت بە منی کرد
سەرما بە هەتیو، با بەدەواری شڕی ناکا
دەیوانەیە شەخصێ کە لە غەیری لەبی لەعلی
وەک شاهی سکەندەر تەڵەبی ئاوی بەقا کا
تاب و تەبی ئاتەشکەدەیی هیجری وەکو شەمع
نزدیکە منیش واریدی سەحرایی فەنا کا
لەم ڕێگەیە تەقدیری ئەزەل وا بو کە ئێمە
پامالی جەفا بین و ڕەقیب سەیر و صەفا کا
ڕووح و دڵ و دین، هەرسێ دەکەم بەزل و نیشاری
کامی دڵی من گەر لە لەبی لەعلی ڕەوا کا
سەردانێ، لەڕێی عەشق، (ڕضا) لازمە، عاشق
بۆ یار سەر و مالی سوپەری تیری قەزا کا

لەکاتی هەرزەکاریدا کە بەتۆراوی چووەتە کۆیێ بۆ لای شێخ غەفوری مامی، چاوی بە کچە شۆخ و شەنگەکانی کۆیێ دەکەوێت و بەشداری بەزم و سەیرانی ئەو وڵاتە جوانە دەکات و وەکو گەردانەی شیلان دەیهۆنێتەوە:

شاری کۆیێ کە لەبا لەب لە بوتی خونچە لەبە
گەر فەلەک لێی بگەڕێ مەنبەعی عەیش و تەرەبە
دڵبەرانی، بە مەسەل، هەر وەکو ئەشعاری منێ
کامی لێ ئەگری ئەبێژی ئەمەیان مونتەخەبە
غارەتی عەقڵی منی کردووە زێبا صەنەمێ
عاریزی ڕەشکی قەمەر، قامەتی نەخلی ڕوطەبە
نەوزەر ناساوو، فەرەیدون صفەت و، سەلم ڕەوش
شەیدە مانەند و سیاوەش وەش و خەسرەو لەقەبە
عارض و غەبغەب و ڕوخسار و زەنەخەندان و لەبی

نازک و طورفــه و زێبـــاو و بەدیع و عــەجــەبە
دڵبەر و زەرکەمەر و جیلوەگەر و عیشوە فرووش
سەروی سیمین بەدەن و ، شاهید و شیرین لەقەبە
ظالم و دڵ شکەن و دۆست کوژ و خەصم نەواز
عیسەوی دین و موغ ئایین و فەرەنگی مەذهەبە
سێوی داناوە لەژێر لێو، کە ئەمەم گۆی ذەقەنە
زیوی خڕ کردووە وەک گۆ، کە ئەمیشم غەبەبە
خواستی لێی ماچێ (ڕەزا)، کافرە نەیداو و وتی
ئەی خودا لەم کوڕە شێخ زادەیە چەند بێ ئەدەبە

لە کۆیێ دوو سۆزی هەیە. سۆزی دوریی وڵات سۆزی خۆشەویستی و دڵداری:

دەمکوژێ حوکمە دەزانم بەخودا دەردی حەبیب
وەرە سا بەشقی خودا دەس لەیەقەم بەردە طەبیب
وەرە دەستێ بخەمە گەردنی بەللوورینت
تا وەکو سفرە، لەداغا، بدرێ ورگی ڕەقیب
طالعم نەحسە، دەترسم کە بە ئازاری فیراق
بمرم و ڕۆژێ نەبێ دەوڵەتی وەصلم بە نەصیب
چاوی فەتتانی ئەتۆ ساحیرە، جادوو کەرەیە
کە بە یەک عیشوە ئەدا عابیدی سەد سالە فەریب
تا لەتو دوورە دڵی غەمزەدە ئەی ڕاحەتی جان
مەشریق‌و مەغریبە، ما بەینی لەگەڵ صەبر و شەکیب
بێ فراز نابێ نەشیب ئەم قسە تەحقیقە، وەلێ
من لە ڕێی عەشقی تو ئەمدی بەخوا غەیری نەشیب
غەیری زوڵفە لە سەر و صەفحەیی ڕووت ثابیتە، یا
طینەت و طیبە کە مەمزووجە لەگەڵ زینەت و زیب
شێخ دەگۆڕێتەوە گەر چاوی بە زوڵفت بکەوێ

خەرقەوو سوبحە، بە زەننار و چلیپا و و صەلیب

طاقەتی طاق بووە بێچارە لەژێر باری فیراق

بکە رەحمێ بە (ڕەزا) چاکە تەرەححوم بە غەریب

سەرو، کە بە باڵا بەرزییەوە شانازی دەکا و نەی؛ کە پەنجەی هونەرمەند بە ئاوازی جوان شەکری لێ دەبارێ، سەرو سەری داوە لەبەردونەی شەکەری خواردووە کە بیانگریتە قامەت و خۆش لەبیی تۆ:

سەرو و نەی چین کە لەگەڵ قامەتی تۆ بێنە نەبەرد

شەکەری خواردووە نەی، سەرو؛ سەری داوە لەبەرد

گەر دەلیلی وەکو نوقطەی دەهەنت نەبوایە

منیش ئینکارم نەکرد وەک حوکەما جەوهەری فەرد

لێی دەپارێمەوە ئەی ڕووحی ڕەوانم تو خودا

چییە دەرمانی دڵم؟ پێم دەڵێ: لاچۆ. دڵە دەرد

***

## پێنج خشتەی شیعرێکی کوردی

شێخ ڕەزا وەکو مەفتوونی شیعرەکانی «حافظ» بووە، هەر وا مەفتوونی هۆنراوە جوانەکانی «کوردی»یە. لەم تەخمیسەی شیعری (کوردی) نازانی شیعری کامیان هینی ئەویتری ڕازاندووەتەوە:

دڵی بردم، بەناز و عیشوە دیسان، شۆخێ، عەییارێ

فریبی دام بە سیحری چاوی خۆی مەحبووبێ، سەححارێ

لەهیجرانا تەقم کرد ئەی ڕەفیقان کوا مەددەد کارێ

(ئەمان مردم عیلاجێ سا لەڕێی پێغەمبەرا چارێ

ویصال، یاقەتل و یا تەسکین، لە هەرسێ بۆم بکەن کارێ)

بەدەوری نێرگسی مەستی کەسێ نەیاوە مەیلی مەی

لەبۆ شەهدی لەبی لەعلی، دەناڵێنێ دڵم وەک نەی

لەتابی ئاتەشی عەشقی بکەم داد و فیغان تا کەی؟

(ئەوەند ســووتاوم ئەصــلا تابی فــریادم نەمــا ســادەی
ڕەفــیــقــان نیــوە ســووتەن ئێــوە، نا مــەرد عــەرزە هاواری)
لە ڕێگەی عــەشــقــدا نایانە پێم زنجــیــری مــەجنوونی
لەدەســـتم چو ڕمـــووز و دانش و فـــەهمی فـــلاطوونی
وەکـو شـەخـصێ کـە زاری کـا لە جـەوری دوژمن خـوونی
(لە کـونجی سـینە دەنگی ئای و ئۆی دڵ دێ بە مـەحـزوونی
وێران بێ نەمـــدی ســـاتێ لێی نەیێ ناڵەی برینداری)
کـە چاوی سـاحـری دەسـتی بە غـەمـزە و ناز و ئـمـاکـرد
مـەتاعی عـەقل و هۆش و دەرکـەمی تاراج و یەغـمـاکـرد
کـەسێ نەیگوت دریغـا کێ ئەتۆی وا شـێت و شـەیدا کـرد
(ئەلای هەرکـەس دەچم مەنعم دەکا، خۆت بۆچی ڕسوا کرد
دریغ کـــوا حـــاڵزانێ، ڕەببی تووشم بێنی بیـــمـــاری)
گوتم؛ وەک سورمەیە، بۆ چاوی عـاشق خاکەکەی ژێر پێت
لە ئولکەی حـوسندا گـەر لافی شـاهی لێ بدەی لێت دێت
گـوتی؛ مـەیخـانە بێ دایم بە یادی چاوی مـەسـتم جـێت
(صــەبا یارانی مـەجلس گــەر هەواڵی من بپــرسن لێت
بڵێ؛ کێـشـایە مـەیخـانە دوو چاوی بێـچـوە عـەییـاری)
ســەری جــەنگی هەیە دایم لەگـەڵ من چەرخی دون پەروەر
نە بەخـــتم یار، نەچەرخم یاوەر و نە طالعم ڕەهبـــەر
ئەوەند بێ ڕەحم و صاحـێب کـینەیە دەرحـەق بە من دڵبەر
(لە نەزعـا پێی ئەڵێم قـوربان جەفـا بەسیـە، دەڵێ: کـافـر
ئەرێ چیت دیگە تو سەگ مـەرگ، کارم ماوە پێت جاری)
نـەمـــــاوە ڕەونەقـی بـازاڕی عـــــەقل و دانـش و وردی
بە پوولێ نایکڕن لەم عــەســرەدا عــیلمی (ئەبی وەردی)
لە ئەشـــعـــاری (ڕەزا) پەیدایە ئاســـاری جـــوانمەردی

(دوڕ و یاقــووت دەباریٚ لەم کــەلامــە شــیــرنەی کــوردی
خــودا ســا کــوا لە دونیـــادا قــەدر زانیٚ، خــریداریٚ)

***

**پیٚنج خشتەی غەزەلیٚکی مەسیح**

لەم پیٚنج خشتـەیەدا کە بەفارسییە، نازانی بەیتـەکانی شیٚخ ڕەزا و بەیتـەکانی مەسـیح کامیان لە کامیان جوانترە.

در باغ خـــیـــال تـو دلم گـــشـت گـــهـــر سنج
مــهــرت بدلـم نقش کــشـــیـــده است چو شطرنج
مـــیـــگشـت شب و روز چو افـــعـی بســـر گنج
( جــسم و خط و خــال و رخ و ابروی تـو هر پنج
زیبـــاسـت بر آن عـــارضی نـیـکوی تو هر پنج)

واتا:

لەباغی خەیاڵی تۆدا دڵم بووە بەگەوهەر
خۆشەویستیت لە دڵما وەک شەترەنج نەقشی کیٚشاوە
شە و و ڕۆژ وەک ماری سەرگەنجینە دەگەڕا بەسەر گەنجینەدا
(چاو و خەت و خاڵ و گۆنا و برۆی تۆ هەرپیٚنجیان
جوانن بەو ڕوخسارە چاکەی تۆوە هەر پیٚنجیان)

تـا چشـم مـن امــروز بدان ســیــمــبــر افــتــاد
کـز شـوق جـمــالش دل و جـان بیـخـبـر افـتـاد
مــرغـــان صــبــوحی همــه گـــشـــتـند بفــریاد
(ســر و ســمن و یاســمن و عــرعــر و شــمــشـــاد
گـــشـــتـند فـــدای قـــد دلجـــوی تو هر پنج)

واتا:

هەرکە چاوم بەو لاشە جوانە وەک زیوەت کەوت
دڵ و گیان لە ئارەزووی جوانیی ئەوا بیٚهۆش بوون
بەیان هەمو و کەوتنە فەریاد و خویٚندن

(داری سەرو و سەمەن و یاسەمین و عەرعەر و شمشاڵ
هەموو هەر پێنجیان بوون بە قوربانی قەدی جوانی تۆ)

در روی زمین نیست بخوبی چو تو انسان
هر چند که گفتیم توی یوسف کنعان
زاهد که نظر کرد همی گفت بقرآن
(شمس و قمر و مشتری و زهره و کیوان
هستند هوا خواه سرکوی تو هر پنج)

واتا:

لە ڕووی زەویدا جوانێک نییە وەک تۆ
هەر چەندیش وتمان تۆ یووسفی کەنعانی
زاهید کە دیتی وتی بە قورئان قەسەم
(ڕۆژ و مانگ و موشتەری و زوهرە و زوحەل
هەر پێنجیان بەو بەرزەوە ئارەزووی دەرگای تۆیان هەیە)

میگفت خوش ان نوحه گری عاشق دلریش
تاچند نهی برسر هرگل هوس خویش
رحمی بنما بر من مسکین جفا کیش
(پیویسته من و عابد و زاهد، شه و درویش
بو سیم کف پای سگ کوی تو هر پنج)

واتا:

ئەو دڵدارە دڵ بریندارە شین کەرە جوانی ئەوت کە ئەیوت
تاکەی ئارەزووی خۆت ئەخەیتە سەر هەرگوڵێ
بەزەییەکت بە منی هەژاری خەفەتباردا بێتەوە
(پێویستە من و عابید و زاهید و شا و دەروێش
پێی سەگی بەر دەرگای تۆ ماچ کەین هەر پێنج)

خواهی که بیابی زره عشق فتوحی
باید که (رضا) نوش کنی جام صبوحی
نومید مش و از کرم او چ و نصوحی

(عـقل و خـرد و هوش و دل و جـان (مـسـيـحى)
برباد شـد از حلقـه ء گـيـسـوى تو هر پنج)

واتا:

گەر ئەتەوێ لە ڕێی دڵداریدا سەرکەوتنێکت دەسگیر بێ،
دەبێ ئەی (ڕەزا) جامی شەرابی سبەینان بخۆیتەوە
لە کەرەمی ئەو نائومێد مەبە ئەگەر پەند لە گوێ نەگرێ
(عەقڵ و کەماڵ و هۆش و دڵ و گیانی (مەسیحی)
هەر پێنجیان بە هۆی ئەڵقەی زوڵفی تۆوە بەرباد بوون)

***

**غەزەل**

شێخ ڕەزا زۆربەی غـەزەلەکانی لەدەوری هەرزەکاری ڕۆژانی فەقێتیدا لە کۆیە وتووە.
ئەمە یەکێکە لەم غەزەلە نایابانەی:

خـامـە بۆ تەصـویری ئەبرۆت پەیڕەوی (مـانی) دەکـا
شـانە بۆ نەخـچـیـری زوڵفت عـەنبـەر افـشـانی دەکـا
قـوتی ڕۆحـە لێـوەکـەت، یاقـووت ئاودار نیـیـە
مـەنعی بازاڕی عـەقـیق و لەعلی ڕوممانی دەکـا
خـاڵی لا لێـوت نگینی خـاتەمی و نادر ظوهوور
مـوهری دەسـتی ئاصـەف و حـوکـمی سـولەیمانی دەکـا
دڵ لە نەشئـەی عـەکسی مـەستی چاوەکـەت لایوعـقـەلە
بۆ کـەبابی جـەرگی من لێـوت نمەک خـوانی دەکـا
بەرگی سـەرتاپام پەلاس بێ هەر بە شـەرتێ تۆم ببێ
تاری ئەو بەرگـەم لەلا صـەد شـاڵی کـرمـانی دەکـا
چەند هەزار جـارت دەخـیلم حـەرفی بەدکـار مـەشنەوە
هەرچی دەربارەم بڵێ، بیـزانە، شـەیتـانی دەکـا
ئەر لە پەردەی نازەوە ئـاوازی تۆم بەرگـوێ کـەوێ
بولبـولی شـیـرین زوبان مـەیلی غـەزەلخـوانی دەکـا

کـەس نیـــیـە ئەو شـۆخـە حـاڵی کـا لە سـۆزی ئاتەشم
وا لە عـەشـقی ئەو (ڕەزا) مـەشـقی غـەزەلزانی دەکـا

***

لە غەزەلە فارسییە نایابەکانی شێخ ڕەزا ئەم شیعرەی خوارەوەیە*:

بە گلشن قـد مـوزون ترا تا یاد مـیکردم
خـیـابان تا خـیـابان سـرورا آزاد مـیکردم
ندانسـتم گـذار شـانه بر زلف تو می افـتـد
وگر نه تاقـیامت خدمت شـمشـاد میکردم
اگر یک تار موگم من شد از زلف پریشانت
به زخم شـانه نادر ناخن اسـتـاد مـیکردم
بهر صـحرا کـه مـیـدیدم بدام افـتـاد آهویی
فـدای چشم تو مـیـکنتم و آزاد مـیکردم

واتا:

هەرچەند باڵای ڕێک و ڕاستی تۆم لە باخچەدا بیر ئەکەوتەوە
شەقام بە شەقام داری سەروم ئازاد ئەکرد و حیسابم بۆ نەئەکرد
نەمزانی ڕێی شانە ئەکەوێتە زوڵفی تۆ
بمزانیایە تاقیامەت خزمەتی داری شمشاڵم ئەکرد کە شانەی لێ دروست ئەکەن
لەهەر سارایەکدا بمدیایە ئاسکێک کەوتووەتە داوەوە
ئەموت بەقوربانی چاوەکانی تۆ بێ و ئازادم ئەکرد

نشـسـتم هم چو مـجنون بەسر بازار رسوائی
ترا با مـدعی مـیـدیدم و فـریاد مـیکردم
فـریب خویش مـیـدادم کـه اینک یار مـیـاید
بهـر اواز پایی خـاطر خـود شـاد مـیکردم
(رضا)ی کار عاشق گر بزورت پیش میرفتین

* لە کەشکۆڵە دەستنووسەکەی بەهاتوودین ئەفەندی کەرکووکەوە وەرگیراوە.

بدین بی دست و پایی کار صد فرهاد میکردم

واتا:

وەک مەجنوون لەلای سەرووی بازاڕی ڕسواییيەوە دانیشتم

تۆم لەگەڵ ناحەزی بەدکار ئەدی و ئەکەوتمە هاوار هاوار

خۆم فری و ئەدا و ئەموت یار ئەوەتا دێت

دڵی خۆم بەهەموو تریەیێکی پێ خۆش ئەکرد

.....................

بەم بێ دەست و پێییە کاری سەد فەرهادم ئەکرد

***

## ڕاز و نیازی شێخ ڕەزا

شێخ ڕەزا، لە ئەستەمووڵدا ژیانێکی پڕ لە هونەر، لەگەڵ گەلێک لە شاعیر و ڕۆشنبیرانی کورد و تورکدا ناسیاویی پەیدا کردووە و لەگەڵیاندا ڕایبواردووە،

لەم ژیانەی ئەستەمووڵیدا ئەوەندە بە تەنگی بوون و نەبوونەوە نەبووە و شیعر و ئەدەب و هونەری کوردووەتە خۆراک. لەوانەی کەناسیاویی لەگەڵیا پەیدا کردووە، شاعیری کەرکووکی (میهری) و شاعیری هەولێری (خەیاڵی) کە لە ئەستەمووڵدا ژیاون و هەر لەویش مردوون. لەم شیعرە تورکییەدا خەیاڵی ئەو مەجلیسانەی هونەر و شیعر و ئەدەب دەکات کە دەڵێت:

خرم او دم کە ساکن دیر مغان ایدم

همراز جام همدم رطل گران ایدم

ترکان سر و قامت ایلە دست درمیان

خوبان غنچە لبلە دهان بردهان ایدم

واتا:

خۆزگەم بەو ئاسوودەییيەی کە دانیشتووی دێری موغان بووم

هاوڕێی جامی شەراب و هاودەمی پێوانە پڕان بووم

لەگەڵ شکستەی قامەت سەرواندا دەس تێکەڵ،

ئەدیمی جوانانی غونچە لێوان بووم

گاهی حریف حلقەء رندان بادە نوش

گـــاهی انیس مـــجلس درد کـــشـــان ایدم

(مـهری) نکتـه سنج و (خیـالی) بذله گـو

یاران شـــوخ مـــشـــرب ایله هم عنان ایدم

واتا:

دەمێک هاوڕێی حەلقەی بێهۆشی بادە نۆشان،

دەمێک ئەنیستی کۆڕی هەناسە کێشان بووم

لەگەڵ (میهری*)ی نوکتە باز و (خەیاڵی)ی خۆش گۆی

یارانی مەشرەبدا ڕوو بە ڕوو بووم

* میهری: مەلا محەمەدی موفتی کوڕی مەلا عەبدوڵلای دەشتەییە.لە ئەسڵدا خەلقی دەشتەی هەورامانە و لە سنە ژیاوە و هاتووتە کەرکوک و لە پاشان چووەتە ئەستەموڵ. بە زوبانی فارسی و تورکی و کوردی و عەرەبی نووسەر و شاعیر بوو. لە ساڵی ١٣٣٦ کۆچی لە ئەستەموڵ کۆچی دوایی کرد و لەوێ بەخاک سپێررا.

ســجــادە غــرق بادە، عــمــامــە رهن منی

ســـر دفـــتـــر گـــروە خـــراباتیـــان ایدم

گـــاهی مـــقـــیم خـــانەء خـــمـــار و زمـــان

قـــارنجـــەلرلە مـــعـــتکف گنج خـــان ایدم

واتا:

بەرماڵ نوقمی بادە، مێزەر ڕەهنی مەی

سەر دەفتەری دەستەی مەیخانە جۆیان بووم

دەمێک دانیشتووی خانەی مەیخانەو

دەمێکیش لەگەڵ مێروولەکاندا خەڵوەکێشی کونجی خان بووم

خـیلی زمـاندە حـضـرت دسـتـور کـاملک

بر باقـمـە سندە طائر قـدس آشـیـان ایدم

اول بزم دلفـــریبـــدە طوطی خـــوش ادا

اول انجـمـندە شـاعـر مـعـجـز بیـان ایدم

واتا:

گەلێک جاریش لەلاکردنەوەیەکی جەنابی باری

باڵندەیی پاکی پیرۆزی ئاشیان بووم

لەو بەزمە دڵگیرەدا توتیی خۆش گۆ
لەو کۆڕەدا شاعیری حیرەت بەیان بووم

دوران کـــارزار فـــصـــاحـــتـــده بن دخی
(نفی) گـــبی برافـــعی آتش زبان ایدم
عـمـان ایکن کـفـمـده بولنمـازدی بر صـدف
لقـمـــان ایکن مـعطل برلقـمــه نان ایدم

واتا:

لە دەورانی دەستە و یاخەی فەصاحەتدا منیش
وەکوو (نەفعی) مارێکی ئاتەش زوبان بووم
کە عمان بووم لە لەپمدا صەدەفێک نەدەبینرا
کە لوقمان بووم بۆ لوقمە نانێک داماو بووم

تیـر مـشـهدم مـقـام (رضـا) دن او حـال ایله
هربر بلایه شـــاکـــر و الحـــمـــد خـــوان ایدم

واتا:

دڵگیری مەشهەدم لەمەقامی (رضا)دا و بەو حاڵەیش
بۆ هەر بەڵایەک شوکرانە و سوپاس خوان بووم

بەوەیش قایل نییە، دەیەوێت لە جیهانی ماددیش بەدەر، گەشتێکی جیهانی ڕووحیش بکات، وەکوو لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت:

گـشت قـضـای عـالم جـان ایتـمک ایسـترم
جـان کـمنده بر جـولان ایتـمک ایسـترم
بـیـــــــرون دلـده بـوو لمـادم آثار کـنـز راز
جـانی درونه عطف عنان ایتـمک ایسـترم
درگـاه حضـرته عـرض نیـاز ایتمک ایسترم
اسـرار من لدنی بیـان ایتـمک ایسـترم
جاسوس آهم آلدی جانانەدن سیر دوان سپر
اشک جـهـان، نورد دوران ایتـمک ایسـترم

روبر دكل حقيقته سن شيخه‌كين (رضا)
بن جستجوى پير مغان ايتمک استرم

واتا:

دەمەوێت گەشتێکی جیهانی ڕوحی بکەم
لە ڕێسمانی رووحدا، دەمەوێ جەولانێک بکەم
لە دەرەوەی دڵدا نەمدیت ئاثاری گەنجینەی ڕاز
دەمەوێت سەرێچی لە بەستنی رووحی دەروون بکەم
بۆ پێش بردنی سکاڵای نیاز بوو دەرگای حەضرەت
ئەمەوێ ڕازی (من لدنی) دەرخەم و ئاشکرا بکەم
جاسووسی ئاهی سەردکێشم لەگیانان پتر نەبوو
ئەمەوێ لە جیهانی نوردا غلمە غلانێ بکەم
نهێنی نییە لە ڕاستی تو ئەی شێخ (ڕەزا)
من دەمەوێ جوستجوی پیری موغان بکەم

لەشیعرێکی تورکی تریش دەڵێت:

عرض در سعادته واردكسه اى صبا
بر فاتحه اوق و پير مغانک مزارينه
طوپراق ايچنده، سويله، يتر يا تمغک شكيب
قالق عودت ايله جانب دار و ديارينه
تاكى اسير خاک، باشک قالدير، آچ گوزک
باق عالمک صفاى بهار و نهارينه
ويرمز ايسه جواب يناشدير پياله يى
بر جوعه دوک او عاشق رندک كنارينه

واتا:

ئەگەر چوویتە خزمەتی خاوەن شکۆ ئەی صەبا
فاتحایەک بخوێنە مەرقەدی پیری موغان
بڵێ لەناو خاکدا نوستنت بەسە ئەی شەکیب
هەڵسە بگەڕێرەوە بۆلای ماڵ وولاتت

تاکو کەی بەندی خاک بیت، سەرت هەڵبڕە، چاو بکەرەوە
تەماشای ڕونی بەهار و ڕۆژی جیهان کە
ئەگەر وەڵامی نەدایەوە، بادەکەی لێ نزیک کەرەوە
قومێک برێژە لای ئەو عاشقی هوشیارە.

***

## گلەیی لە دەستی زەمانە

شێخ ڕەزا دەڵێ کەس نییە تووشی زیان نەبووبێ لە دەستی زەمانە و هەموو تاوانێک دەخاتە ئەستۆی ئەو و ئەگەر خوا دەستی بدات، هەموو کەون تێکدە شکێنێت. لەم شیعرەدا دەردەکەوێت کە شێخ ڕەزا زانیاری لە زانستی فەلەکدا هەبووە:

از دست تطاول زمانه
کس نیست نخورده تا زیانه
ای بیهوده زکرد مردم آزار
ناهی زگناه و خود گنهکار
تو مجرم و عامل گناهی
وز بیگنهان جریمه خواهی
ادم به دسیسەء تو اغلواس
نه حبه سبب شد ونه حوا
من سنگ زدم بەفرق هابیل!
ای راهنمای صد چو قابیل
خود ظالم و از منت شکایت
دانی به چه ماند این حکایت؟
ماند به حدیث گرگ محجوب
یوسف نەندریده، پیش یعقوب
یحیای نبی ذبیح من بود؟
ان هم عمل قبیح من بود؟

من پای خلیل را ببســــــتم؟

دندان حــــبـــیب را سکســـتم؟

مـــن دســـت یـــزیـــد را دریـــدم؟

دم خــــــــــروس را بـــریـــدم؟

واتا:

لەدەستی دەسدرێژیی زەمانە، کەس نییە زیانی نەچەشتبێ

تو گوناهبار و گوناهکاری و لە بێگوناهان داوای جەریمە ئەکەی

ئادەم بە فرۆفێڵی تۆ هەڵخەڵەتا، نەخەتای دەنکەگەنم بوو و نەخەتای حەووا

من بەردم بەسەری هابیل دا؟ ئەی ڕێنمایی کەری صەدی وەک قابیل

تۆ خۆت ستەمکاری و گلەییت لەمنە ئەزانی ئەم حیکایەتە لەچی ئەچێ؟

لەحیکایەتی گورگی شەرمەزار ئەچێ لەپێش یعقوب، کە ورگی یووسفی هەڵنەدڕیبوو

یەحیای پێغەمبەر من سەرم بڕی؟

ئەوەیش کاری ناشرینی من بوو؟

من پێی خەلیلم بەستەوە؟

من ددانی خۆشەویستی خدام شکاند؟

من دەستی یەزیدم ڕاکێشاو

لەسەر کورسیی دەستەلات دامنیشاند؟

من جـــامــــهء کـــعـــبـــەرا دریدم؟

دم خــــــــــرویـــس را بـــریـــدم

نگســـتـــه رگی، نخـــســـتـــه جـــانی

سنگی نـزده بر اســـــتــــخــــوانی

ای چرخ ســـــتـــــمگریت تـاکی؟

وی گــــرگــــه شکم درید تـاکی؟

ای کـــاســـه ســـیـــاه ســـفله پرور

مـــــــــینـا شـکـن دل هـزور

ای بـاعـث نـامـــــــــــرادی مـن

شــــــرمی زنـک و نـهـــــادی مـن

ای چرخ کــه درکـــفت اســـیـــرم
گـــر آوردت خـــدا بـگـیـــرم
ریـــش زمـــلـــت بـــرارم از بـــیـــخ
ببـــریده بـهم بـه‌کـــون مـــریخ
حـــوت وحـــملت کـــبـــاب ســـازم
ثورت مـــزهء شـــراب ســـازم
انـگـشـت عـطـاردت بـبـــــرم
عـــمـــامـــهء مـــشـــتـــریت بدرم
جـــوزات دهم بـه‌خـــورد خـــرچنگ
ناف اســـدت بـه‌خـــون کنم رنگ

واتا:

من بەرگی کەعبەم دڕی؟
من کلکی کەری وەیسم بڕی؟
دەمارێکم نەپساندووە، لەشێکم بریندار نەکردووە
بەردێکم نەداوە بە ئێسکێکا
ئەی چەرخی گەردوون ستەمکاریت تاکەی!
ئەی گورگ ورگ دڕینی تۆ تاکەی؟
ئەی قاپ ڕەشی سپڵە پەروەر
ئەی مینای دڵی هونەرمەند شکێن
ئەی مایەی بەمراد نەگەیشتنی من
شەرمێ بکە لە نیاز پاکیی من
ئەی گەردوون من لە دەستی تۆدا دیلم
ئەگەر خوا ڕۆژێ گرفتاری منت دەکا
ڕیشی (زوحەل)ت ئەکەم بەکەباب
تاکم ئەبڕیە قنگی (مەریخ)
(حووت) و (حەمەل)ت ئەکەم بەکەباب
بورجی (ئەور)ت ئەکەم بەمەزەی مەی
پەنجەی (عطارد)ت ئەبڕم

مێزەری (موشتەری)ت ئەدڕم
(جەوزا)ت دەرخواردی قرژانگ ئەدەم
نافەکی (ئەسەد)ت بە خوێن ڕەنگ ئەکەم

اتش بزنم به کـــــهکشـــــانت
درهـم شـکـنم شـکـوه و شـــــانت
هـم زهـره زهـره ات کـنـم چـاک
مــهــرت فکنم چو زهره بن خـــاک
عـــــر ســـــرطانت را ســـــرارم
دود از دم عـــــقـــــربت برارم
شـــيـــرت بكشم بەسم قـــاتل
دلـــوت فـکـنـم بـه چـاه بـابـل
نه خـيـمـه گـذارمت نهخـرگـاه
چـرمـت بـکـنـم چـو چـرم روبـاه

واتا:
ئاگر بەر ئەدەم لە (کاکێشان)ت
شان و شکۆت تێک ڕاشکێنم
زراوی (زهره)ت لەت لەت ئەکەم
مۆرت وەکو زار تووڕ هەڵئەدەم
عومری (سەرەطان)ت دوایی پێ دێنم
دووکەڵ لەدەمی (عەقرەب)ت دێنم
شیرت بەزەهری کوشندە ئەکوژم
(دەلو)ت تووڕ ئەدەمە چاڵی بابل
ئەختیوەتت بۆ ئەهێلم ئەدەوار
چەرمت وەک چەرمی ڕێوی بکەنم.

***

## ڕێبازی ئایینی شێخ ڕەزا

شیخ ڕەزا لە بنەماڵەیەکی ئایندار و خواپەرستە. باوباپیری پێشەوایی ڕێبازی قادرییان

کردووە. شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی، لە شاری کەرکووک، بناغەی خواپەرستی و دەروێشی بڵاوکردووەتەوە و شێخ ڕەزایش، ژیانی منداڵی و هەرزەکاری لەژێر چاودێریی باوکی، لە ناو دەروێشان و تەکیە و زیکر ڕایبواردووە. هەرچەنێک لە شیعرەکانیدا وشەی وا هەن لەگەڵ ئەو ڕێبازەدا ناگونجێت، بەڵام ئەمانە هەر بە وتن بوون نەک بەکردەوە. لە پاڕانەوەیەکی لە خوا هەستی بەو تاوانە کردووە و داوای لێ بوردنی لێ دەکات، بەڵام وەکوو یەکێک ناز بەسەر گەورەی خۆیدا بکات.

ای ریزه خوری خوان نوالت مه و ماهی
جودت چو وجودت ابد و نامتناهی
برنامهء اعمال سیاهم قلم عفو
برکش که بدل کن بسفیدیم سیاهی

واتا:

ئەی ئەوکەسەی کە مانگ بەو بەرزەوە و ماسی لەبنی دەریادا بەرماوەی خوانی ئەخۆن
بەخشندەگیی تۆ وەکو بوونت هەمیشەیی و بێ پایانە
قەڵەمی لێبوردن بەسەر نامەی ڕەشی کردەوەمدا بێنە.
گوناهی ڕەشم بە لێبوردن بگۆڕە بەسپی

بودم من اگر بندهء از خواجه گریزان
باز آمدم ای بندگیت عزت شاهی
بر عفو و عقوبت نبود سود و زیانت
این هر و به پیش تو مساویست الهی

واتا:

من ئەگەر بەندەیەک بم لە خاوەنی خۆم هەڵاتووبم
وا گەڕامەوە بۆ لات، ئەی کەسێ کە بەندەیی تۆ شکۆی پادشاییە
تۆ نە لە سزادانم قانزاج و نە لە لێبوردنم زیان ئەکەی
ئەم دوانە هەردوو لە پێش توودا یەکن ئەی خودایە

بیرون شدن از ساحت ملک تو محال است
عبد توام و، ملک توام، خواهی نخواهی
این دیدهء گریانم و وین سینهء سوزان

بر صــدق ســخن مــيــدهدم هردو گــواهی

صــد بار امـيـد است (رضـا) را بتـو هرچند

ســرتاقــدمش غــرق گناه است و مناهی

واتا:

یاخی بوون له ساحەیی موڵکی تۆ قەد نابێ

بەندەی تۆم و موڵکی تۆم بتەوێ و نەتەوێ

ئەم چاوە گریاناوییە و ئەم سینگە گڕ تێ بەربووەم.

هەردووک شایەتی ڕاستیی قسەکانم بۆ ئەدەن

(ڕەزا) صەد جار هیوای بەتۆیە هەر چەند کە،

لەتەوقی سەریەوە تا پێی هەمووی نوقمی گوناە و ئەو کارانەیە خوا نەهی لێ کردوون.

لەم پارانەوەدا، دڵسـۆزیی شـیخ ڕەزا لە خـواپەرسـتـیـدا و پشت بەخـوابەسـتنی وەکـو ڕەوشتێکی ڕاست و ڕەوان دەردەخات. لە پاڕانەوەکەیدا لەگەڵ پەیامبەری خوا (ص)، بە «منطق» پرسیاری وای لێ دەکات، کە ڕێگای وەڵامی لێ ببڕێتەوە:

یارسول الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف

داخل جنت شــوم در زمــره، اصـــحـــاب تو

او رود درجـنت و مـن درجـــــهنم کی رواست

او سگ اصحاب کهف و من سگ اصحاب تو

واتا:

یا ڕسوولەللا چی دەبێت وەک سەگی ئەسحابی کەهف

لەڕیزی هاوڕێیانی تۆدا بچمە بەهەشت؟

کەی ڕەوایە سەگی ئەصحابی کەهف بچێتە بەهەشت و من لە دۆزەخ بم،

ئەو سەگی ئەسحابی کەهف و من سەگی ئەسحابی تۆم.

بەگطاشلی بوخاری زادە کە یەکێکە لە شێخانی نەقشبەندی، ئەم شیعرە تورکییەی شێخ ڕەزای وا تەخمیس کردووە:

خدایا هرکسه مقصودی آسان ایلیان سنسین

خلیله نار نمرودی گلســتــان ایلیــان سنسین

کـرمله هر دل منکودی شـادان ایلیـان سنسین

الهی غنچهء مقصودی خندان ایلیان سنسین
گوکل مرغک سحرلر زار و گریان ایلیان سنسین

واتا:

خدایا ئەوە بۆ هەر کەس نیازی ئاسان کردووە تۆی
ئەوەی بۆ ئیبراهیم خەلیل ئاگری نەمروودی بەگلستان کردووە تۆی
ئەوەی هەر دڵێ غەمباری بە بەخشش شاد کردووە تۆی
خودایا ئەوەی غونچەی نیازی خەندان کردووە تۆی
ئەوەی دڵی مەلی لە بەیاندا خستووەتە زار و گریان تۆی

دکرگون فراق اولمش گوگل وادی حیرتده
شرار آتشی تسکین اولوب جهای صفوتده
تمنای وصال یار ایله ماوای الفتده
خیال زولفه دلدار ایله صحرای محبتده
بخار دود آهم سنبلستان ایلیان سنسین

واتا:

ڕۆژێک دڵ لە دۆڵی حیرەتدا جیابووەتەوە
بڵێسەی ئاگری لە خۆشەویستی هەڵبژاردەدا دامرکاندووە
ڕازی بە یار گەیشتن لە ماوای ئولفەتدا
لە بیابانی خۆشەویستیدا، خەیالی زوڵف
ئەوەی بوخاری دووکەڵی ئاهمی کردە سنبلستان تۆی

ظهوره گلن مشکن حور جنت عالم بالا
زخی خلق او لمامشکن روزا شب هم جملهء اشیا
ضیا بخشای عالم اولمامشکن ادم و حوا
وجوده کلمەدن بزم سوداه ساغر و صهبا
بنی میخانهء فطرتده سکران ایلیان سنسین

واتا:

کە هێشتا دەرنەکەوتبوو حۆریی بەهەشتی عالەمی باڵا
کە دروستیش نەکراب و ڕۆژ و شەو و هەموو شتێک
کە ئادەم و حەووا هێشتا ڕووناک بەخشی عالم نەبوون

بەبێ ئەوەی بەزم و سەودا و بادە و شەراب دروست کرابێ
ئەوەی منی لە مەیخانەی سروشت سەرخۆش کرد تۆی

مـشـام جـان عـشـاقی مـعطر شـمـه ء گلدن
مـخـضـر روضـه ء قلبی گل و ریحان وسنبلدن
دلی سیـراب مست ایدن شراب شیشـه ء ملدن
جهالت ظلمنک محو ایلیوب سر صفحه ء دلدن
درونم مشـرق خورشـید عـرفـان ایلیـا سنسین

واتا:
ئەوەی بۆنی لەشی عاشقانی لەبۆنی گوڵ بۆندار کردووە
ڕەوزەی دڵی لە گوڵ و ڕێحان و سونبل سەوز کردووە
دڵی لە شەرابی شیشەی مەل پاراو و مەست کردووە
نەزانی جۆری لەسەر پەڕەی دڵ پاماڵ کردووە
ئەوەی دەروونمی کردە ڕۆژهەڵاتی عیرفان تۆی

دلم ازاده آسـوده ت و توقـعله تملقـدن
حضـیض جـای راحـتـده رها علو و تفـوقـدن
دل مکسـوری جبر ایدن جراحات و تشـقـقدن
گـریبـان دل مـحـفـوظ ایدوب دست تعلقـدن
عـروس فکر بکرم پاک دامـان ایلیـان سنین

واتا:
دڵم لە نومێد و ڕیا ئازاد و ئاسوودەیە
لەبنی جای ئارامیدا رزگارە لەسەرکەوتن و زاڵ بوون
ئەوەی دڵی شکستی لە برین و درز بردن تیمار کردووە
گیرفانی دڵی لەدەستی پێوەندی پاراستووە
ئەوەی بیری بیکرمی دامێن پاک کردووە تۆی

جـبـال قلب عـشـاقی تجلیله قـیـلان دکن
انی هر بر عـلاتقـدن تمنیـدن قـیـلان ایمن
شب دیجـور عـشـقی برق نورن ایلیـان روشن

ایدر نور جمالک اهل عشقه کلخنی گلشن
خلیل الله تابستانی بستان ایلیان سین

واتا:

ئەوەی چیای دڵی عاشقانی بەجلوە داکوتاوە
کە لە هەر پێوەندی و ڕازێک هێمنی کردووە
تاریکی شەوی عەشقی بە بروسکی نووری ڕووناک کردووە
نووری جوانیت کوڵخانی بۆ عاشقان ئەکاتە گوڵشەن
ئەوەی ئاگری بۆ خەلیلوڵلا کردە بوستان تۆی

قیلوب خورشید لطفکله منور کلبهء سینهم
سهام عشق جانانه مهیا طبلهء سینهم
ایدوب آلایش غمدن مبّرا صدر کینهم
رهایاب ایلیوب خار سنمدن روضهء سینهم
وجودم شوره زارک رشک رضوان ایلیان سین

واتا:

بە هەتاوی لوتفتان فەووارەی کڵبەی سینەم
بۆ تیری عەشقی جانان ئامادەیە طەبڵەی سینەم
دڵی ئاڵوودەی غەمم لەکینەی سینەم ئازاد ئەکەی
باغی سینەم لە دووکەڵی سینەم ڕزگار ئەکەی
ئەوەی شۆرەکاتی لەشم لەحەسادەت خۆشنود ئەکات تۆی

گوگل شاه گدا در شاه عشقنده
شمیم ناز بوی ایچون بهار بوستاننده
گوگل مرغک ایدوب گویا نوای داستاننده
بهار فیض پار اشتیاقک گلستاننده
سرشکم مایه بخش ابر نیسان ایلیان سین

واتا:

دڵی شاە گەدایە لە عەتەبەی شاهی عشقتدا
بۆ بۆنی نازدار لە بەهاری بۆستانتدا
دڵی مەلی کردووەتە خوێنەر لە باغی تۆدا

له گوڵستانی نیشتیاقدا بەهاری فەیز ڕژێن
ئەوەی فرمێسکمی کردووەتە مایە بەخشی بارانی نیسان تۆی

ئاواتی ئەوە دەخوازێت ڕۆژێک بە دەوری «کعبە»دا بسووڕێتەوە و لە پاشان روو بکاتە دەرگای پێغەمبەری خوا (ص)، لەرێی قوربانیدا دەرد و خەفەتی لە کۆڵ بێتەوە.

کی بود یارب طواف کـعـبـه و زمـزم کنم
بعـد أز ان رو در مـزار سـیـد عـالم کنم
روی خـود در سـایه، پای رسـول الله نهم
تا غـبـار مـقـدمش بر دیده، خـود جـا کنم
دست حـاجت برگـشـایم از دعـا بر درگـهش
این دل مـجـروحـرا من زان دوا مـرهم کنم
یا رسـول الله بحـالم گـوشـه، چشـمی فگن
تا شـوم قـوربان تو خـودرا خـلاص از غم کنم
سـر فـرازا از فـراق روی تـو در مـاتمم
وعـده، وصل (رضـا) ده ترک این سـودا کنم

واتا:

خوایە کەی بێت تەوافی کەعبە و زەمزەم بکەم
پاش ئەوەیش ڕوو بکەمە زیارەتگای گەورەی جیهان
ڕووی خۆم لە سایەی پای ڕەسولەلالادا دانێم
تا گەردی بەر پێی لەسەر چاوی خۆم دانێم
دەستی داماوی بۆ پاڕانەوە لە پێش درگای هەڵبرم
ئەم دڵە زامدارە بەو دەرمانە تیمار بکەم و مەلهەمی لێ بدەم
یا ڕەسوولەللا گۆشە چاوی بۆ حاڵم هەڵخە،
تا بە قوربانت بیم و خۆم لە خەم رزگار بکەم
ئەی سەربەرز، لە دووری ڕووی تودا لە خەفەتدام
گفتی ئەوە بە (ڕەزا) بدە کە پێت بگا، تا تەرکی ئەم خەیاڵە بکەم

لە شیعرێکیشیدا دەڵێت:

زبان فـارسـیم هست و لـهـجـه، عـربی

بصـــــد زبان دیگر عـــــاجـــزم زنعت نبی
بقـــدر علم خـــدا از خـــدا صلوات و ســـلام
بروح شـــاه وســـالت؛ مـــحـــمـــد عـــربی

واتا:

زمانی فارسی و دیالێکتی عەرەبیم هەیە
سەد زمانی تریش بزانم توانای وەصفی پێغەمبەرم نییە،
ئەوەندەی زانیاری خودا صەلات و سەلامی خودا
بۆ گیانی شاهی پەیامبەر موحەممەدی عەرەبی

لەگەڵ هەموو (ڕێزێکی بۆ پێغەمبەری خودا؛ شێخ ڕەزا، بەها و قەدری پێغەمبەری ئیسلام موحەممەدی مستەفا (ص) لەگەڵ حەزرەتی (مەسیح)دا دەخاتە تەرازووی قەدرەوە، کەچی تای موحەممەد (ص) لەبەر گرانی لەزەوی دەمێنێ و تای مەسیح (س) دەچێتە ئاسمان، کە دەڵێت:

مـــســـیح بر فلک و شـــاه انبـــیـــا بتـــراب
دلم ز اتش این غـــصـــه بسکه بود کـــبـــاب
ســـؤال کـــردم ازین مـــاجـــرا زپیـــر خـــرد
چو غنچـــه لب بســـخن برگـــشـــود داد جـــواب
کـــه قـــدر هردو بمیـــزان قـــدر سنجـــیـــدند
کـــه چون گـــرانتـــر ازو بود درهـمـــه أبواب
نشت کـــفـــهء مـــیـــزان مـــصطفی بزمین
بآســـمـــان چهـــارم مـــســـیح شـــد بشـــتـــاب

واتا:

مەسیح لە ئاسمان و شای ئەنبیا بە ژێر گڵدا بێ
دڵم لەداخی ئەم خەفەتە بەجارێ بووە کەباب
لە بارەی ئەم ڕووداوەوە لەپیری خاوەن وێڵم پرسی،
وەک خونچە لێوی بۆ قسە کردووە و وەڵامی دامەوە و وتی:
سەنگی هەردووکیانیان خستە تای ترازووەوە
جا چونکە شای پێغەمبەران لە هەموو ڕوویەکەوە لەو قورسترbوو،

تای تەرازووەکەی ئەم نیشتە زەوی و
مەسیحیش بەپەلە سەرکەوت بۆ ئاسمانی چوارەم

لەبابەت گەورەیی و دەسەلاتی خودادا دەلێت:

هشت بهشت و شش جهت، هفت زمین ونوفلک
جـمله تو افـریده،، (وحـدک لاشـریک لک)
مـن چیـم ای فــــدای تو، دم زنم از ثـنای تـو
ای همــه مــاسـوای تو، درکف قــدرت تویک

واتا:

هەشت بەهەشت و شەش لا و حەوت زەوی و نۆ فەلەک
هەموو تۆ دروستت کردوون بە تەنها خۆت و کەس هاوڕێت نییە،
من چیم، بە قوربانت بم، دەم لە هەلدانی تۆ بدەم،
ئەی کەسێ کە هەرچی لەتۆ بەولاوەیە لەدەستی توانای تۆدان تەنها

ای جـــهـــان آفـــرین ثنا گـــویت
وی دو عــــالم مـــــعطر از بـویت
ســـــاکـنـان ســــرادق مـلـکـوت
همــه قـــوربان یـک ســری مـــویت
کـل زخــــونین دلان رخـــســـارت
لاله از هـندوان کـــیـــســـــویت
لالـه در بـاغ داغــــــــــدار روخـت
ســــر مـــائل بقـــدر دلجـــویت

واتا:

ئەی کەسێ کە، ئەو خوایەی جیهانی دروست کردووە مەدحت دەکا،
ئەی کەسێ هەردوو دونیا بەبۆی تۆ بۆنخۆش بووە،
ئەمانەی لە خێوەتەکانی بارەگای فریشتەکانا دانیشتوون،
هەموو بە قوربانی سەری موویەکت ئەبن،
گول لەبەر جوانیی ڕوخساری تۆ خوێن پەڕیوەتە دلی،
لالە لە خولامانی کاکۆلتە،

لاله له ناو باخا داخی ڕووی تۆی له دڵیایه،
سەروی بالا بەرزیش بە عەشقی بالای دڵگیری تۆوە چەمیوەتەوە.

سـرمـه مـفـتـون چشم (مـازاغت)
نـافـــه دلريش خـــال هندويت
عارضت (والضحی) خطت (والليل)
(قـل هـو الـلـه) حـــــرز بـازويت
(قـــاب قـــوسين) را نميـــدانم
جـــز كـــمـــانهـــای هردو ابرويت
نسـخـه ء كـائنات وهرچه در اويست
شـــرح رمـــزی زمـــصـــحف رويت
باز گـــويم غم اســـارت خـــويش
بزبـان فـــــصـــــيح لا هـويت
عــرش كـمـتـر بهـای مـشت گلی
كـــه برو آرمـــيـــده بـهـلـويت

واتا:
کل مەفتونی چاوت بووە کە خوا، بە (مازاغ البصر وماطغی) باسی کردووە،
میسکی ناوکی ئاسک دڵ بریندارى خاڵی ڕەشتە،
ڕوخسارت (والضحی)یە گەندەمووی ڕووت (والليل)ە
(قل هو الله احد) پەنلی هێزی بازووتە
ئایەتی (قاب قوسین او ادنی) بەلامەوە،
لە کەوانەی برۆکانت بەولاوە نییە،
کتێبی ئەم جیهانە و هەرچیی تێدایە،
تەنها لێکدانەوەی نیشارەتێکی قورئانی ڕووتە
خەمی دیلی خۆم بە زمانی پشکووتووی،
عەرشی خودا کەمترین باییەکی مشتێ خۆڵە،
کە لاتەنیشتی تۆ لە سەری ئۆقرەی گرتبێ،

روز و شب جـــبـــريـل در پـرواز

بی ســــــروپا همی دوان ســــــویت
روضـــه خـــوانی کند بنظم در پرواز
هـمـــچـــو درویش بر ســـر کـــویت

واتا:

جبریل شەو و ڕۆژ لە فڕیندایە
بێ پەروا بەرەو لای تۆ ڕا ئەکا
ڕەوزە خوانی ئەکا بە هۆنینەوەی مرواری
هەر وەک دەروێش لەبەر دەرگاتا

(کـــز ســـرا پرده، مـــقـــدس ذات
بـر ســـــــراپـای انـورت صـلـوات)
ای مـنـادی بـکـاف و هـا، یـا، عـین
وی مـنـادی (انـا الـنـبـی بـحـنـین)
جـــبـــریل آمین بأمـــر خـــدا
وحـــیت آوردکـــای شـــەکـــو نین
خـــیـــز و برنه قـــدم بکوی قـــدم
خـــیـــز و برکش علم ز علم بعین

واتا:

لە بارەگای پیرۆزی خوواوە،
صەلەوات لە سەراپای نوورانیت بێ
ئەی کەسێ کە خوواوەند بە (کهیعص) بانگی لێ کردووی و،
ئەی کەسێ کە خۆیشت لە غەزای حونەیندا جاڕت داوە؛ من پێغەمبەرم،
جبرەئیلی ئەمین بە فەرمانی خوا
سرووشی بۆ هێنای و فەرمووی، ئەی شاهی هەردوو جیهان،
هەستە ئالا هەڵکە، تو هاتیتە پایەیەک کە نە مەودای
(کەس)ی تێدا هەبوو نەمەودای (کوێ)
نێوان تۆ و گەورەی هەموو بووەکان، ئەوەندەی نێوان دوو کەوا یا کەمتر بوو
سوێندت ئەدەم بەگیانی (حەسەن)، بەسەری (عەلی)، بەخوێنی (حوسەین)
ڕۆژی قیامەت کە هاوار ئەکەی بۆ ئومەتەکەت و

بەهیوای تکا بۆ ئادەمیزاد و جنۆکە ئەچیتە پێشەوە،

کن در آن روز یارسول الله
نظری سوی من بگوشهء عین
بنواز و مرانم از لب حوض
تر کن از اب کوثرم (شفتین)
ای بکویت سعادت ابدی
وی ز دویت شرافت حرمین
ماز امر تو غافل و بەقا
مشفق و مهربان تر از ابوین
در مزار این درود میخوانم
باز پرسند از توام ملکین
(کز سرا پردهء مقدس ذات)
برسرا پای انورت صلوات

واتا:

ئەی پێغەمبەری خوا، لەو ڕۆژدا،
بە گۆشەی چاو لایەکم بەلادا بکەرەوە،
دڵنەواییم بکە و لە کناری حەوزی (کەوثەر) دەرم مەکە
هەردوو لێوم لە و ئاوی کەوثەرە تەڕ بکە،
ئەی کەسێ کە بەختەوەری هەمیشەی لەبەر دەرگای تۆدایە و،
شەرەفی هەردوو حەرەمی (مەکە و مەدینە) لەڕووی تۆوەیە،
ئێمە لە فەرمانی تۆ بێ ئاگاین و تۆیش لە باوک و دایک بەبەزەییتری بۆمان
کە فریشتەکان لە گۆڕدا پرسیاری تۆم لێ دەکەن،
من ئەم وەڵامەیان ئەدەمەوە.
لەبارەگای پیرۆزی خواوە،
درود لە سەراپای نوورانیت بێ.

خواجهء انبیا و ختم رسل
هادی خلق و پیشوای سبل

ای همــه ممکنات جــسم و توجــان
وەی همــه کــائنات خــاروتو گل
مــحــرم کــردگــار و مــهــبط وحی
مــهــتــر اصــفــیــاء و مظهــر کل
(لم تلد مــثلک النســاء فــتی،
لم یجــد شــبــهک الزمــان رجل)
صــفت شــانئت (هو الأبتــر)
لقب باغــضت زینم وعــتل
در قــیــامت چو ذو الجــلال ترا
مــیــدهد رخــصت شــفــاعت کل

واتا:

ئەی گەورەو دواهێنەری پێغەمبەران،
ئەی ڕێ پێشاندەری خەڵک و سەر قافڵەی ڕێ،
ئەی ئەو کەسەی کەهەر شتێ بشێ ببێ لەشە و تۆ گیانییت،
ئەی کەسێ کە هەموو ئەم جیهانە دڕکە و تۆ گوڵیت،
تو مەحرەمی بارەگای خوایت و سرووشت بۆ هاتووە،
تو گەورەترینی هەڵبژاردەکانی خوایت و دیارگەی هەموانی،
دایکان کوڕی وەک تۆیان نەهێناوە،
زەمانە پیاوێکی وەک تۆی بە خۆیەوە نەدیوە،
سیفەتی ئەو کەسەی خراپەت نەڵێ ئەوەیە (خۆی کلک براوە)و
ناتۆرەی ئەوەی قینی لێتە ئەوەیە وشک و توندڕەو و نامەردە
ڕۆژی قیامەت، کە خوداوەند ڕێگەت ئەدا، تکا بۆ هەموان بکەی

آید از بارەگــاه قــدس خــدا
(لک مــاشــئت یانبی فــقل)
فکر من کن کــه کــرده ام تسبــیح
در خــرابات رهن شــاهد و مل
تا مــرا چون توی شــفــیع چه باک

ز اتش دوزخ و ســــــلاسـل و غـل

خــيـل مــحــمـودم و نميــتــرسم

از دم كــــــرنـا و بـانـك دهـل

بەهـوای تـومــــــست و بـێ پـروا

نعت گـــويان خـــرامن از ســـريل

كـــز ســـرا پرده‌ء مـــقـــدس ذات

بـر ســـــــراپـای انـورت صلـوات

واتا:

له بارەگای پیرۆزی خوداوە فەرمانت بۆ دێ:

ئەی پێغەمبەری خودا چیت دەوێ بۆت دەکرێ، بڵێ،

بیر لەمن بکەرەوە کە لە مەیخانەی نێوان یار و مەیدا

خەریکی سوبحانەڵلا کردن بووم.

منێک تکاکاری وەک تۆم ببێ، ترسم لە ئاگری دوزەخ و کۆت و زنجیر چییە؟

من لە خێڵی مەحمودم و ترسم لەدەنگی کەڕەنا و ئاوازی دەهۆڵ نییە،

مەستی خۆشەویستی تۆم و بێ ترس و لەرز بەنازەوە بەسەر

پردی سیراتا و بە تۆدا هەڵئەدەم و ئەڵێم؛

لە بارەگای پیرۆزی خوداوە،

درووود لەسەراپای نوورانیت بێ.

لە شیعرێکی تورکیشدا بە پێغەمبەرا (ص) دەڵێت:

خـيــالـك شـبـچــراغ لجـه‌ء بحـر حـقــيــقــتــدر

جــمــــالـك نـور بخش ديده‌ء اهل بصـــيـــرتدر

سن اول مـاه، فلـك جـاه، شـهنشــاه دو عـالم سن

در لطفنده شــهلر ســهــر نهــاد باب خـدمــتــدر

حريم روضنه يوز سورمكه مـشـتـاق ايكن جبـريل

قـــيـــاس ايله بكا تقـــبـــيل درگـــاهك دولتـــدر

حضـوره حال مـا فی البالنی عـرض ايلمش گلمش

(رضـا)نك التـمـاس خـاكپـايندن شـفـاعـتـدر

واتا:

خەیاڵت شەوچرای شەپۆلی دەریای ڕاستییە
جوانیت نور بەخشی چاوی خاوەن ئاگادارانە
تۆ ئەو مانگەی، جاهی فەلەک، شاهەنشای دوو جیهانی
لەبەر مرواری لوتفتان شاهان سەرشۆڕی دەرگای خدمەتتانن
جبریل کە ئارەزووی ئەوەی ئەکرد کە ڕوو بساوێتە دیواری ڕەوزەتان
بە ئەندازە لەگەڵ من، بە خۆشبەختی زیارەتی دەرگاتە،
هاتووەتە حضور بۆ ئەوەی ڕازی خۆی عەرز بکا،
تکای (ڕەزا) لە خاک و پاتان شەفاعەتە.

***

## خۆشەویستی و ڕێزی بۆ نەوەی پێغەمبەر (س)

شێخ ڕەزا ڕێز و خۆشەویستیی خۆی لەچەند هونراوێکی نایابدا، بەرامبەر میری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبو تالیب و نەوەی دەربڕیوە. لەو شیعرەیدا کە لە ڕۆژی (عاشوورا)دا لە حەوشی مەرقەدی (کاظیمێن)دا وتوویەتی و لە شیعرەکەی کە لە عشق حضرت حسین) دەڵێ و لە لێکدانەوەی شیعرەکەی (حافظ)، ڕێزێکی بێ پایانی بەرامبەریان دەردەبڕێت.

شێخ ڕەزا کە لە بەغدا بوو، لەعاشوورا لەحەوشی کاظیمێن شیوەنێکی گەورە دەبەسترێت و (ڕەوزە خوونان) یەک یەک دەچنە سەر (مینبەر) و بەنەوەی عەلیدا هەڵئەدەن. شێخ ڕەزا ئەم هەلە لەدەس نادات کە هونەری خۆی و خۆشەویستیی بەرامبەر نەوەی پێغەمبەری خوا دەربڕێت، دەچێتە سەر مینبەر و ئەم شیعرە دەڵێت:

آل علی

در ماتم آل علی خون همچو دریا میرود
تیغ است بر سر میزنند دەست است بالا میرود
از عشق آل بو الحسن این تیغ زن وان سینەزن
داد و فغان مرد و زن تا عرش اعلی میرود

واتا:

لەشیوەنی ئالی عەلی خوێن وەکو دەریا ڕێ دەکات

هەر تیغە و بەسەردا دەدات و هەر دەستە بەرز دەبێتەوە
لەعەشقی ئەولادی (ئەبو لحەسەن) ئەم تیغ لێدەرە و ئەو سینەلێدەرە
هاوار و فیغانی ژن و پیاو تا عەرشی بالا دەڕوات

پیـرامـون شـمع خـدا، یعنی حـسین مـجـتـبـا
جـانهـا همی کـردد فـدا، سرها بیـغـمـا مـیـرود
کـوتاه کن انیکاررا، بدعـتـه مکو این کـاررا
این سـوک آل حیـدرست، این خـون نەبیـجا مـیرود

واتا:

بۆ مەشعەلی مۆمی خودا، یانی حوسەینی موجتەبا
گیانان دەبن بە قوربانی، سەران بەتالانی دەڕوا
واز لە نینکار کردن بێنە، ئەم کارە بە بیدعەت دامەنێ
ماتەمی ئەولادی حەیدەرە، ئەم خوێنە بەخۆڕایی ناروا

روی زمین پرهـمـهـمـه، در دست جـانبـازان قـمـه
خـون از برو دوش همـه، از فـرق تاپا مـیـرود
من چون ننالم این زمـان، مـرد ضـعـیف ناتوان
کین برق آه عـاشـقـان، از سنگ خـارا مـیـرود

واتا:

ڕووی زەمین پڕە لە فیغان، گیان بەخت کەران دەست بەقامە
خوێن لەپشت و سەرسینگی هەموان ئەڕوا لە تەوقی سەرەوە تا پێ.
من ئیمرۆ چۆن نەناڵێنم، مرۆڤی بێ هێز و بێ دەسەڵات
کە ئەم تیشکی ئاهی ساردی دڵدارانە بەردی ڕەق ئەسمێنێ.

از ابن سـعـد بی وەفـا، شـامی و شـمـر پرجـفـا
بر آل بیت مـصـطفی، چندین تعـدی مـیـرود
بغـداد گـردد لالەگـون، در روز عـاشـورا بخـون
(واز کاظمین) آن سیـل خون تا (طاق کسرا) میرود

واتا:

لە کوڕی سەعدی بێ وەفا، لە یەزید و شمری پڕ ئازارەوە

بۆ بنەماڵەی پێغەمبەر، چۆن ئەم دەست درێژییە دەکات
بەغدا لەڕۆژی عاشورادا لەخوێندا وەکوو گوڵاڵە سوور دەبێ
لە (کاظمین)ەوە سەیلی خوێن تا (تاقی کیسرا) دەڕوا.

واز طاق کسرا سرنگون، ریزد بەپای (بیستون)
واز بیستون اید برون، سوی بخارا میرود
خوین سیاوش شد هبا، در ماتم (آل عبا)
تا دامن روز جزا، تاجیب عقبا میرود

واتا:

لە تاقی کیسرایشەوە لێژ ئەبێتەوە ئەڕژێتە داوێنی بێستون
لە بیستوونەوە دەرئەچێت بەرەو بوخارا ئەڕوا
خوێنی سیاوەحش لە خەفەتی (ئالی عەبا)دا ناوی نەما
تا دامەنی ڕۆژی قیامەت، تا گیرفانی دووا ڕۆژ ئەڕوا

لێرەدا شێخ ڕەزا گوێی لێ دەبێت، لەیەکتر دەپرسن، ئەمەکێیە و چ کەسە؟ و دەڵێت:

من سنیم نامم (رضا) کلب امام مرتضی
درویش عبدالقادرم، راهم بمولا میرود

واتا:

من سوننم و ناوم (ڕەزا)یە، سەگی ئیمامی مورتەضام
دەروێشی عەبدولقادرم، ڕێم بەرەو لای خوا ئەڕوا

لە بابەت خۆشەویستی بۆ حەزرەتی حوسێن و پایەی کەربەلا لە ئابیدەکانی ئیسلامدا دەڵێت:

لافت از عشق حسین استو سرت برگردن است
عشقبازی سر بمیدان وفا افگندن است
گر هوا خواهی حسینی، ترک سرکن چون حسین
شرط این میدان بخون خویش بازی کردن است

واتا:

لافی عەشقی حوسەین لێ ئەدەی و سەریشت بەسەر ملتەوەیە
عەشقبازی ئەوەیە لە مەیدانی وەفادا سەر دانێیت

گەر هەوا خوای حوسەینی؛ وەک حوسەین دەست لەسەری خۆت هەڵگرە
مەرجی ئەم مەیدانە ئەوەیە مرۆ یاری بە خوێنی خۆی بکا

از حـریم کـعـبـه کـمـتـر نیـسـت دشت کـربلا
صـد شـرف دارد بر آن وادی کـه گـویند ایمن است
ای من و ایمن فـــدای خـــاک پاکی کـــاندرو
نـور چشم مـصطفی ؤ مـرتضـارا مـسکن است

واتا:

دەشتی کەربەلا لە حەرەمی کەعبە کەمتر نییە
سەد قاتی هەیە بەسەر ئەو شیوەدا کە پێی ئەڵێن (وادیی ئەیمەن)
(ئەو شیوەی مووسا دەنگی خوای تیا بیست)
ئەی من و شیوی ئەیمەن بە قوربانی ئەو خاکە پاکە بین کە
نشینگەی نووری چاوی موستەفا و عەلییە

زهـره‌ء زهـرانـگـین و خـــاتم خـــیـــر الـوری
زور و زهری مـرتضی ؤ حـیـدر خـیـبـر کن است
سـنیـم سنـی ولیـکـن حب آل مـــصـطـفـی
دیـن و ایـین مـن و، آبـاو و اجـــداد مـن است

واتا:

جوانیی فاتیمەی زەهرا و مۆرخانەی ئەموستیلەی دوا پێغەمبەرانە
بەری خاوێنی جەنابی حەیدەری قەڵای خەیبەر لەبن هەڵکەنە
من سوننیم سوننی، بەڵام خۆشەویستیی کەسوکاری پێغەمبەر
دین و ئایینی خۆم و با و باپیرانمە

شـــیـــعـــه و سنی ندانم، دوســتم باهر کــه او
دوست باشـد، دوشـمنم آنرا کـه با او دشـمن است
حب آلو سب اصـــحـــاب نبـی یا للعـــجب
از قـبـیل نام سـبـحـان بردن و گـوه خـوردن است

واتا:

من شیعە و سوننی نازانم، دۆستی هەر کەسێکم کە دۆستی ئەو بێ و

دوژمنی هەر کەسێکم لەگەڵ ئەو دوژمن بێ
خۆشەویستنیی کەسوکاری پێغەمبەر و جنێودان بە یاران و هاوڕێیانی لە هەمان کاتا
شتێکی سەیرە، لەوە ئەچێ یەکێ سوبحانەڵلایش بکا و گوویش بخوا

شێخ ڕەزا، لەگەڵ ئەم هەموو ڕێزەی بۆ نەوەی پێغەمبەر (ص) بیری خۆی دەردەبڕێت و جیاوازی دەکات لە نێوانی ئەوان و نێوانی شیعە و خۆیشی لە شیعە دوور دەخاتەوە و بیر و باوەڕی ئاینیی رون دەکاتەوە.

ایمان بخـــدا دارم و پیـــغـــمـــبـــر و اصـــحـــاب
نه شـــیـــعـــهء ســبـــابم و نه بابی سگبـــاب

واتا:

باوەڕم بەخواو بە پێغەمبەر و هاوڕێیانی هەیە.
نەشیعەی جنێو فرۆشم و نە بابیی سەگبابیشم

لەبەر ئەوەی جیاوازییەک لەنێوانی «ئەصحاب»ی پێغەمبەر (ص) ناکات کەلە نەوەی خۆی بن یانا، لە «خولەفای ڕاشیدین» کامیان زۆرتر سوودیان بۆ ئیسلام بووە پتر ڕێزی لێ گرتووە.

مـسند آرای خـلافت بحـقـیـقت عـمـر است
گـوش بر شـیـعـهء ناپاک مـده شـیـعـه خـراست
شـــیـــعـــهء فـــاحـــشـــهء آیة حق در قـــران
بـهـــــر ناپاکی آن قـــــوم دلـیلی دیگر است

واتا:

ئەوەی کورسیی خەلافەتی بەڕاستی ڕازاندەوە عومەرە
گوێ بۆ شیعەی ناپاک شل مەکە چی ئەڵێن، شیعە کەرن
کە خوا خۆی لە قورئانا فەرموویەتی (شیعةُ فاحشةُ)
ئەوە بەڵگەیەکی تری ناپاکیی ئەو تایەفەیە

یارب این طائفـــهء بد کـــه چه ناپاکـــان اند
دخت بوبکر کـه هم خـوابهء خـیـر البـشـر است
نوکـــر و خـــان و خـــوانین عـــجم، دودکـــیند
این همـــه اثر مـــعـــجـــز مـــولا عـــمـــر است

واتا:

خوایه ئەم تایەفە بەدە چەند ناپاکن

(عایشەی) کچی ئەبوو بەکر کە هاوسەری چاترینی ئادەمیزادە

نۆکەر و خان و خەوانینی عەجەم هەموو کرماویی دانن!

ئەمە گشتی نیشانەی موعجیزەی حەزرەتی عومەرە

(شـیـعـه) دوم دارد این طرفـه نبـاشـد بعـقل

گـرچه حـیـوان بنوده لیک ز حـیـوان بد تراست

پـیـشـوایـان ره دیـن هدی هەکـــه دهد

زان ره خـوف وخطر قـصـه ء شـان الحـذراست

واتا:

شیعه کلکیان هەیە. ئەمە بەعەقڵ سەیر نییە

هەرچەندە حەیوان نین، لە حەیوان بەدترن

پێشەوایانی ڕێگای ئاینی خواناسین هەرکەس بووبن

باسیان شایانی ئەوەیە مرۆ خۆی لێ بپارێزێ کە ڕێیەکی پڕ مەترسییە

این قـدر هوش و خـرد برسـر این طائفـه نیـست

کـه خـدارا نـکند آنکه نبی را ضـرر است

مـردهاشـان کـه بتـابوت گـذارند چو سگ

سگ دوصـد مـرتبـه زایشـان بخدا خـو بتـراست

واتا:

ئەم تایەفە ئەوەندەیان مێشک لەکەللەدا نییە بزانن خوا،

خوانەکەردە، شتێ ناکات زیانی پێغەمبەری تیابێ

مردوویان وەک سەگ ئەنێنە تابووت ( و ئەیبەن بۆ کەربەلا و نەجەف)

سەگ بەخوا قەسەم دوو سەد پلە لەوان چاکترە

لعن و نفـرین ایشـان همـه بر شـمـر یزید

لعن (لامع) بهـمـان طائفـه ء خـیـره سـر است

نەخـدا راضی از ایشـان، نه علی بود رضـا

سب اصـحـاب نبی، مـوجب نار سـقـر است

واتا:

لەعنەت و نەفرینی شیعە هەموو لە شمر و یەزید

لەعنەتی (لامیع)یش لەسەر تایەفەی شیعەی سەرگێژە

نەخوایان لێ ڕازییە و، نە عەلییشیان لێ ڕازی ئەبێ

جنێودان بەهاوڕێیانی پێغەمبەر مایەی چوونە ناو ئاگری دۆزەخە

لەکاتێکدا ئەم هەموو قسانە دەڵێت، خۆی نارەزایی و قینی بەرامبەر شەهید کردنی ئیمامی حوسەین دەردەبڕێت.

از ابن سـعد بیـوفـا، شـامی وشـمـری پرجـفـا

بر ال و بیت مـصطفی، چندین تعـدا مـیـرود

***

## ڕێزی شێخ ڕەزا بۆ بارەگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی

بۆ یەکەم جار هاتنی شێخ ڕەزا بۆ بەغدا، لەگەڵ شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی و براکانی، بۆ زیارەتی مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بوو. دەڵێن بۆ یەکەم جار لە مەرقەدی شێخ دا ئەم شیعرە فارسییەی وتووە.

این بارگـه حـضـرت غـوث الثـقلین است

نقـد کـمـر حـیـدر و نجل حـسنین است

مـادرش حـسـین نـسب است و پدر او

ز اولاد حـسـن، یعنـی کـریم الابوین است

واتا:

ئەمە بارەگای حەزرەتی فەریاد ڕەسی ئادەمیزاد و پەرییانە

ئەختێنەی بەرپشتێنی حەیدەر و ڕۆڵەی حەسەنەینە

دایکی لە نەوەی حوسەین و باوکیشی

لە نەوەی حەسەنە، واتە دایک و باوکی جسن و ڕەسەنن

ئەم شیعرەی شێخ ڕەزا تاکو ساڵانی هەشتاکان لەسەر هەردوو دەرگای مەرقەدی شێخی گەیلانی نووسرابوو. وا دیارە لەبەر ئەوەی بە فارسییە، لایان برد. شێخانی تاڵەبانی، لەبەر ئەوەی پێشەوای ڕێبازی قادرین، ڕێزێکی بێ پایانیان بەرامبەر ئەم بارەگایە و

نەوەی گەیلانی هەبووە. شێخ ڕەزایش هەر وەکوو باوباپیری هەر بەهرە و پایە بەرزییەکی دەسکەوت بوویێت، لەسایەی پیرانی تەریقەتی دەزانێت.

کــارم کــه بکامــست، نه از شــاه و وزیر است
هر مــایه کــه دارم همــه از ســایهء پیــر است
ان پیـــر کـــدام است چه نام است مـــرادرا
آن مــهــر جــهــان تابش و، وان مــاه منیــر است

واتا:

من که کارم بەئارەزووی خۆم بۆ جێبەجێ ئەبێ، بەهرەی شاه و وەزیر نییە
هەر سەرمایەیەکم هەبێ لەسایەی پیرەوەیە
ئەو پیرە کامەیە، ناوی چییە وا؟!
ئەو خۆری جیهان ڕوونکەرەوە و ئەو مانگە تیشک دەرەوەیە

آن پیــر نه‌شــبلی و، نه مــعــروف و، جنیــد است
اینهــا همــه یک جلوه از آن پیــر کــبیــرست
هر گـــربه کـــه پروه‌رده‌ء خـــوان کـــرم اوست
صیدش، همه ببراست و، شکارش، همه شیراست

واتا:

ئەو پیرە نەشیبلییەو، نە شێخ مەعرووفی کەرخییەو، نەجونەیدی بەغدایییە
ئەمانە هەموو تاقە تیشکێکن لەو پیرە مەزنە
هەر پشیلەیەک لەسەر سفرە و خوانی بەخششی ئەو پەروەردە بووبێ
نێچیری ڕاوی هەموو بەورو هەموو شێرن

لەبابەت پایە بەرزیی شێخ گەیلانی دەڵێت:

گلســتــانی کـه خـوانند آسـتـان غـوث گـیـلانش
زده فـیض مـقـدس خـیـمـه در صـحن خـیـابانش
مطاف شــیــر مــردان طریقت کــعــبــهء کــویش
ســر گــردن فــرازان حــقــیــقت گــوی مــیــدانش

واتا:

ئەو باخچەیەی پێی ئەڵێن بەردەرگای غەوسی گەیلانی

بەرەکەتی پیرۆزی خوا لەپانایی شەقامەکەیا ڕشماڵی هەڵداوە
کەعبەی بەردەرگای تەوافگای شێرە مەردەکانی تەریقەتە
سەری گەردن بەرزانی ڕاستی لە مەیدانی ئەوا (گۆ)یە

غـلام کـمـتـرینشـرا لقب شـد خـواجـه ٔ احـرار
بقطب العـارفین مـشـهـور شـد طفل دبسـتـانش
(بهـای نقـشـبندی) خـوشـه چین خـرمـن جـودش
(شـهـاب سـهـروردی) کـاسـه‌لیس خوان احسـانش

واتا:

(خواجەی ئەحرار) نازناوی کەمترین بەندەی ئەوی وەرگرتووە
منداڵی قوتابخانەی بە (قوتبی خواناسان) ناوبانگی دەرکردووە
(بەهای نەقشبەندی) لە خەرمانی بەخششی ئەودا گوڵ چنی ئەکا
(شەهابی سەهرەوەردی) کاسەی حەسەناتی ئەو ئەڵێسێتەوە

هزاران (شـمـس تبـریزی) خـراب باده ٔ عـشـقش
هزاران (پـیـری جـامی) جـرعـه نوش بزم عـرفـانش
شـاهنشـاهان طفـیل و تاج داران طوق در گـردن
خـداوندان، اسـیـر و شـهـریاران بند فـرمـانش
(رضـا) را همـتی شـهـبـاز لاهوت آشـیـان یعنی
بینگی اسـتـخـوانی و سگ درگـاه خـود خـوانش

واتا:

هەزاران (شەمسی تەبریزی) بەبادەی عەشقی ئەو سەرخۆشن
هەزاران (پیری جامی) قومی بەزمی عیرفانی ئەو هەڵئەمژن
شاهنشاهان هەموو کەوتوونەتە دووی و تاجداران تەوقیان لەمل دایە
پادشایان دیلن و حوکمڕانان گرفتاری فەرمانی ئەون
ئەی شابازی هێلانەی لاهوت هیممەتی درهەق (ڕەزا) بکە، واتە
ئێسقانێ تووڕ دەرە بەردەمی و بە سەگی بەر دەرگای خۆتی ناوبەرە.

لەمەدحێکی تری شێخی گەیلانیدا دەڵێت، لەبەر ئەوەی گەورەیی گەوهەری قەدری لە سەدەفی دنیادا جێگای نەدەبووەوە، ئەمە بوو کە کۆچی دوایی لەدونیا کرد.

سر نتابد فلک از بندکی حضرت شیخ
به میان بسته چو جوزا کمر خدمت شیخ
هر کرا دیده ء دل باز شود می نگرد
طارم عرش بزیر قدم رفعت شیخ

واتا:

فەلەک لە بەندەیی حەزرەتی شێخ سەر پێچی ناکا
وەک ئەستێرەی جەوزا پشتێنی بۆ خزمەتکاریی حەزرەتی شێخ لەپشت بەستووە،
هەرکەسێ بینایی دڵی بکرێتەوە ئەبینێ
گومەزی عەرش لەژێر پێی پایە بەرزیی شێخ دایە،

وسعت گوهر قدرش صدف دهر نداشت
مگر این بود ز دنیا سبب رحلت شیخ
چون ولایت به اصالت زأزل خلعت اوست
تا ابد ماند، بجا سلطنت و شوکت شیخ
چون ملک باز بدرگاه قبولش خوانند
بر عزازیل گر افتد نظر رحمت شیخ
شیر مردان خدا شبلی و معروف و جنید
پاسپانند بگرد حرم حرمت شیخ
(لامعا) قصه ء اغیار نشاید کەترا
بر زبان بگزرد الا سخن مدحت شیخ

واتا:

سەدەفی گەردوون جێگەی گەوهەری ئەوی تێدا نەئەبووەوە
ڕەنگە هەر ئەمە بووبێ بوو بەهۆی کۆچ کردنی شێخ لەم جیهانە
لەبەرئەوەی کە وەلییەتی هەر لەسەرەتاوە بەئەسڵییەتی خەڵاتی ئەوە
هەتا دنیا دنیایە شەوکەوت و سەڵتەنەتی شێخ لەجێی خۆیا ئەمێنێ
ئەگەر سەرنجی لوتفی شێخ بەر شەیتان بکەوێ،
وەک فریشتە بانگی ئەکەنەوە بۆ ناو دەرگای پەسەندی
شیبلی و شێخ مەعرووف و جونەیدی شێرە پیاو

به دەوری حەرەمی حورمەتی شێخدا پاسەوانن
(لامیع)! شایان نییە تۆ قسەی کەس بەسەر زمانتا بێ
مەگەر قسەیێ کە پێدا هەڵدانی شێخ بێ

هەر لەپایە بەرزیی شێخی گەیلانیدا لەم شیعرەی خوارەوە دەڵێت:

علو قـدر عـبـدالقـادری اوچ انبـیـادن صـور
غـبـار خـاک نعلینی رقـاب اولیـادن صـور
او باز سـرفـرازک آشـیـانی نیـردەدر بیلمم
آنی بالانشـینی بارگـاه کـبـریادن صـور

واتا:

هەواڵی بەرزیی قەدری عەبدولقادر لە سێ پێغەمبەر بپرسە (موحەممەد، عیسا و مووسا)
هەواڵی تۆزی خاکی پێڵاوی لەملی ئەولیا بپرسە
ئاشیانی ئەو بازە سەرفرازە لەکوێیە نازانم
ئەوە لە بارەگاهی باڵا نشینی گەورەیی بپرسە.

لەگەڵ ئەم هەموو ڕێزەی بۆ شێخی گەیلانی، شێخ ڕەزا، لەجێی خۆیدا، لەڕەخنە و لە هەجوی نەوەی گەیلانی زوبانی نەپاراستووە، وەکو بە سەید مەحموودی نەقیبی گەیلانی دەڵێت:

(نقیبک) نقبنه گیرمش هزاران کیر افغانی
گوتی وارسه دیانسون نسل پاک غوث گیلانی

واتا:

هەزاران کێری ئەفغانی بەکونی نەقیبدا چووە.
ئەگەر قنگی هەیە با بەرگە بگرێت نەوەی پاکی غەوثی گەیلانی

هەروا دەڵیت:

أرجع بغـداد، وانا غـريبـهـا
على جنة المأوى، لولا (نقـيـبـهـا)

واتا:

من غەریبم و بەغدا بەسەر بەهەشت دەدەم ئەگەر نەقیبی تێدا نەبوایێ

چونکە نەقیبی بە پیاوی سیاسەت دەزانی نەک بەپیاوی ئایینی پەرست.

لەم شیعرە تورکییەدا، شێخ ڕەزا لە سەر ڕێبازی شێخ قادر (فائز)ی برای بە هەژارییەوە ئەنازێ، بەڵام پشت دەبەستێتە شێخی گەیلانی و لەوەوە هێز وەرئەگرێت:

شراب خون دل، صهبای اشک حسرتم واردر
بو مأتم خانەی سینەمده بزم عشرتم واردو
در پیر مغان بگچیلرک باش قوماندانی
بنم کیم سایهء فقرمده شان و شوکتم واردر
بنی خالی بیلورسک قوه قدسیەدن جاهل
سگ درگاه غوثم بن دخی برهمتم واردر

واتا:

ئارەزووی بادەیی صەهبای سوورم هەیە
لەشینی خانەی سینەمدا ئارەزووی خۆشیم هەیە
لەسەر لەشکری ئێشک گیرانی پیری موغان
لەسایەی هەژاریدا شان و شەوکەتم هەیە
وا تێ دەگەی کە من لە هێزی قودسییەدا بۆشم ئەی نەزان
صەگی دەرگای گەیلانیم منیش هیممەتێکم هەیە.

***

### لەسەر ڕێبازی قادری

شێخ ڕەزا لە بنەماڵەیەکە، هەر لە مەلا مەحموودی زەنگەنەوە، لەو ناوچەیانە پێشەوایی ڕێبازی قادرییان کردووە، ڕێز و ئیخلاس بۆ بارەگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی و ڕێبازی دەروێشانەی ئەو سنووری بۆ نییە. لەسەر ڕێڕەوانی قادری لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت:

سالک ملک بقادر سالکان قادری
تارک کوی فنادر سالکان قادری
جهد ایدوب علم الهیدن سبق خوان اولدیلر
وارثان انبیادر سالکان قادری
جامهء عرفان ایله تزیین باطن ایتدیلر

ظاهر اهل قـــيـــادر ســـالكان قـــادری
مـجلس اشـراقـيـاندر حلقـهء اذكـارلری
ســـر قلبـــه آشنادر ســـالكان قـــادری
ايلمـشلر دللرک گنجـينهء غـيب الغـيـوب
مـــخـــزن ســـر خـــدادر ســالكان قـــادری
چوق فنا فی اللهـدن سيـر الی الله ايتـمكه
رهروان كـــبـــريادر ســـالكان قـــادری
فـيض ارشاديله تسـخـير ايتمـهده طالبلری
گـــوييـــا مـــعـــجـــز نمادر ســالكان قـــادری
بوسـتـانی ذكری جهری ايچره درنا لشكری
بلبل باغ (رضـــا) در ســـالكان قـــادری

واتا:

ڕێرەوانی ولاتی جاویدین ڕێرەوانی قادری
پشت لە ولاتی نەمانن ڕێرەوانی قادری
تێکۆشان، یەکەم خوانچەیان برد لە زانستی خواپەرستیدا
وارثی پێغەمبەرانن ڕێرەوانی قادری
بە بەرگی زانستی خواناسی دەروونیان ڕازاندەوە
شغل و ذیکریان ئاشکەرایە ڕێرەوانی قادری
حەلقەیی ذیکریان مەجلیسی ئیشراقییانە
شارەزایی ئەسراری دڵن ڕێرەوانی قادری
دڵیان کردووەتە گەنجینەی غەیبولغویووب
عەماری سرری خودان ڕێرەوانی قادری
زۆر لە (فەنافیللاه)ە و بۆ بەرەو خوا چوون
پێشەوای گەورەیین ڕێرەوانی قادری
بە پیرۆزی و بەرەکەتی ڕێ نومابییەوە ئەو مریدانەی مل کەچن
هەر ئەڵێی موعجیز نوێنن ڕێرەوانی قادری
لە بوستانی ذیکری ئاشکەرا ناڵینیان لە دەرووندایە
بولبولی باغی (ڕەزا)ن ڕێرەوانی قادری

## لەسەر ڕێبازی نەقشبەندی

شێخ ڕەزا، لەگەڵ هەموو ڕێزی بۆ ڕێبازی قادری، ڕێبازی نەقشبەندیش بە ڕێبازێکی خواپەرستیی ڕەوادا دەنێت و زۆر بەڕێزەوە باسیان ئەکات. لە شیعرێکی تورکیدا ڕەوشتیان پەسەند ئەکات ئەڵێت:

گل صد برک گلزار جناندر نقشبندیلر
هزاران گلستانی لا مکاندر نقشبندیلر
غدا جویان عشقه بذل ایدرلر زاد ارشادی
جوانمردان قصر عارفاندر نقشبندیلر
دبستان ادبده خواجهء خضر لدنیدن
سبق خوانان ختم خواجگاندر نقشبندیلر
حقیقتده صفای قلبه نائل اولدیلر بونلر
نقوش غیریدن حرز اماندر نقشبندیلر

واتا:

گوڵی صەد گەڵای گوڵزاری بەهەشتن نەقشبەندییەکان
هەزاران گوڵستانی بێ لانن نەقشبەندییەکان
زادی ئیرشادیان دەبەخشنە شەیدای زادی عەشق
جوامێری قەڵای خواناسین نەقشبەندییەکان
لە قوتابخانەی ئەدەبدا لە مامۆستا خدر زانستی سفرەیان ڕفاند
سفرەی خەتمەی خواجەکانن نەقشبەندییەکان
لە ڕاستی گەیشتونەتە خاوێنیی دڵ ئەمانە،

جمال ذات حقی بولدیلر اعیان کنزنده
بو صورتده عیان اندر عیاندر نقشبندیلر
ایدلر هوش دردم خلوت اندر انجمن دائم
(رضا)یه مرکز قطب زماندر نقشبندیلر

واتا:

جوانیی ذاتی خودایان لە ناوی جواناندا دۆزییەوە
بەم جۆرە زۆر ئاشکەران نەقشبەندییەکان

له بەستنی کۆڕی نهێنیدا دەردم دەدۆزنەوە
بۆ (ڕەزا) مەرکەزی قوتبی زەمانن نەقشبەندییەکان

هەروا ڕێزی بەرامبەر پێشەوای ڕێبازی نەقشبەندی شێخ بەهائوددین دەردەبڕێت و لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێت:

قبلهء حاجت بود روی بهاءالدین ما
طاق محرابست روی بهاءالدین ما
تکیهء روحانیست آستان حضرتش
منزل جانان بود کوی بهاءالدین ما

واتا:

قیبلەی ڕووتێکردنی پێویستییە ڕووی بەهائوددینمان
تاقی میحرابی مزگەوتە ڕووی بەهائوددینمان
تەکیەی ڕوحانییە بەر دەرگای بەهائوددینمان
نیشینگەی دۆستانە شاری بەهائوددینمان

بوی بو یکراست بویش در مشام سالیکان
خوی پیغمبر بود خوی بهاءالدین ما
هر کسی آرام باید از پریشانهء غم
در قرار تاب گیسوی بهاءالدین ما

واتا:

بۆنی بۆنی با بەکرە لە لووتی سالیکان بۆنی بەهائوددین
خووی پێغەمبەرە خووی بەهائوددینمان
هەر کەسێ پێویستی بە ئارامی بێت لە پەریشانی غەم
دەچێتە قەرارگای کاکوڵی پرپێچی بەهائوددینمان

پنجهء گستاخ دست منکرانرا بشکند
قوهء اقرار بازوی بهاءالدین ما
جستو جو کردم بحمدالله در بحر (رضا)
یافتم لؤلؤ زنو بوی بهاءالدین ما

واتا:
پەنجەیی بێ ئەدەبی دەستی ناپەسەندان دەشکێنێ
هێزی ئیقراری بازووی بەهائوددینمان
لە سایەی خوداوە لە دەریای (ڕەزا)دا گەڕام،
مرواریم پەیدا کرد لە بۆی بەهائوددینمان

بەڵام کە پێی دەڵێن بێرە سەر ڕێبازی نەقشبەندی، ڕقی هەڵدەستێت و دەڵێت:

کــهنه رندی چون (رضـــا) از خـــاندان قـــادری
نقـشــبندی کی شـــود، إســلام؛ آنکه کــافــری
من همـــــانم شـــیـــر نررا در کــــمندم آورده ام
مـــــاده روباها توخـــــواهی در کـــمندم آوری؟

واتا:
کۆنە بلیمەتی وەکو (ڕەزا) لە بنەماڵەی قادری
چۆن ئەبێ بە نەقشبەندی، چۆن ئەشێ مرۆڤ موسڵمان بێت ببێتە کافر
من ئەو کەسەم نێرە شێرم خستووەتە کەمەندەوە
هەی ڕێویی مێنگە، تۆ ئەتەوێ من کەمەندکێش کەی؟!

***

## بۆ مەرقەدی شێخ نورەددینی بریفکانی

شێخ ڕەزا لە هاتوچۆی بۆ ئەستەمووڵ، بە کوردستاندا ڕێگای دەکەوێتە بریفکان زیارەتی مەرقەدی شێخ نوورەددین بریفکانی دەکات. لە شیعرێکی فارسیدا باسی ئەم سەفەرەی ئەستەمووڵ و شێخ بریفکانی دەکات.

عـــزم دیار روم چوکـــردم ز شـــهـــرزور
افـتـــاد در دیار (برفکان) مـــرا عـــبـــور
کـــــوهی بلند پایه در آن رهگزار بود
بگداخـــتـــــه زتاب تجلی بســـــان طور

واتا:
کە لە شارەزوورەوە کەوتمە ڕێ بۆ وڵاتی ڕۆم
گوزەرم کەوتە وڵاتی (بریفکان)

کێوێکی بەرز لەو ڕێگوزەرەدا بوو
هەر وەک کێوی طوور بە تیشکی تەجەللای خوا توا بووەوە.

حـیـران شـدم ز نشـئـه‌ء آن کـوه پر شکوه
پرواز کـــرد از ســـر من طائر شـــعـــور
آواز کـــرد ناگـــهـم از غـــیب هاتفی
کـــاین راز پرتوو لحظه‌ء دیگر کند ظهـــور

واتا:

لە نەشئەی ئەو کێوە پڕ شکۆیە سەرسام بووم
پەلەوری هەست لە سەرما هەڵفڕی
لە پڕ هاوارکەرێ لە غەیبەوە هاواری لێ کردم وتی:
تاوێکی تر ئەم نهێنییەت بۆ دەرئەکەوێ.

زان کـــوه نـیـکبـــخت چو بالا بر آمـــدم
بنمـــود چون رواق فـلک کنبـــدی ز دور
پرســـیـــدم این رواق منور از آن کـــیـــست
بخ بخ تبـــارک الله از این جنت و قـــصـــور

واتا:

کە لەو کێوە خۆشبەختە سەرکەوتمە سەر
وەک کۆشکی ئاسمان گومەزێ لە دوورەوە دەرکەوت
پرسیم ئەم کۆشکە نوورانییە هی کێیە؟
بەخ بەخ، خوا بەرەکەتی تێخا ئەم بەهەشت و کۆشکە

مـــانند قـــرص انور زرین آفـــتـــاب
می تافـــتی زبام و درش لمعـــه‌ء نور
گـفـتـنـد این ضـریحـه قطبی ز اولیـا است
پیـــمـــوده ســـاقی ازلش باده‌ء طهـــور

واتا:

وەک قرص ڕووناکی زێڕینی خۆر
پارچە پارچە ڕووناکی لە سەربان و دەرگاکەیەوە ئەدرەوشایەوە،

وتیان ئەمە ئارامگای قوتبێکە لە خۆشەویستانی خودا،
مەیگێڕی ئەزەل جامی بادەی خاوێنی بۆ پڕ کردووە،

این مرقـد حـبیب خدا (شـیخ نووری) ست
جسمش بخاک خفـته و جان رفت درحضـور
آیـند فـــوج قـــوج زبهـــر زیارتـش
از آســمـــان مـــلائکه در صــورت طیــور

واتا:
ئەمە ئارامگای دۆستی خوا (شێخ نووری)یە،
لاشەی لەناو خاکدا نووستووە و گیانی چووەتە حضووری خودا
پۆل پۆل فریشتە لە ئاسمانەوە لە شێوەی پەلەوەردا
دێن بۆ زیارەت کردنی

ســازد خـدا به پایهء جـمـشـیـد بر ترش
مــوری اگـر به ســایهء قـصـرش کند مـرور
یارب بجـــاه حـــرمت این قطب اولیـــا
جرم (رضا) ببخش که فرمودەئی انا الغفور
روزی مکن در این سـفـرش رنج و مـحنتی
باز آورش بشـــادی و آســـایش و ســـرور

واتا:
ئەگەر مێروولەیێ بە سێبەری کۆشکەکەیدا تێپەڕێ،
خودایە پایەی لە پایەی جەمشید بەرزتر ئەکاتەوە،
خوایە بۆ خاتری حورمەتی ئەم قوتبی ئەولیایە،
تاوانی (ڕەزا) ببەخشە، چونکە فەرمودەی خۆتە: لە گوناه خۆش ئەبم
ڕۆژێ لەم سەفەرەدا تووشی دەرد و مەینەتی مەکە،
بەخۆشی و شادی بیهێنەوە شوێنی خۆی.

***

## لەگەڵ شێخانی بیارە و تەوێڵە

وا دیارە شـێخ ڕەزا پێـوەندییـەکی وای لەگـەڵ شـێـخـانی بیـارە و تەوێڵـەدا نەبووە،

لەبەرئەوە  زۆر باسیان ناکات. شێخانی بیارە دۆستایەتییان لەگەڵ تەکیە و شێخانی تاڵەبانیدا هەبوو.

لە چوار خشتەیەکدا، شێخ ڕەزا شێخ عومەری بیارە لەگەڵ شێخ عەلیی تەوێڵەدا هەڵدەسەنگێنێت کە دەڵێت:

مکن بهانه که من پیرم و علی است جوان
منم سزای مشیخت بعلت پیری
بهیچ نحو صرفه از علی بنرد
نه همچو وصف حقیقت است عدل تقدیری

لێرەدا شێخ ڕەزا زیرەکانە بە هانووی شێخ عومەر دەبڕێت و دەڵێت:

واتا:

بیانوو مەهێنەوە کە تۆ پیری و عەلی هێشتا گەنجە،
من بە هۆی پیرییەوە شایانی شێخایەتیم،
عومەر بە هیچ جۆرێ پێشی عەلی ناکەوێ
(عەدلی تەقدیری) هەرگیز نابێ بە (وەسفی حەقیقی)

* وشەی عەلی سیفەتە، بەڵام (عومەر) کە (ممنوع من الصرف)ە عەدلی تەقدیری تێدایە گوایە ئەصڵەکەی (عامر)بووە، هەرگیز عەدلی تەقدیری نابێت بە وەسفی حەقیقی.

بە یەکێک لە خەلیفە توندڕەو و بێ عەقڵەکانی (تەوێڵە)یش دەڵێت:

خلیفه ساخته شیخ (طویلە) چو تو خری
بلی خلیفهء شیخ (طویله) خر باشد

واتا:

شێخی (تەوێڵە = تەویلە) کەرێکی وەکو تۆی کردووە بە خەلیفەی خۆی بەڵێ دیارە کەسێ جێنشینی شێخی (تەویلە) بێ نەبێ کەر بێ!

***

### مەدحی مەلا ئەبوبەکری مەلا عومەر (مەلا کچکە)

مەلا ئەبوبەکر کوڕی مەلا عومەرە. دانایەکی ئیسلامی بە ناوبانگ، لەو قوتابخانەیەی کە خۆی دروستی کردبوو لە دێی (باداوا)ی نزیکی شاری هەولێر، مامۆستای زانیاریی

ئیسلامی بوو و گەلێک لە فەقێ و سوختە لە عیلمی سوودیان وەرگرت. شێخ ڕەزا لەم شیعرە تورکییەدا کە مەدحی مەلای گچکە ئەکات، باسی چەوتوچێڵیی بار و دوخی وڵات ئەکات کە گەلێک هەن گەیشتوونەتە پایەیێک لایقی ئەوە نین و لەن و ئەو جیهانەدا کە جڕوجانەوەرێکی زۆری تێدایە (مەلای گچکە) وەکوو گوڵێک لە نێوان دڕکو داڵێکی زۆردا گەشکە ئەخاتە دڵەوە.

بو شفق کیم فلک لکهء دامانیدر
پایمال ایتدیکی مظلوملرک قانیدر
آه مظلوم، نسیم چمن مفخرتی
دهن زخم جگر غونچهء خندا نیدر
مطلع جدی، چراگاه حمل، خانهء تور
بر طاقم جانورک عرصهء جولانیدر
اوستنه قونمش اسد سرتنه بینمش سرطان
روز و شب ملعبهء عالم حیوانیدر

واتا:

ئەم شەفەقە کێیە، خاڵی ڕۆشن کەرەوەی فەلەکە
خوێنی ئەو جۆر لێکراوانەیە کە پاماڵ کراوە
ئاهی مەظلوومان نەسیمی باغی خۆ هەڵکێشانیەتی
زاخاوی برینی جەرگ غونچەی خەندانیەتی
دەرکەوتنی (جدی) چراگای (حمل) خانەی (ثور)
مەیدانی جەوەلانی دستەیەک جانەوەرانن
(أسد) نیشتووەتە سەری، (سرطان) سواری پشتی بووە
ڕۆژ و شەو و وازیخانەی عالەمی حەیوانییەتی

گر بو و حشیلک ایسه نطفهء آباه
مدنیت صفت غول بیابانیدر
گیج بو اقبال جهاندن نه سعادت امولور
بر نبارک که ستم اعظم ارکانیدر
بر بوقک کوکسنه جوهرلی ینشانلر دیکلور

کـه فـلان مملکتک قـوجـه قـومـاندانیـدر
بر اوصـورغـانی ایدر پوست نشـینی ارشـاد
صـانکه (ویس القـرەنک) زبدەء اقـرانیـدر
(بو الهدی) کلب حلب مخلصی عالیسی ایکن
شـمـدی شـیخ الوزراء طرەء عنوانیـدر
اویله مـحـصـول زنا، خـائن مـادر بخطا
رخنه جـوی نسب حـضـرت گـیـلا نیـدر

واتا:

ئەگەر ئەم جانەوەرییە بێت نوتفەی باوکان
شارستانی سیفەتی غوولی بیابانە.
برۆ، لەم ئیقبالی جیهانە هیوای چ خۆشبەختی دەکرێت
لە بینایەک کە ستەم چوار قورنەی گەورەیەتی
بە سینگی گوویەک نیشانی گەوهەردار دەدوورێت
کە گەورە قوماندانی فلان ولاتە
ترکەنێک دەکاتە پوست نشینی ئیرشاد
وەکوو زوبدەی هاودەمانی (وەیسولقەرەنی) بێت
(بولهودا)ی سەگی حەلەب کە نۆکەری شکۆی بوو
ئێستا (شێخولووزەرا) طورەی ناونیشانیەتی
یەکێکی وا لە زینا بوو و خائین و دایک حیز
بووەتە ڕەخنەگری نەسەبی گەیلانی!

بوگـبی ایشلری چو قـدر فلک سـفله نواز
ایسـتـەمز هر نه دیرسن شـیـمـەء انسـانیـدر
اصل انسـان دیدیگک جـوهر نایاب اگـر
اولسـه، اربیلدەکی عـلامـەء ربانیـدر
حضرت (حاجی عمر زاده کوچک ملا) کیم
مـایەء کـسب غنا سـایەء احـسـانیـدر
کـیـمـیـا ممکی ایسـه حـاصل فـیض نظری

جــام جم وار ایســـه آینه‌ء وجــدانیــدر
(ابن سینا) گبی چوق عالمه حکمت گستر
ســبق آمــوختــه‌ء مکتب عــرفــانیــدر
نامــه پیــرای حکم خــامــه‌ء مــعجــز اثری
چهــره پرداز کــرم دست زر افــشــانیــدر

واتا:

ئەم جۆرە کارانەی زۆرە فەلەکی سفلە نەواز
نایەوێ هەرچی بڵێی شیمەی مرۆڤانەیەتی
ئەسڵی ئینسان کە بڵێی گەوهەری نایابە ئەگەر
هەبێت، ئەو دانای ڕەبانییەیە کە لە هەولێرە
حەزرەتی (حاجی عومەر زادە مەلای بجکە) کێیە؟
مایەی دەوڵەمەندی لە سایەی بەخشندەیەتی
ئەگەر کیمیا مومکین بێت، بەرهەمی فەیضی ڕوانینیەتی
ئەگەر جامی جەم هەبێت، ئاوێنەی ویجدانیەتی
وەکو (ئیبن سینا) گەلێک حیکمەت پێشانی خەلق دەدات
پێش ئارامی مەکتەبی عیرفانیەتی
نامەی بە حیکمەت ڕازاوە، خامەی ئیعجاز نوای
چارەی ڕووخۆشی کەرەم دەستی زەڕ پەخشانیەتی

مظهــر صــدق وصــفــا آینه‌ء ناصــیــه‌سی
مطلع شــمس و قــمــر ابوبکرک گـریبــانیــدر
خــرقـــه پوشـــان در خـــانقـــه ارشـــادی
اریشـــوب هر یری بر خــواجــه‌ء فــرقــانیــدر
چونکه تنظیم ثنادک صــوکــره تقــدیم دعــا
نزد ارباب ســـخن شـــرط ســـخندانیـــدر
قــالدیروب درگه مــولایا (رضــا) دست نیــاز
بر دعـــا ایله کـــه هنگام دعــا خــوانیــدر
مهــر اقبــالی جهــانگیــر اوله تا مــهر و منیــر

بـو رواق فـلـكـك زينـت ايـوانيــــــــدر

واتا:

دیەنی ڕاستی و سافی ئاینەی ڕووی
دەرکەوتنی ڕۆژ و مانگ لە گیرفانی ئەبوبەکرە
خەرقە پۆشان لە خانەیی ئیرشادی
هەریەکە گەیشتووەتە خواجەی فورقانێک
چونکە لە ڕێک خستنی سوپاس صورەت دوعا گۆیی
لای خاوەن گوفتار شەرتی قسە زانییە
ڕەزا دەستی نیازی بۆ دەرگای مەولا بەرز دەکاتەوە
بە دوعایەک کە هەر کاتێک دوعا خوێنیەتی
میهر و ئیقبالی دونیا بگرێتەوە تا میهر و منیر
ئەم دەرگایە جوانیی ئەیوانی فەلەکە

لە شیعرێکی تری تورکیدا بە مەلای بچکە (مەلا ئەبوبەکر) دەڵێت:

سنک تک بربیـوک عـالم جـهـانده وارمـیـدر؟ کـلا
سکا سـوء نظردن حـفظ ایچـون دیرلر کـوچوک مـلا

واتا:

ئایا دانایەکی وەکو تۆ لە جیهاندا هەیە؟ نەا
بۆ ئەوەی لە چاو ئەفەس بتپارێزن پێت دەڵێن مەلای بچکە

***

## لەسەر ڕێبازی دەروێش و ڕابەر

لە دیوانەکەی شێخ ڕەزادا ئەم شیعرە تورکییەی خوارەوە لەسەر ڕەوشت و ڕێبازی دەروێش و ڕابەر بڵاوکراوەتەوە کە گوایا شیعری شێخ ڕەزایە. بەڵام وەکوو بۆ مان دەرکەوتووە، ئەم شیعرە هینی (دەروێش ڕضا پاشا)ی موتەسەریفی سیواسە کە یەکێک لە موریدەکانی شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی بووە و کتێبی «بهجة الاسرار»ی شێخی چاپ و بڵاوکردووەتەوە. ڕضا پاشا لە شیعرەکەیدا ڕەوشتی مورید دەردەخات کە دەبێت ڕابەرێکی شارەزا بکاتە پێشەوای خۆی و بۆ هەموو فەرمانێکی مل شۆڕ بێت، کە دەڵێت:

مـرشـد كـامل مـريد صـادقـك سلطانيـدر
هر نه امر ايتسه، انا فرمان آنك فرمانيدر
منبع مـاء الحـيـاة، مـجـمع البـحـرانيـدر
خـضــر توفــيق هدايتــدر لدنى كــانيــدر
طفل كش كـشـتى شكندر صـورت ارشـادده
حضرت موسىء وقـتك خواجهء عرفانيدر
فـيض لطفندن مـشـامـه نغـمـهء عيـسى گلور
جـاندر او هربر بدنده جـانلرك جـانانيــدر
امـتـثـال ايله (رضـا) امـر جليل الشـأننه
امـر ونهي مـرشـدك مـسـتـرشـدن برهانيـدر

واتا:

ڕابەری تەواو سوڵتانی دەروێشی ڕاستاڵە
چ فەرمانێکی پێ بدات، فەرمان فەرمانی ئەوە
سەرچاوەی ئاوی ژیان، کۆگای دەریایەتی
خدری بە مراز گەیاندن ڕابەری، سەرچاوەی خواناسییە
مناڵ کوژ و کەشتی شکێنە لە کاتی ڕابەریدا
حەزرەتی مووسای سەردەم، مامۆستای خواناسییە
لە بەخشش ناسکی ئەو بۆنی ئاوازی عیسا دێت
ئەو ڕووحە لە هەموو لەشێکدا و گیانی گیانانە
(ڕەزا) مل کەچ بە بۆ فەرمانبەری، فەرمانی خاوەن شکۆ
فەرمان و قەدەغەکردنی مورشید بەڵگەی ڕێی موستەرشیدە

***

## ڕەخنەیی لە ڕەوشتی هەندێ شێخ و دەروێشان

شـێخ ڕەزا، لەگـەڵ ئەم هەمـو و ڕێزەی بۆ ئایین و ئایینداری و ڕێبـازەکـانی دەروێشی، ڕەخنە لە کـردەوەی هەندێ ڕێبـازی تەسـەوف دەگـرێت و بە پێـچـەوانەی ئەو ڕێبـازانەی دادەنێت و بە پێچەوانەی ڕەوشتی پیرانی تەریقەتی دەزانێت، وەکو و ئاهەنگ و سەمای

مەولەوییەکان و شیر و زەرک وەشاندنی روفاعییەکان.

لە شیعرێکی فارسیدا باسی ئەو ڕەوشتانە ئەکات کە ئەڵێت:

دو گز عمامە، سەگز طیلسانو یەک گز ریش
دو صەد مرید روان در رکابش از پس و پیش
زبس فریفتەء صورتند اهل جهان همە
کە ادعای نبوت کند رود از پیش

واتا:

دوو گەز مێزەر، سێ گەز عەبا و یەک گەز ڕیش
دوو سەد مرید، لەبەر و دوای ئەو بە سواری و ئەوان بەپێ
خەلقی ئەم جیهانە ئەوەندە هەڵخەڵەتاوی دیمەنن،
ئەگەر ئەو شێخە ئیدیعای پێغەمبەریش بکا بۆی ئەچێتە سەر.

چە سحرها چە فسونها، جەمکر و داستانها
کە دیدە ام من ازین صوفیان کافر کیش
یکی کلاە بلندی بقدر قامت عوج
نهادە بر زبر فرق نامبارک خویش

واتا:

من چەند سیحر و ئەفسوون و داستانی فڕ و فێڵم
لەم سۆفییە کافر مەزەبانە بە چاوی خۆم دیوە
یەکێکیان کلاوێکی ئەوەندەی بالآی عووج بنی عەلەق
بەرزی ناوەتە سەر کەللەی نامویارەکی خۆی

کە شیخ مولویم مسلک و طریقت ما
نی است و دومبک و رقص و سماع چرس و حشیش
یکی گرفتە بکف حربەء چو آلت من
کە از مسایخ رفاعیم زنندەء شیش

واتا:

ئەڵێ من شێخی مەولەویم و تەریقەتی ئێمە،
شمشاڵە و دومبگە و سەما و حەوزی مەی و تریاک کێشانە،

یەکێکیان نێزەیەکی وەک کێرە ڕەقەکەی منی گرتووتە دەستەوەو،
دەڵێ من لە شێخانی ڕەفاعیم و شیش وەشێن.

مشایخی کە جهانرا بدین دسیسە خورند
چە آن مشایخ و چە پشم خایەء درویش
پناە دە تو خدایا (رضا) ز مکر و ریا
بظاهری ز عبادت بباطنی بنگ کیش

واتا:
ئەو شێخانە جیهان بەم فڕوفێڵانە ئەخۆن
چ شێخی وەک ئەوان و مووی هێلکە گونی دەروێشان،
خوایە، پەنای (ڕەزا) بدە لە مەکر و ڕیای ئەمانە.
بە دیمەن لە بەندەکانی تۆن و بەدزیشەوە بەنگ کێشن!

دووبارە لە شیعرێکی فارسیی تریشدا باسی هەمان جۆرە پیاوانی ئایینی ئەکات و ئەڵێت:

تنهانە کتاب شرع بر باد شدە
شهنامەء عشق نیز ازیاد شدە
از خرقە نشان عصر هر صومعەء
اصطبل خرابات خر آباد شدە

واتا:
تەنها کتێبی شەرع بەرباد نەبووە،
شانامەی عەشقیش لە یاد چووەتەوە
بە هۆی بە دیمەن خەرقەی خوا پەرستی پۆشەکانی ئەم چەرخە هەر عیبادەت خانەیێ
بووە بە تەویلە و هەرچی مەیخانەی عەشقی ڕاستییە بووە بە کەرئاوا.

هەندێ لەوانەی کە دەچنە حەج بۆ ئەوەی خوا لە گوناهیان خۆش بێت، کەچی کە دەگەڕێنەوە، خەریکی چڕوچاپ دەبن و دەیانەوێ بەزووترین کات دەوڵەمەند بن.

حاجی کە ز (صفا) و (مروە) برگشتە
گر مار شدە اژدها برگشتە

تنهـــانه ز خـــانهء خـــدا برگـــشـــتـــه
آن خـــانه خـــراب از خـــدا برگـــشـــتـــه

واتا:

حاجی که له سەفا و مەروە گەڕاوەتەوە

ئەگەر زوو بووێ بە مار، ئێستا بە ئەژدەهایی گەڕاوەتەوە،

تەنها لە ماڵی خوا وەرنەگەڕاوە.

ئەو ماڵ وێرانە لە خوای خۆیشی وەرگەڕاوە.

***

## ڕەخنە گرتنی لە دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی

زۆربەی هەجـوەکـانی شـێخ ڕەزا ڕەخنەن لە ڕەوشت و کـردەوەی ئەوانەی بەر پەلاری کەوتوون و هەر کەموکورتییەکی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی دیبێت چاوی لێ نەپۆشیوە و ڕەخنەی لێ گرتووە.

بەدەوڵەمەندی خاوەن پارە کە لە خۆی بەولاوە سوودی بۆ کەس نییە دەڵێت:

خـــەبەر چو بۆ مـــیـــرە ســـووره
قـــوربان شـــێخ صـــالح مـــەغـــدوره
خـــۆشی خـــۆشـــیـی پێکەوت وتی
ئـاگـــــره ســــووره لە خـــــۆم دووره
کـــەسێ فـــەقـــیـــری بێـــچـــاره
گـــەر عـــەیبی هەبێ مـــەنشـــووره
دەوڵـەمــــــەندی صـــــاحب پـاره
صـــەد عـــەیبی هەبێ مـــەســـتـــوره
ئەگـــــەر ئـاگـــــر لە مـــــاڵی چێ
دەڵـێـن ئـاگـــــر نـیـــــیـــــە نووره
نـە نـوورەیـلـێ نـەمـــــــــوورەیـلـێ
شـــاپـڵـــیـــتـــەیلێ دەر قـــونەیلێ

## قسەی جوولەکەی مەشهوورە

جێگا و شوێنی هەژار و دەوڵەمەندو، دانا و نەزان و، ڕاست گۆ و درۆزن و، ڕەوشت پاک و بەرتیل خۆر لە ناو خەلقدا دەبینێ ڕەخنەی لێ دەگرێت. فەرموون لەگەڵ ئەم شیعرە. تورکییەدا:

مغلسک عطسەسنە، صیحەء ناگاە دینر
منعمک ظرطە سنە، یرحمک الله دینر
عالم پر هنرە عقل کهن اصحابی
جاهلی بیخبرە مرشد اگاە دینر
یولی اگری کیدەنە زاهدی پاکیزە گهر
سوزی دوغری دیەنە شاعری گمراە دیز

واتا:

بە پژمینی لات و موفلس هاواری ناگاە دەڵێن،
بە تڕینی دەوڵەمەند، (یرحمک الله) دەڵێن
بە دانای پڕ هونەر، خاوەنی عەقلی کۆن دەڵێن،
بە نەزانی بێ خەبەر، مورشیدی ئاگاە دەڵێن
ئەوی ڕێی چەوت بگرێت، زاهیدی پاکی پێ دەڵێن،
ئەوەی ڕاستگۆ بێت شاعیری ڕێ چەوتی پێ دەڵێن.

مرتشینک اوقونور مضبطەء تبریە سی
هر طرفدن نیجە بیک اشهدالله دینر
بر قوری نامی قزانمقدە (رضا) فائدە نە
استخوان ریزەء شطرنجە دخی شاە دینر

واتا:

بەرتیل خۆر مەزبەتەی تەبریەی دەخوێنرێتەوە،
لە هەموولایەکە وە چۆن هەزار (اشهدبالله)ی بۆ دەڵێن
ئەی (ڕەزا) لە دەسکەوتی ناوێکی وشک سوودی چییە؟
بە پارچە ئێسکەکەی شەترەنجیش شا دەڵێن.

لە پشتگیریی ستەمکاران و زۆرداران، ئەمانیش دەباتە ڕیزی ئەوان و دەڵێت:

ظلمدر گرچه بزم شیخ شریفک آدی وار
ظلمه یوفدر میلی آما ظالمه امدادی وار
پاره آلماز اوچده بردر رسم عاداتی مکان
شیخ عالی همتک بر معتدل معتادی وار

واتا:

هەرچەندێک ناوی شێخی شەریفیشی تێدایە بەڵام زوڵمە
مەیلی زوڵمی نییە بەڵام یاریدەدەری زاڵمە
پارە وەرناگرێت سێیەکە باجی عادەتی جێگایە
شێخی هیمەت باڵا باجێکی موعتەدیلی هەیە

لە جێگایەکی تری، لە شیعرێکی تورکیدا ئەوە دەردەخات کە کەس بەناو و لەقەبی بەرز بەرز نابێت و هیچ سوودێکی بۆ نابێت.

اسم عالی ایله عالی اولەماز شخص رزیل
سکابر فائده ویرماز لقب اسماعیل
گورونور ساختەدر هر کیم اوزاقدن باقسه
متصرف می اولور (عجل بنی اسرائیل)؟!

واتا:

بە ناوی بەرز پیاوی ڕەزیل بەرز نابێت
لەقەبی ئیسماعیل هیچ سوودی بۆ تۆ نییە
دیارە کە ساختەیە هەر لە دوورەوە سەیرکەیت
(گوێرەکەی بەنی ئیسرائیل) چۆن بە موتەسەڕیف دەبێت!

لە سەردەمی حوکمی عوسمانی؛ دوو ڕوویی و درۆ و دەلەسە بڵاودەبووەوە شێخ ڕەزا ئەمانەی بەچاو دەدیت و ڕەخنەی لێ دەگرت و تەمێی خەلقی دەکرد کە بڕوا بەم جۆرە مرۆڤانە نەکەن. لەم بابەتەوە دەڵێت:

ئەم سادە ڕوخانە لە مەلاحەت کە تەمامن
دەورت کە دەدەن، تەفرە مەخۆ، قەت مەڵێ ڕامن
گەه دۆست و وەفادار و گەهێ دوژمنی خوێن خوار

دڵ نەرم دەبن گــاه و گـــەهێ ســـەخت کـــەلامن
عـاجز مـەبە، نەک بۆ تۆ، وەفـایان نیـیـە بۆ کـەس
مـەعلوومـە کـە ئەم تاقـمـە وەک تاسی حـەمـامن

لە جێگایەکی تری کە باسی دونیا دەکات و لە دەمێکەوە دەگۆڕێت بۆ دەمێکی تری:

دونیـا کـە عـیـبـارەت لە هەوا و هەوەسـێکە
وەک تـاسی حـەمـام هەر نەفـەسێ بۆ تەرەسـێکە

لەسەر ڕەوشتی پیاوی سوورتک دەڵێت:

کـــەسێ بیـــبێ حـــەیا و و شــەرم و نامـــووس
ئەبەد نـاکـــا ڕەفـــیـــــقی طاقـــمی لووس
ئەگـــەر صــــەد ســـاڵ بدەی ڕەنج و نەیـانگێی
قـــســـەی وات پێ ئەڵێن نەیگرتبێ قـــامـــووس

بەعـزێ هەن نانی یەکـێک دەخـۆن و پارێزگـاری یەکـێکی تری دەکـەن، شـێخ ڕەزا لە قسەیەکی ئاشکەرادا دەڵێت:

داخلی فـەرجە لەسەر قنگ، کـێر بەگون دەعـوا ئەکا
نانی (کون ماسی) ئەخوات و پاسی (جرتاوا) ئەکا

(کـون مـاسی) و (جـرتاوا) دوو دێن، صـەگـێک دەبێ بە ڕۆژ نانی دێی کـون مـاسی ئەخوات و شەو دەچێت پاسی جرتاوا ئەگات. ئەم قسەی پێشینانی کوردەوارییە لەسەر دوو ڕووییە.

دەربارەی مەئمووری ڕەوشت چەوت دەڵێت:

قـازی ڕەئیـسی ئەووەل، تویش مـوددەعی عـمـوومی
ئەم کـارە چۆن سـەر ئەگـرێ لەعنەت لەبابی ڕۆمی

لەسەر بێباکێ مرۆڤ و کردەوەی لە ژیاندا دەڵێت:

دوێنێ قەترەیێ خوێن بوێت و ئیـمرۆکە کەفێ خاکی
بەنی ئادەم کەری، گەر کەرنەبی بۆچ هێندە بێ باکی

لەسەر چەپەلی و ڕەوشتی هەندێ کەس دەڵێت:

صاغ لە دونیادا نەماوە گەر قسەی صاغت دەوێ
بێ هەزارت پێ نیشان دەم گەر قورمصاغت دەوێ

هەندێک هەن صەدجار ڕووشکێن بکرێن هەر دێنە پێشەوە (ڕووقایم) شێخ ڕەزا دەڵێت:

چەرمی ڕووی هیندقایە شمشێری میسری نایبڕێ
گەر بەکەوشی کەی دەمێنێ تا قیامەت نادڕێ

لە نامەیەکی هەڵبەستدا بۆ موحەمەد بەگی قائمقامی ڕانیە، لە بابەت جەزرەبە دانی سەرۆکی ئێلی ئاکۆیان، تەمێی دەکات و دەڵێت:

شعار خویش مکن شیوهء هلاک و را
بجان من که مرنجان رئیس آکورا
مخور فریب بحرف و دروغ مدعیان
زبنده بشنو و مشنو حدیث بد گورا

واتا:

ڕەوشتی هولاکو مەکە بە دروشمی خۆت
تو گیانی من سەروکی ئاکۆ مەڕەنجێنە
بە قسەی درۆی ئەوانە کە وا دەڵێن تەفرە مەخۆ
قسە لەمن ببیستە و قسەی بەدگۆ لە گوێ مەگرە.

گرفتم آنکه بجرم عظیم متهم است
بتدیل عفو بپوشان جرائم اورا
بشکر آنکه خدا جاه و نعمتت داد است
علی الخصوص بتی نازنین دلجوار

واتا:

ئەوەی تاوانی گەورەی دراوەتە پاڵ گرتم
بە داوێنی لێبوردنت تاوانەکانی داپۆشە
لە سوپاسی ئەوەدا کە خوا جاە و نیعمەتی داوێتێ

به تایبەتی کە پەیکەرێکی ژنێکی جوانی دڵگیری داوێتێ

بتی کـه در صـفـتش آورم باسـتـشـهـاد
دو مـصـرع از غـزل سـعـدی سـخن گـورا
«حـصـار قلعـه‌ء باغی بمنجنیق مـده
ببـام قـصـر برافکن کـمند گـیسـو را

واتا:

پەیکەرێ کە لەوەسفیا بۆ بەڵگە
دوو تاکە بەیتی غەزەلێکی (سەعدی)ی قسەزان دێنمەوە،
«قەڵای باخی بە مەنجەنیق گەمارۆ مەدە
کەمەندی زوڵفانی هەڵدە بۆ سەربانی کۆشکەکەی»

لە بابەت ئەوەی شا و قەلەندەر بە شوێنی زێڕدا ڕادەکەن دەڵێت:

ای زر کـه مطلب هـمـه شـاه و قلندری
دلبـند و دلفـریب و دلارام و دلبـری
از زر عـجب مـدار فـغـانم کـه آدمم
زر گـوی وینگر زر کند خـر باین خـری

واتا:

ئەی زێڕ! کە داوای هەموو شاه و قەلەندەری
دڵگیر، دڵ هەڵخەڵەتێن و ئارامی دڵ و دڵبەری
بە سەیری مەزانە کە بۆ زێڕ هاوار بکەم، منیش ئادەمم
بڵێ (زەڕ) سەیرکە کەریش بەوکەرییایەتییەی خۆی نەکەوێتە زەڕە زەڕ

لە بابەت ئەو کەسانەی کە خۆیان لێ گۆڕاوە دەڵێت:

شـده هر غـیـر زالی پور زالی
عـجب حـالی عـجب (قـحط الرجـال)ی
زند باشـیـر شـرزه پنجـه امـروز
هـمی هـر روبه‌ء باهر شـغـالی

واتا:

هەموو بێگاهێک بووە بە زاڵی کوڕی زاڵ

بارێکی سەیرە، قاتییەکی سەیری پیاوە!
ئەمڕۆ هەر ڕێوییێ یا هەر چەقەڵێ بگری
پەنجە لە پەنجەی شێری شەرزە ئەدا

لەبابەت ئەوەی کە دونیا بۆ کەس نامێنێت، دەربارەی ئەیوانی کیسرا دەڵێت:

شکافی کـــه بینی در ایوان کـــسرا
دهانیـــست گـويد؛ بقـا نیـست کـسرا

واتا:
ئەو درزەی لە تاقی کیسرادا دەیبینی
دەمێکە کراوەتەوە، ئەڵێ: بە قاو مانەوە بۆ کەس نییە

دربر گـرفـتـه پیکر (سلمـان پاکـرا)
فـــخــریست زین وســیله بر افــلاکــرا

واتا:
پەیکەری تەرمی (سەلمانی پاکی) لە باوش گرتووە
بەم هۆیەوە هەقی شانازیی بەسەر ئاسمانەوە هەیە.

کەس ناتوانێ دوو کاری دژایەتی ڕێک بخات:

مـستی و داعیـه، حکمت هیـهات هیـهات
برنـدارنـد بـیک دسـت دو تـا خـــــربزرا

واتا:
سەرخۆشی و بێهۆشی و ئیدیعای زانینی حیکمەت و هەیئەت زۆر دوورە
کەس ناتوانێ بە دەستێ دوو کاڵەک هەڵگرێ.

***

## لە هەجوەکانی شێخ ڕەزا

شێخ ڕەزا بە شاعیرێکی هەجوکەر ناسراوە و گەلێک لەوانەی باسی شێخ ڕەزایان کردووە هەر بەوە ناسیویانە. مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی ناوی «لسان الحق»ی لێ دەنێت، هەر وەکو هەجوەکانی حافزی شیرزای بە «لسان الغیب» ناو دەبرێت، ئەمیش، واتە شێخ ڕەزا خۆی، لە پارچە شیعرێکی فارسیدا کە بۆ ناظم پاشای موتەسەڕیفی بەغدا

ناردوویەتی دەڵێت:

زخـــیل شـــاعـــران من هم حکیـــم
گـــهی گـــویم هجـــا و گـــاه تحـــسین
همی گـــویم نگویانرا ســـتـــایش
همی خـــواهم بدانرا لعن ونفـــرین
بکام دوســـتـــان ریزم تبـــرزد
زنم بر فـــرق بد خـــواهان تبـــرزین
کـــریمانرا دهانم گـــوزهء شـــهـــد
لئـــیـــمـــانرا زبانم تیغ رویین

واتا:

لە ناوی شاعیراندا منیش حەکیمم
جارێ هەجو ئەکەم و جارێ تاریف
ئەوەی ئەکراوە تاریفی ئەکەم
بۆ خراپانیش ئەکەم لەعنەت و نەفرین
شەکری کەللە بە ئارەزووی دۆستان دەوەرێنم
تەورەزینیش ئەدەم بە کەللەی بەدخواهان
دمم گۆزەی پڕ لە هەنگوینە بۆ چاکان
زبانم تیغی پۆلایینە بۆ نامەردان

بەڵام شیعری ستایش و ئایینی و ڕەخنەکانی لە هەجوەکانی کەم ڕەونەقتر نین.
فەرمون لەگەڵ هەندێ لەو هەجوانەی.

***

## لەگەڵ عەلی بەگی مودیری قزڵجە

شێخ ڕەزا بۆ ئیشێکی دۆستێکی دەچێتە لای عەلی بەگی مودیری قزڵجە. عەلی بەگ نە تەنها ئیشەکە ناکات، بە وشکی وەڵامی شێخ ڕەزا ئەداتەوە و شێخ ڕەزاش ئەم هەجوەی ئەکات:

لە طەرف کـــێـــرەوە بەریدی صـــەبا

بۆ مــــوديری قــــزلّجـــە نامـــە دەبا

بۆ جـــەنابی مــوقـــەڕڕەبولخـــاقـــان

مـــيـــر عـــەلی بەگ لە ئەنجـــەبی نوجـەبا

مـــيـــرم ئايا چلۆنە عـــيللەتەكـــەت؟

باز بە خـــارشـــتــە بن گـــونت عـــەجـــەبا؟

ئيـحـتـيـاجت بنووسـە عـەيبی چيـيـە

مــەحـــرەمی ڕازی تۆم بە عـــەهدی صـەبا

صــــەد تڕت دا بە كـــوودەكی لە گـــونم

ئەی تڕت ڕەعـــــد و وەی تست ڕەشـــــەبا

دودەمـــــانتـــــان چرووكـــــە بونيـــــادی

بۆ قـــــەباحـــــەت بنم دگل هەبەبا

عـــەبدولڕەحـــمـــان بەگی برات فـــەرمـــووی

ئابڕووی خـــــانەدان عـــــەلی ئەيبـــــا

خـــاڵە كـــوێريش صـــەراحـــەتەن ئەيگوت

كـــــە عـــــەلی بەگ بووە بە دێڵـــــەبەبا

لە ئيـــبـــانەت ئيـــبـــا مـــەكـــە مـــيـــرم

(هـذه ارثـكـم اخــــــــــا و ابــا)

گـــەر بە كـــێـــری قـــزلجـــە تێـــر ناخـــۆی

وەرە تا (شــــێخ ڕەزا) بە ڕەشـــــتـــــا با

***

### عەباكەی موديری تەحريرات

مـوديری تەحـريرات لە كـەركـووك عـەبايەک بە دياری بۆ شـێخ ڕەزا ئەنێـرێت ئەوەندە ئەڵێت: شـێخ عـەباكـەی كـۆن بوو من عـەبام بۆی نارد، شـێخ ڕەزا تووڕە ئەبێت و جـوببـە كۆنەكەی خۆی لەبەر ئەكاتەوە و لەگەڵ ئەم شيعرە كە بە چوار زوبانە، توركی و فـارسی و عەرەبی و كوردی، عەباكەی بۆ ئەنێرتەوە:

گـــزر دوائر اقـــلامی ارقـــه سنده دوات
مـــدار اهل قلمـــدر مـــدیر تحـــریرات
نکفـــتـمت کـه حـــذر کن زتیـغ ناطقـه أم
(فـــان ناطقـــتی آفـــة من الآفـــات)
لەبەر عەباکە جەبەم کردی ئەی فەقیری خودا
بگرە عەباکەت، کێرم بە قنکی خۆت و عەبات

واتا:

لە دائرەکاندا مەرەکەبدان بە شوێن قەڵەم یا ئەسوورێتەوە
مەداری خاوەن قەڵەمە مودیری تەحریرات
پێم نەوتی ئاگات لە تیغی زوبانم بێ!
زوبانم ئافەتێکە لە ئافات
لەبەر عەباکە جەبەم کردی ئەی فەقیری خودا
بگرە عەباکەت، کێرم بە قنگی خۆت و عەبات

***

## کەڵەشێرەکەی نەقیب

لەو سەردەمەدا شەڕە کەڵەشێر مایەی ڕابواردن بووە. شێخ ڕەزا نامەیەکی هەڵبەست ئەنێرێت بۆ نەقیبی سولەیمانی داوای کەڵەشێرێکی لێ ئەکات و ئەڵێت:

کـەڵەشـێـرێ بە (رضـا) لازمـە کـرمـاشـانی
زیرەک و چابوک و دەم گـــەرم و دڕ و شـــەڕانی
کـەڵەشـێرێ کە قـەپی گـرت لەبنا گـوێی کـەڵەشێر
پڕ بەدەم بیـــپـچـڕێ وەک ســەگی هەورامـــانی
کـەڵەشـێرێ کە ئەگـەر شـێری نەڕی بێتـە مـەساف
ڕایبرفـــێنێ بە شـــەقێ مـــیـــسلی کـــەری تالانی
بۆ حـــەواڵەی دوبری ئەو کـــەســـە خـــۆم ئەیزانم
دوو گـونی پێوە هەبێ وەک دوو جەڕڕەی (لەیلانی)
بە درێژی وەکـوو مـەولان بەگـەکـەی مـیـری بەیات

به جەسامەت وەکو کوێخا زلەکەی بیبانی
جنسی خۆی جووتە مریشکێ بەری حەملەی بگرێ
ئەکو سویی بێتەوە بیچارە لەبەر بێ گانی
ئەی نەقیب زادە، بنێرە کەڵەشێرێکی وەها
بۆ (ڕەزا)کەی سەگەکەی قاپییەکەی گەیلانی

بەڵام ئەم جۆرە کەڵەشێرە وا شێخ ڕەزا باسی ئەکات لە کوێ پەیدا ئەبێت؟ نەقیب زادە کەڵەشێر نانێرێت. لەو کاتەدا خەبەر ئەگاتە شێخ ڕەزا کە حەسەنی مەحموود ئاغا ئەمەی بیستووە؛ کەڵەشێرێک و دوو مریشکی ئامادە کردووە بیاننێرێت بۆ شێخ ڕەزا. شێخ ڕەزا ئەم شیعرەی بۆ ئەڵێت:

ئەو بە هەیئەت کەڵەشێرە کە بە هەڵمەت شێرە
کەرەمت کردووە بیستوومە، دەسا بینێرە
دوو مریشکیشی لەگەڵدا کە فریشکی ئەکەوێ
خرتی چەند ساڵەیە ئەڵبەت بە مریشکان فێرە
بارەکەڵڵا حەسەن ئاغای کوڕی مەحموود ئاغا
کەفی فەییاضە، دڵی واسیعە، چاوی تێرە
نە وەکوو شاری سولەیمانییە، کۆیە بە کەرەم
نە وەکوو طاوق و کەرکووکە نە وەک هەولێرە
ئەم هەموو شیعرە کە ناردم کەڵەشێرێکی ئەنارد
جددی ئەعلایە نەقیب زادەیە، خۆی بێخێرە
دۆستان، ئەم کەڵەشێرە وەکو تەعریفی ئەکەن
بۆ (ڕەزا) لازمە ئەم نێرکەیە ئەو نێرە
هەدییەتێ گەر لە تەرەف دۆستەوە بێ شوکری ئەکەم
پێی ڕەزامەندم ئەگەر چی تەرفێکی کوێرە
قافیەی تەنگە ئەزیرەی کەمە شاعیر زینهار
ئەوەی لەم قافیە بۆت ماوەتەوە هەر کێرە

بەڵام شـێخ ڕەزا دەس لە مـارەیی دایکی هەڵگرێت دەس لەکـەڵەشـێـری نەقـیب هەڵناگرێت:

ئەو دوو مـریشـک و کـەڵەشـێـرە کـە وتم بینێـرە
دووی لە ڕێ مـرد و یەکـێکی بە نەخـۆشی لێـرە
شەو هەموو دەس بەدوعا بووین و لە وەختی سەحەرا
کـەڵەشـێـر ئەمـری خـوای کـرد و وتم وای شـێـرە

***

## لەگەڵ دەروێش ئەفەندی موفتیی کەرکووک

بنەماڵەی دەروێش ئەفەند موفتی، بنەماڵەیەکی کۆن و خانەدانی کەرکووکن و گەلێک پیـاوانی دانا و ئایینناس و ئەدیبـیـان تێـدا هەڵکەوتووە. دەروێش ئەفـەندیی مـوفـتی پیـاوێکی خاوەن دیواخان بوو. ڕۆژێک دەبیستێ کە دژی شێخانی تاڵەبانی دواوە. ئەم قسەیە دەگاتە شێخ مەحەمەد عەلی کوڕی شێخ عەلی و بەبێ پرسی باوکی چەند کەسێک دەنێرێت و تێلا تڕێنیـان دەکات و دیواخانیان پێ هەڵدەگرێت. ئەمە دەبێتە هۆی ناخۆشی لە نێوانی شێخانی تاڵەبانی و ماڵی موفتی.

دەروێش ئەفەندی جارجار دژی حکومەتی عوسمـانیش دوواوە و ئەمە بووەتە هۆی ئەوە کە بەرپرسیار بێت. لەم بەرپرسیارییەدا بەند دەکرێت. بەڵام شێخ ڕەزا لەم شیعرەیدا، ئەمە بەکەم دەزانێت و دەیەوێت سورگون بکرێت:

تحت توقـیـفـه آلندی قـوی آلنسـون کـیـرەته
خلق ایچـون چاهی قـزان چاهە دوشـر البـتـه
حـبـسـه ابقـا نه دیک بصـرەیه سـورمگ لازم
(بصـرەدەن) (بومـبـه)یە، من (بومـبـه) الی (کـەلکەته)
ناسـه عـبـرت اولیـور ایتـملیـدر وقـعـه نویس
ترسن ترجـمـەیی حـالنی ثبـتی غـزته

واتا:

خرایە بەندیخانەوە با بەند بکرێت کەرەتە
ئەوەی چاڵ بۆ خەڵق هەڵکەنێت هەر خۆی تێی دەکەوێت

له حه‌بس مانه‌وه مانای چی؟ ده‌بێت ڕه‌هێڵه‌ی به‌صره بكرێت
له (به‌صره‌وه) بۆ (بۆمبای) له بۆمبا بۆ (كه‌لكه‌تا)
ئه‌م كرده‌وه‌ی ده‌بێت ببێته عیبره‌ت بۆ خه‌لق
ته‌رجومه‌ی حاڵی ئه‌م ته‌رسه بخرێته غه‌زه‌ته

ئاه چه خۆشه به چه‌قۆ گوێی له بنا خشت ببڕن
ڕیشی قوت كه‌ن به مه‌قه‌س بیكه‌نه مه‌یموونه قوته
به ده‌ف و دائیره‌وو زه‌مزه‌مه‌وه دووی بكه‌ون
لێ بده‌ن چه‌پله بڵێن بێنه‌وه كوڕ گه‌ل ئه‌مه‌ته

شێخ ڕه‌زا ئه‌بیستێت كه موفتی وتوویه‌تی! «ئه‌م تاڵه‌بانییانه چین به كه‌وچكێك شۆربا ئه‌م هه‌موو خه‌لقه‌یان ڕاكێشاوه‌ته لای خۆیان، من له جیاتی شۆربا ده‌عوه‌تی (قوزی) ئه‌كه‌م.» شێخ ئه‌مه ئه‌قۆزێته‌وه ئه‌ڵێت:

یه‌كتری ده‌عوه‌ت ئه‌كه‌ن ئه‌هلی دیانه‌ت به قوزی
كوڕی موفتی به قنگی، خانمی دایكی به قوزی

ماڵی موفتی، له كه‌ركووك، له‌به‌ری قه‌ڵا بوو. وا دیاره ماڵی قازیش له‌وبه‌ر، له‌به‌ری قووریه بووه. شێخ ڕه‌زا ده‌ڵێت:

مالی موفتی له‌م به‌ره، مه‌علوومه قازیش له‌وبه‌ره
من فه‌قیرم كێ ده‌زانێ له‌م به‌رم یا له‌و به‌رم

***

## مودیری مالی هه‌ولێری

مودیر ماڵێكی هه‌ولێری له كه‌ركووك ئه‌بێ. شێخ ڕه‌زایش كاری به‌م جۆره كاربه‌ده‌ستانه زۆره. ده كاری بۆ ڕاپه‌ڕێنن و یه‌كێكی بۆ نه‌كه‌ن به‌ر هه‌جوی شێخ ئه‌كه‌ون. له‌م شیعره كوردییه ئه‌ڵێت:

ماڵ مودیری كه خه‌لقی هه‌ولێره
هه‌ر وه‌كوو مووی خایه بێخێره
صووره‌ت و سیره‌تی له پیاو ناچێ

ئەو قــــورمـــــســـــاغــــە مــــێــــیــــە یا نێـــرە
من بە مـــــەخـــــفی کـــــە چووم و تێی فکریم
بەزمی غــــەوغـــایی مــــەقـــعـــەدی کــــێـــرە
دیم (حوسێن) کردی قەصدی قەتلی (فەتاح)
وەکـــو (یونس) کـــە دەس بە شــــمـــشــــێـــرە
حـــەرەمی مـــوحـــتـــەرەم کـــە لەعلی خـــانە
خـــەرمـــەنی عـــیـــصـــمـــەتی گـــەرایی کـــێـــرە
ڕاوی ڕێوی هـەمــــــــوو لە بۆ کـــــــــەولـە
گـــــورگ لەبەر بەرخــــە دێتــــە ناو بیـــــرە
بەهری ئاودانی مــــــەزرەعــــــەی فــــەرجی
جـــووتە گـــون، حـــوقـــەیە کـــێـــر ئاودێرە
وتم: ئـەی بـێ حـــــــــــەیـا تـو نـاتـرسـی
لە خـــوای ڕۆژ و مـــانگ و ئەســـتـــێـــرە؟
وتی: یا شــێـخ ئەمـــان مــەکـــە مـــەنعی
ئەهلی قـــوونیـــان* بە قـــوونی ئەو فـــێـــرە
نیـــیـــە باکم گـــەر ئەو خـــەبیـــشـــە بڵێ
ئەوە ئەشـــعـــاری (لامع)ی** کـــوێرە

* قوونیان دێیەکە نزیکی هەولێر.
** لامع نازناوی شێخ ڕەزا، بەڵام لە دواییدا وازی لێ هێنا.

***

## هەجوی مەخموور ئەفەندی

شێخ ڕەزام و بە فەصاحەت لە جیهاندا مەشهوور
پســـەری پیـــری نەزەر کـــردەی قـــوطبی لاهوور
شیعری من وەهبییە، کەسبی نییە، هوشیارەوە بە
خۆت لە من لادە لە سۆراخی قنگت بەم (مەخموور)

لە شیعرێکی تریدا ئەڵێت:

گەر نەکا (مەخموور ئەفەندی) تەرکی تریاکی لەعین
فـێـری سێ بەزمی دەکـا، پژمین و کـۆکین و ترین

***

## لە ستایشەکانی شێخ ڕەزا

شێخ ڕەزا قەد دۆست و ناسیاوی فەرامۆش نەکردووە و هەمیشە کردوویانیەتە سەری و بیـری کـەوتوونەتەوە. ئەمـجـا ئەو سـتـایشـانەی، بەپێی جـۆری پێـوەندیی لەگـەڵ ئەو دۆستانەیەتی.. لە ستایشەکەی ئەحمەد پاشای بابان «ڕۆژی یەکشەمی کە مەشهورە بە ڕۆژی بازار» بۆ ڕەخنە و گاڵتە و گەپە و لە هەندێکیـان بۆ بیر خسـتنەوەیە و هەندێکیشی سوپاس نامە.

***

## ستایشی حاجی ئەسعەد ئاغا

حاجی ئەسـعـەد ئاغـا، شـێخ ڕەزای فـێـر کـردبوو کـە هەمـوو سـاڵێک توتنی بۆنداری (بێشـەمە و شاور و شێـتنە)ی بۆ بنێرێت. توتن ناردن بۆ کەرکوک ئاسان نەبوو. دەبوایە بە قـاچاغ لە تاریکیی شـەودا، بەدزی پۆلیـسی ڕێژییـەوە لە دزە ڕێیەکـانەوە بێت. حـاجی ئەسعەد ئاغـا ماوەیەک توتن نانێرێت و شێخ ڕەزا لەم شیعرەدا بیری دەخاتەوە و ڕێگای قاچاغی پێشان دەدا و دەڵێت:

تۆ کـەم نەزەری دەر حـەقی من ئـیـسـتـەکـە ئاغـا
من مـاوە هەوای صـوحـبـەتی تۆم هەر لە دەمـاغـا
تا ڕۆژی قـــیـــامـــەت بە خـــوا زیندووە نامـــرێ
بابێ کــە بمێنێ کــوڕی وەک تۆی لە وجــاغــا
بۆ توتنەکەی (بێشـەمە) و (شـاور) و (شـێـتنە)
شـێت بووم و نەهات وەختـە دڵم دەرچێ لە داغـا
جـــاران چە بە چاغ و چە بـە بار بۆت دەهەناردم
نـانێـری ئەمـــیـــســـتـــا نە بە بار و نە بە جـاغـا

ڕێی نەوتەکە باجگیری ئەگەر زۆرە دەفەرمووی
ڕێی (خاسە) بە شە و خالییە بابێ بە (بلاغا)
نەمزانی فەلەک گوێەنی هەر بۆ منە یاخو
صەد دەستی وەکوو دەستی منی کردووە بەزاغا
یارەب گوزەران کا بە صەفا وەختی ئەزیزت
پەیوەستە لە دەوری چمەن و گەردشی باغا
بۆ چونە تەوافی حەرەمی شاهدی مەقصوود
عالەم هەمو مەئذوونە، (ڕەزا) هەر لە یەساغا

***

## ستایشی شێخ ستار

شێخ ستار کوڕی شێخ ئەحمەدی تاڵەبان و مامی شێخ ڕەزایە. بەڵام تەمەنیان زۆر لە یەکەوە دوور نەبوو و زۆریش هاودەم و گاڵتە و گەپیان لەگەڵ یەک دەکرد. شێخ ستار دانیشتووی دەرەوەی کەرکوک و لە گوندی بادەوا بوو و جارجار دەهاتە کەرکووک و لە تەکیە، زۆربەی کاتی لەگەڵ شێخ ڕەزای برازایدا ڕادەبوارد. شێخ ڕەزا لە دووریی شێخ ستاردا دەڵێت:

سوپای غەم دەورەیان دام دەس بە مەطرەق
لە پاش تەشریفی تو، دامیانە بەرشەق
تەعالەڵلا، کە جەللادی فیراقت
دەڕێژێ بێ موحابا خوێنی ناحەق
مەپرسە بۆ لە هیجرانت نەمردم
کە من صەگ مەرگم و گیان سەخت و دڵ ڕەق
کە زینیان خستە پشتی ماینە ڕەش کوێت
گەڕا چاوم لە تاوان زەرد و ئەبلەق
لە شەوقی تو وەکو (مەنصووری حەللاج)
خرووسی طەبعی من ئەیگوت: انائەلحق

له بەزمی خوسرەواندا یەک زەمانێ
مورەخخەص بووم، وەکو دەستووری موطلەق
ئەمیستاش طاقەتم طاقە و پەریشان
خروسم ئەخرەسە و حالم موفەششەق
لەبەر هەیوانی مزگەوت ئێستە بێ تو
وەها دێم و دەچم، وەک حاجی لەق لەق
ئیلاهی عومر و جاهت بەر قەرار بێ
عەدووت سەرنگون بێ و خۆت موەففەق
سمێلی شێخ ستار (حەبلوطەتینە)
کەلامی (شێخ ڕەزا) وەحیی موصەددەق

***

## له ستایشی شێخ ئەمینی هەولێری

شێخ ئەمین یەکێک بوو لە داناکانی شاری هەولێری کوردستان. حکومەتی عوسمانی، وەکو مەلا مارفی مەلا عەبدوللای خدریی کردە سەرەک دادگای بیدایەت شێخ ئەمینی هەولێریشی کردە سەرەک دادگای سزای کەرکووک. ئەم شێخ ئەمینە بە حاکمێکی عادل و ڕەوشت پاک و دانا ناسرابوو. شێخ ڕەزا لەم ستایشەدا بە شیعرێکی فارسی دەڵێت:

گفتم ملک روی زمین شیخ امین است
نه نه غلطم صد ملکش ملک یمین است
کوته نظری گفت ملک من نتواند گفت
کانرا بفلک مسکن وانرا بزمین است

واتا:

وتم فریشتەی ڕووی زەوی شێخ ئەمینە
نە نە، هەڵەم، سەد فریشتە بەندەیەتی
کورت بینێ وتی ناتوانێ ببێ بە فریشتە
چونکە جێگای فریشتە ئاسمانە و ئەم لە زەوییە

گفتم مگر این ضرب مثلرا نشنیدی

ای خـواجـه کـه تشـریف امـاکن بمکین است
باز از دراین کـــار در آید کـــه مـــلائک
از نور و بن آدم بیـــــچـــــاره ز طین است

واتا:

وتم: ئەی تۆ ئەو پەندەت نەبیستووە ئەی کابرا
کە ئەڵێ: شەرەفی شوێن بەو کە سەوەیە کە لە شوێنەکەدایە
کە فریشتە لە تیشک دروست کراوە و ئادەمیزادی هەژار لە قوڕ

مـــاهیت آن تـعـــبـــیـــه از عـــالم انوار
ســرمــایه، این قطره، از مـا ء مـهین است
با آن گـــهـــر پاک برابر نشـــود خـــاک
صـــد پایه بمیـــزان خـــرد آن به آزین آست

واتا:

ما هییەتی ئەو لە جیهانی تیشک پڕ کراوەتەوە
سەرمایەی ئەم بە دڵۆپەیێ ئاوی ناچیزە
خاک لەگەڵ ئەو گەوهەرە پاکە بەرانبەر ناوەستێ
بە ترازووی عەقل ئەو صەد پلە لەم چاکترە

گـفـتم کـمکی باز بکش خـواجـه عنانرا
اصـــرار مکن عـــفـــو بفـرمـــانه چنین است
در بـارگـــــــه لـم یـزل اقـــــــدس یزدان
بنیـــاد فـضـیلت همـــه بردانش دین است

واتا:

وتم: خواجە کەمێ جڵەوەکەت ڕاکێشە دواوە
سوور مەبە: ببەخشە، وانییە
لە بارەگای هەمیشەیی و پیرۆزی خوادا
هەموو بنیاتی گەورەیی لەسەر زانست و ئایین بینا ئەکرێ

مـــســـجـــود مـــلائک شـــدن آدم خـــاکی
از ســـــایـه، علـم لدن و دین مـــبـین است

ای شیخ اگر محکمه را معدلتی هست

از رای زرین تو، وز فکر متین است

واتا:

سوجده بۆ براوی ئادەمی لە خاک دروست کرا و لەلایەن فریشتەوە

لە سایەی زانستی خوایی و ئایین ڕوونەوەیە

ئەی شێخ؛ ئەگەر دادگا دادپەروەرییەکی ببێت

لە ڕای سەنگینی تۆ و لە بیری بتەوتەوەیە

جبریل امینت زبرای چه نگویم

صد بار خدا گفت که جبریل امین است

شیرنتر از اشعار (رضا) نینست، بلی هست

اما نه چنین نقره، نه چندین تمکین است

واتا:

بۆچی پێت ئەڵێم جبرەئیلی ئەمین

خوا خۆی صەد جار وتوویەتی جبرەئیل ئەمینە

شیرنتر لە شیعری (ڕەزا) نییە، بەڵێ هەیە،

بەڵام نە ئەوەندە بێگەردە و نە ئەوەندە بە خۆیە.

می که تبه زداید زرمز قال و قیل

می که پرده گشاید زبزم کن فیکون

می که گر گزرد بر مشام آبستن

فقد بمغز جنین در مشیمه شور جنون

واتا:

ڕەنگی ڕەشی شەوەیی لە ئیشارەتی (قال) و (قیل) پاک کاتەوە

شەڕابێ کە پەردە لە بەزمی جیهانی (کن فیکون) هەڵماڵێ

شەڕابێ ئەگەر بۆنی بڕوا بە لووتی دوو گیانا

سەودای شێتی لە منداڵدانا بکەوێتە کەللەی ئاوەلەمە (شەڕابێکی وام بدەرێ)

که تا بیاری آن عندلیب ناطقه أم

یکی قصیده سراید چو گوهر مکنون

بمدح ناظر مـــاليـــه مـــصطفى پاشـــا
مـشـيــر مـعـدلت آيين مـرحـمت قــانون

واتا:
تا به یارمەتیی بولبولی هێزی وتنم
چەکامەیێ بهۆنمەوە وەک گەوهەری بن دەریا نایاب بێ
لە تاریفی وەزیری دارایی مستەفا پاشادا
کە وەزیری داد ئایین و ڕەحم قانوونە

هنـر وری کــــه بـدورش ممالـک اســـــلام
چنان شـده است چو يونان بعـهد (افـلاطون)
خـجـســتـه راى وزيرى كـه سـاعـد هنرش
ببــــزم و رزم چو آيد ز آســــتين بيـــرون

واتا:
هونەرمەندێکە کە وڵاتانی ئیسلام لە سەردەمی ئەوا
وەک یۆنانی سەردەمی ئەفلاتوونیان لێ هاتووە
وەزیرێکی بیرورِا پیرۆزە کە باسکی هونەری
لە قۆڵ دێتەدەر بۆ بەزم و ڕەزم

***

## ستایشی مستەفا فاضل پاشای کوڕی مەحەممەد عەلی پاشای مصری

مـصطفی فـاضـیل پاشـا وەزیری دارایی دەوڵـەتی عـوسـمـانی بوو. ئەم بنەمـاڵـەیە، تا ڕۆژانی دوایی شـایەتییـان لە میـصر، لە ڕەسەندا بە (ئەرنائووط) ناسراون. بەڵام لە ڕوون کردنەوەیەکدا شاهزادە مـەحـەمـەد عـەلی کە جێگیری شا فـارووق بوو، لە بابەت ڕەسـەنی بنەمـاڵەی مـەحـەمـەد عـەلی پاشا دەڵێت: ڕاسـتە مـەحـەمـەد عـەلی پاشـا لە ئەلبـانیـا هاتووە دونیاوە، بەڵام باوکی کە فـەرمـاندەی لەشکری ئەو وڵاتە بوو، لە ڕەسەندا کوردی دیار بەکر (ئامەد)ە.

شـێخ ڕەزا، نـەترسی و زوبـانی خـۆی بووە هۆی بڕینی ئەو مــووچەیەی کـە لەلایـەن گـەنجینـەی حکومـەتەوە بۆی بڕابووەوە. دەیەوێت ئەمە بگەیێنێتـە وەزیری دارایی بۆ ئەوەی چاوێکی تری بخشێنێتە ئەو ڕوو داوە و هەڵی وەشێنێتەوە.

مــرا بهــیچ نیــاســاید این دل مــحــزون
مگر بطلعت زیبــا و قــامت مــوزون
گــهی به پســتــهء خندان دلبــر باهر
گــهی بەنرگس فــتــان شــاهد مــفــتــون

واتا:

ئەم دڵە خەمگینەم بە هیچ ناحەسێتەوە
مەگەر بە سیمای جوان و قەد و باڵای ڕێکوپێک
جارێ بە فستقی خەندانی (واتە دەمی بە زەردەخەنە)ی دڵبەری بەناز
جارێکیش بە چاوی وەک نێرگسی دڵڕفێنی یاری دڵ پێوە گرفتار

من آن قلندر آزاده مــشــربم کــه قلم
کــشــیــده بر بد و نیک جــهــان بوقلمــون
بآب شــوی خــدایا جــریدهء اخــبــار
کــه صـرفــهء نبــرم زین فــســانه و افــســون

واتا:

من ئەو قەلەندەرە ئازاد مەشرەبەم کەوا قەڵەمی
بەسەر چاک و خراپی دنیای قەلەموون سیفەتا هێناوە
خوایە ڕۆژنامەی دەنگوباس بە ئاو بشۆ
کە من هیچم دەسگیر نەبێ لەم ساختە و فرتوفێڵانە

به بزم عــشق مگو حــدیث مــهــروفــا
مــرا بکار نیــاید قــرآن (ناپلیــون)
مــرا ازان چه کــه فــیــروز گشت بسمــارک
مــرا ازان چه کــه پامــال کــشت مکمــاهون

واتا:

لە بەزمی عەشقا تەنها ڕازی خۆشەویستی و وەفا بە کەڵکە
ژن هێنانی ناپلیۆن بە دەردی من ناخوا
من چیم داوە لەوە کە بسمارک سەرکەوتووە
من هەقم بەوەوە چییە کە مەکماهۆن کەوتووەتە ژێر پێ

کـــدام خـــاروخـــسم بهـــره از غنائم یونان
کـدام شـال نصـیـبم ز غـارت (شـالون)
بجـز حکایت (شیـرین) مـپرس از (فـرهاد)
بجـز فـسـانهء (لیلی) مجوی از (مـجنون)

واتا:

چ دڕک و داڵێکم دەسگیربووە لە تالانی یۆنان
کام شاڵم پێ بڕاوە لە تالانی (شالون)
لە ڕازی (شیرین) بەولاوە لە فەرهاد مەپرسە
لە دووی ئەفسانەی لەیل زیاتر مەگەڕێ لای مەجنوون

مـرا بدین سـر شـوریده با جـریده چەکـار
بیـــار ســـاقی گل چمـــره بادهء گلگون
مـــیی کـــه روح رســـاند بعـــالم وحـــدت
مـــیی کـــه راه نماید بحـــضـرت بیـــچـون

واتا:

من بەم سەرە سەوداییەوە کارم بە ڕۆژنامە چییە
ئەی مەیگێڕی پەری ڕوخسار بادەی وەک گوڵی سوور بێنە
مەیێ بێنە کە ڕۆح بگەیەنێتە جیهانی یەکێتی
مەیێ کە ڕێگا بکاتەوە بۆ لای جەنابی بێ هاوتا

بدشـــمنان بنمـــاید شـجـاعت و قـهـرش
بدوســـتـــان بنشـــاند خـــزانهء قـــارون
ببین بزیر رکـابش ســمند صـاعـقـه رو
ببـین بدسـت نـوالـش پـرنـد آزرگـــــــون

واتا:

ئازایی و قاری ئەنوێنێ بە دوژمنان و
گەنجینەی قاروونیش ئەنوێنێ بە دۆستان
لە ژێر ئاوزەنگی و زینی ئەو ئەسپی زەردی وەک بروسکە تێپەڕ بوو ببینە
لە دەستی بە خششیتا ئاوریشمی ئاگر ڕەنگ ببینە

كـه تا مـشـاهده بين هزبر بر ثعـبـان
كـه تـا مـعـاينه بينى جـحـيم در جـيـحـون
نسـيم گلشن مـهـرش اگـر وزد نـيـسـان
سـمـوم آتش قـهـرش اگـر جـهـد كـانون

واتا:

تا زەبری پاڵەوان بەسەر ئەژدەهاوە ببینی و
دۆزەخ لە جەیحوونا بەدی بکەی
شنەبای گوڵزار لوتفی ئەو ئەگەر بە نیسانا هەڵکا
ژاری ئاگری قاری ئەگەر لە کانوونا بجووڵێ

بيـراغ لاله ء نشكفـتـەرا بر يزد برگ
ببـاغ لاله ء افـسـر درا بجـوشـد خـون
كـفش پيـاله ء از باده ء كـرم سـرشـار
دلش سـفـينه ء از گنج مـعـرفت مـشـحـون

واتا:

لالەی نەپشکوتووی ناوباغ گەڵای ئەوەرێ
لالەی سیس بووی ناوباغ خوێنی تیا دێتە جۆش
لەپی پیاڵەی پڕ لە بادەی بەخششە
دڵی پاپۆڕی پڕ لە گەنجی زانستە

يـكى فـقـيـر بود با سـخـاى او مليـار
يـكى پشـيـز بود با عطاى او مليـون
ايـا بـلـنـد جـنـابـا! وزيـر آصـف راى!
به يمن اخـتـر مـسـعـود و طالع مـيـمـون

واتا:

پیاوێکی هەژار لەگەڵ بە خششی ئەوا ئەبێ بە ملیاردێر
یەک پوولی ناچیز ئەو بیدا ئەبێ بە ملیۆنێ
ئەی پایە بڵند، ئەی وەزیری بیروڕا وەک ئاسەفی وەزیری حەزرەتی سولەیمان
بە بەرەکەتی ئەستێرەی بەختەوەری و تالیعی پیرۆز

یکی برای خـــدا تیـغ انتـــقـــام بکش
بخـــواه کـــینهء من از زمـــانهء وارون
همـــیـشـه تابجـهـان خلق داسـتـان دانند
بعـــدل داد کند عـــمـــر دولتت افـــزون

واتا:

بۆ خاتری خوا تێغی تۆڵە هەڵکێشەو
داخی من لە زەمانەی شووم داوا بسێنە
تا هەمیشە خەڵکی دنیا وەک داستان بزانن
کەوا تەمەنی دەوڵەتت بە عەدل و داد زیاد ئەکا

***

## لە ستایشی تەحسین پاشای والیی مووصڵ

شێخ ڕەزا لە پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی، شێخ عەلی دێی (قرخ) و (تاڵەبانی) تەرخان کردبوو بۆ گوزەرانی. ئەم دوو دێیە دەیەڕۆیە بەرهەمێکی وایان نەبوو خـەرجـیـی مـاڵ و دیواخـان و هاتوچووی شـێـخ ڕەزا، لەمل بگرێت، سـەرەڕای ئەوەش مەئمووری باج، بە بەرتیل نەبوایە، باجێکی وای ئەخسـتە سەر بەرهەمی گەنم و جۆ کە شێخ ڕەزا نە بۆی هەڵدەستا و نەیش توانای بەرتیلدانی هەبوو. زمانە تیـژەکەی هەبوو و بەس. بەڵام دەیتوانی هاواری خۆی بگەیێنێتە بەرزترین مـەقامی دەوڵەت. لێرەدا گیر و گرفتی گوزەرانی دەخاتە پێش چاوی والیی مووصڵ کە کەرکوک لە ژێر دەستەڵاتیا بوو و شکاتیش لە مەئمووری باج دەکات.

شـــاد از (خـــشـــه) بودم هم رفت بطاپو
بیـــهـوده گـزشت آن همـه ام سـعی و تکاپو
مـیکارم و چون مـیـدروم کـشـتـهء خـودرا
در خـرمنم آتش زند این چرخ جـفـا جـو

واتا:

دڵم بە (خشە) خۆش بوو، ئەویش تاپۆ بردی
ئەو هەمو و هەوڵ و تەقەلایەم بە فیڕۆ ڕۆیی
زەوی ئەکێڵم و تۆو ئەچێنم و کە داچێنراوەکەی خۆم ئەدروومەوە

ئەم چەرخی جەف بەخشە ئاگر بەر نەداتە خەرمانم

بشكافت چو گندم فلك شعبده بازم
تا مشت جوی گشت مرا حاصل ازين جو
(طاپو ايله ويردی املم باد هوايه
خرمن گبی يانسون يوركی ناظر ويرگو)

واتا:

گەردوونی فێڵباز دووکەرتی کردم وەک دەنکەگەنم
تا مشتێ جۆم لەم بەر جۆگەیە دەسگیر بوو
وەکوو تاپۆ هیوای دایە بایا
وەکو خەرمان هەناوت بسووتێ نازری باج

دست من و دامان تو، ای حضرت والی
ای واسطه ء رزق گدايان دعاگو
عالی نسبا سيرت و سيمای تو زيباست
تحسين لقبا اسم و عسمای ت و نيكو

واتا:

دەستی من و داوێنی تۆ ئەی جەنابی والی
ئەی هۆی ڕزق و ڕۆزیی هەژارانی دوعا گۆ
ئەی بنەچەبەرز! ڕەوشت و سیمای تۆ هەردووکیان جوانن
ئەی کەسێ کە لەقەبت (تەحسین)ە، ناوو شەخسی تۆ هەردوو چاکن

گر بنده ء ثابت قدمی هست منم من
ور خواجه ء صاحب كرمی هست توی تو
فرش است زخاك قدمت عرش سليمان
جويی است زبحر حكمت هوش (ارسطو)

واتا:

ئەگەر بەندەیەکی ئەلەقیو و بەردەوام هەبێ، منم من
ئەگەر خواجە و خاوەنێکی بەخشندەیش هەبێ، تۆ
عەرشی حەزرەتی سولەیمان ڕایەخێکە لە خاکی بەر پێی تۆ

هۆشی ئەرستۆیش ئەوەندەی دەنکە جۆیێکە لە دەریای حیکمەتەکانی تۆ

قطرێ بود از دائرهء جـــود تو (قـــا آن)
تابی بود از شـــعلهء قـــهـــر تو (هلاکـــو)
ســـرپنجـــهء تدبیـــر تو آرایش ملک است
بی منت لشکر کـــشی و قـــوت بازو

واتا:

قائان دڵۆپەیەکە لە دائیرەی بەخششی تۆ
هۆلاکۆ تاوێکە لە تیشکی قارت
سەرپەنجەی ڕاوتەگبیری تۆ مایەی ڕازانەوەی وڵاتە
بێ هەڵگرتنی منەتی لەشکر کردنەسەر و هێزی بازوو

ادراک تو در تســـویهء امـــر ســـیـــاسی
بشکافت بسی مـــعنی باریکتـــر ازمـــو
گه جلوه رەونق‌و گه شاهد وحدت بود این باغ
گـــه در صـــفت ژاله و گـــه‌لاله‌ء خـــود رو
تشـــریف بیـــارید اگـــر، ازســـر اخـــلاص
آید بنعـــال قـــدمت (شـــێخ رضـــا) رو

واتا:

تێگەیشتنی تۆ لە چارەکردنی هەر کارێکی سیاسیدا
مەعنای گەلێ لە موو باریکتر ئەقڵەشێنێ
دەمێک ڕەونەق و دەمێک شایەدی یەکێتییە ئەم باغە
دەمێک وەکوو ژاڵە تاڵ و دەمێک وەکوو لاڵەی ڕوواو
ئەگەر تەشریف بێنن، شێخ ڕەزا لە ڕووی دڵسۆزییەوە
ڕووی خۆی ئەخاتە بەر پێڵاوەکانی پێت

***

## لە ستایشی شێخ حیسامەددینی طەوێڵە

شێخانی بیارە و تەوێڵە هەر لە کۆنەوە دۆستایەتییەکی قووڵیان لەگەڵ شێخانی تاڵەبانی هەیە. شێخانی تاڵەبانیش پێوەندییەکی ڕووحییان لەگەڵ ناوچەی هەوراماندا

هەیە و لە پاوەدا لقێکی تەکیەی تاڵەبانی هەیە و گەلێک کەس لەو ناوچەیە سەر بە ڕێبازی قادری تاڵەبانییەکانن. شێخ ڕەزایش، هاتوچووی بۆ ئەو ناوچەیە و شارانی کوردستانی ئێران، لە ڕێگای بیارە و تەوێڵەوە دەبوو. لەم ستایشەدا، شێخ ڕەزا باسی ڕێبازی سوفییەتیی شێخانی تەوێڵە دەکات.

نەنحر از مطلع گیلان بدر آرد ماهی
نعلم برکشد ازسمت بخارا شاهی
نەزرندان صبوحی زدە ء بزم (الست)
های ء هوی، طربی، خندە ء، قاها قاهی

واتا:
نەمانگێ لە جێ هەڵهاتنی گەیلانەوە سەر دەربێنێ (مەبەست لە حەزرەتی عەوثە)
نە لە لای بوخاراوە شاهێکی (وەک شاهی نەقشبەند) ئاڵا هەڵکا
نە های و هوویێ، قاقا و پێکەنینێ، خۆشییێ
لە سەرخۆشانی مەی لە کەللەداوی بەزمی خواناسی بەرز بێتەوە

نەزکاشانە ببازار (انا الحق) گویان
مست و سرخوش گزرد پیر فنا فی اللّهی
نە بدا من چکد از دیدە ء گریان اشکی
نە بکیوان جهد از سینە ء سوزان آهی

واتا:
نە پیرێکی فەنافیللا لە کونجی خەڵوەتەکەی خۆیەوە، بەدەم (انا الحق) وتنەوە
بە مەستی و سەرخۆشی بڕواتە بازاڕ
نە دڵۆپێ فرمێسک لە چاوی پڕ لە گریانەوە بڕژێتە داوێن
نە لە سنگی ئاگر تێ بەربووەوە ئاخێک سەرکەوێ بۆ ئەستێرەی زوحەل

اوحدی، سری، احمدی، معروفی
بایزیدی حسنی خواجە عبیداللهی
زیر این کبند فیروزە نیای امروز
پی بحق برزە ز اسرار خدا اگاهی

واتا:

ئەوحەدی مەراغەیی، سرِیی سەقەطی، کاک ئەحمەدی شێخ، شێخ مەعرووفی کەرخی
بایەزیدی بە سطامی، حەسەنی بەسری، خواجە عوبەیدیڵلایەکی ئەحرار
نابینیتەوە لە ژێر ئەم گومەزە شینی ئاسمانەدا ئیمرۆ
پەیی بەخوا بردبێ و لە ڕازی خوا ئاگادار بێ

بود هرجـــا در فـــیض همـــه را قـــفل زرند
التـــجـا کـــار خـــرونیـــست بهـــر درگـــاهی
قـــرب یزدان نتـــوان جـــست زهر آهرمنی
دست بیـــعت نتـــوان داد بهـــر گـــمـــراهی

واتا:

لە هەر کوێیەکا دەرگایەکی فەیز و بەرەکەت هەبوو هەموویان داخست
کاری پیاوی عاقڵ نییە پەنا بەرێتە بەر هەر دەرگایێ
ناتوانێ لای هەر شەیتانێ نزیکی خوات دەسگیر بێ
ناتوانی دەستی بەیعەت بدەیتە دەست هەر گومڕاییێ

کـــرد هر ملحـــدکی جـــامـــهء تقـــوا دربر
کـــه منم قطب جـــهـــان تابکف آرد جـــاهی
فـــیض خـواهی زمـریدان (حـسـام الدین) شـو
آنکه پیش کـــرمش کـــوه کم است ازکـــاهی

واتا:

هەر گوێلکە بێ خوایێ کراسی خوا پەرستیی لەبەر کردووە و
ئەڵێ منم قوتبی جیهان، بۆ ئەوەی پایەیەک بۆ خۆی دەسخا
تۆ ئەگەر فەیز و بەرەکەتت ئەوێ ببە بە یەکێ لە مریدانی حسامەددین
ئەوەی کە کێوێ لە مەیدانی کەرەمیا لە پوشکە کایێ کەمترە.

چون نشـــیند زپی خـــتم به خلوت گـــویی
خـــیـمـه در وادئی وحـدت زده شـــاهنشـــاهی
آنکه بایک نظرش دست دهد ســـالک راه
قـــرب صـــد ســـاله عـــبـــادت بسلوک مـــاهی

واتا:

کاتێ کە پاش خەتم لە خەڵوەتا دائەنیشێ، ئەڵێی
شاهەنشایێ دەواری لە شێوی یەکێتییا هەڵداوە
ئەوەی بەیەک لالێکردنەوەی ئەو دەستی کەسێ ئەکەوێ ڕێی سولوکی گرتبێتەبەر
بریتییە لە نزیکەی پاداشی سەدساڵ خواپەرستی بەڕێی سولووک گرتنەبەری یەک مانگ

آرد از همت آو دامن مــقــصــود بدست
دست در دامن مــقــصــود چو من کــوتاهی
حــاســدی گــرکند انکار کــمــالش چەعــجب
یوســفــیــو افکند. دست حــســد در چاهی

واتا:

بە هیمەتی ئەو داوێنی مەبەست ئەگرێ بەدەستی خۆی
کەسێ کە دەستی لە داوێنی مەتڵەب گرتن کورت بێ وەک من
حەسوودێ ئەگەر ئینکاری کەماڵی ئەو بکا سەیر نییە
دەستی حەسەد یووسفێک ئەخاتە چاڵێکەوە

چە غم از رهزنیء نفس گــرت بدرقــه اوست
پنجــه باشــیــر علی چون فــکند روباهی
ای مــتــاع دوجــهــان جــائزهء یک نگهت
خــواهم از چشم (رضــا) عطف نگاهی گــاهی

واتا:

خەمی ڕێگری نەفست چییە ئەگەر ئەو بەرێ کەوتبێ لە ڕێدا
ڕێویێ چۆن پەنجە لە پەنجەی شێری عەلی ئەدا
ئەی سەرمایەی هەردوو دنیا خەڵاتی یەک لاکردنەوەتم ئەوێ
لە چاوی ڕەزامەندییەوەو، جاروبار لایەکم بەلادا بکەیتەوە و تەماشایەکم بکەی

از ثنا زود عنان باز کــشــیــدم کــه نداشت
در خــور طبع روان قــافــیــه جــولان گــاهی
تــا ســری هست ســر نامــوران در قــدمت
تــا دلــی هــست دلت نائل هــر دل خــــواهی

بو جـودت کـه بود تعـبـیـه در جـوهر جـود
نەرسـد رنجی و، عـارض نشـود اکـراهی

واتا:

زوو جڵەوی تاریف کردنتم گرتەوە چونکە
قافیە مەیدانێک نەسپ تاودانی وای نەبوو شایانی تەبیعەتی ڕەوانی شیعرم بێ
یاخوا تا سەرێ هەیە سەری هەموو ناوداران لەبەر پێتا بێ
یاخوا تا دڵێ هەیە دڵت بە هەموو دڵخوازێ بگا
لاشەت کە لە گەوهەری بوونا پڕ کراوە
هیچ ئازارێکی نەگاتێ و هیچ ناخۆشییەکی نەیەتەڕێ

***

## شێخ ڕەزا و شاری سولەیمانی

شێخ ڕەزا پێوەندییەکی ڕوحی و ئەدەبیی زۆری بە سولەیمانییەوە هەیە. ئەو پێوەندییە رووحییە؛ لە پێوەندیی شێخ مارفی کۆسە لەگەڵ شێخ ئەحمەدی باپیرییەوەو مامۆستای رووحیی شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی و هاو فەقێیەتیی لەگەڵ کاک ئەحمەدی شێخەوە دەست پێ ئەکا.

## شێخ ڕەزا و شێخانی بەرزنجە

دۆستایەتییەکی زۆر قووڵ لە نێوان شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی و شێخ مارفی کۆسەوە هەبوو. ڕۆژێک شێخ مارف لە شێخ ئەحمەد ئەپرسێت: «یاشێخ چەند کوڕت هەیە؟» لە وەڵامدا: «قوربان یانزە»، «یاشێخ زەکاتیان دەکەوێتە سەر» چونکە شێخ مارف کوڕی نەبوو. «قوربان عبدولڕەحمانیان لێ دەرچێت هەموویان لە خزمەتتان». «ناوەڵلا، من عەبدولڕەحمانم دەوێت، دەیکەمە مەلا و پەروەردەی خواپەرستیی ئەکەم و دەتدەمەوە» ئیتر شێخ عەبدولڕەحمان بەهرەی شێخێتیی لەسەر دەستی شێخ مارف وەردەگرێت و ئیجازەی زانستی لەسەر دەستی زانای بە ناوبانگ مەلا ئەوڕەحمانی ڕۆژبەیانی دەبێت.

ئەم دۆستایەتییە هاو فەقێیەتیەی نێوان شێخ عەبدولڕەحمان و کاک ئەحمەدی شێخ دەسپێرێتە نەوەی هەردووکیان و هەموو شێخانی بەرزنجە و تاڵەبانی دەگرێتەوە، بەڵام لە پاشـان هەندێ ڕووداوی بەداخ لە نێـوانیـاندا ڕوویداوە گـەردی خـسـتـووەتە سـەر ئەو

دۆستایەتییە قووڵە.

شێخ ڕەزا، لەناو تەمی ئەم دوژمنایەتییەدا دۆستایەتیی کۆنی پایماڵ نەکردووە و لە ستایشەکەی کاک ئەحمەدی شێخدا ئەو پێوەندییە ڕووحییەی دەردەبڕێت و خۆشەویستیی خۆی، نەک تەنها بەرامبەر بنەماڵەی کاک ئەحمەد بەڵکو بەرامبەری هەموو سولەیمانی دەردەخات و لە شیعرێکی کوردیدا دەڵێت:

مەربووطە حەیاتم بە سولەیمانی و خاکی
خۆزگەم بە سەگی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی
ئەو قیدوەتی ساداتە کە سوککانی سەماوات
شەریانە لەسەر سوجدە ئەبەر مەرقەدی پاکی
ئەو مەرقەدی والایە کە وەک عەرشی موعەللا
مەحفووفە بە زوواری مەلەک دەوری شیباکی
بۆ دەست و عەسا نازگەکەی داخە دەروونم
قوربانی عەسای دەستی دەبم سۆل و سیواکی
دونیا لە دوای حەزرەتی شێخ زێڕ و زەبەر بێ
وەک تاجی کەی و جامی جەم و بەختی ضوحاکی
دەرهەق بە حەفیدانی ئەدەب لازمە زینهار
قوربانی حەفیدانی دەبم بابی و داکی
بەم حاڵە پەرێشانەوە باز (اشهد باللە)
شیعرت تەرەبەنگێزە (ڕەزا) شاعیری چاکی

لە شیعرێکی فارسیدا، لە مەدحی شێخ مستەفای نەقیبدا دەڵێت:

دست خیاط أزل خرقەء ناموس و عفاف
خوش برید است ببالای نقیب الاشراف
یعنی نعم الخلف حضرت (کاک احد شیخ)
آنکە با شیر زند پنجە بمیدان مصاف

واتا:

دەستی بەرگدووری ئەزەل خەرقەی ناموس شەرەفی

زۆر جوان بە باڵای (نەقیبولئەشراف) بڕیوە
یانی باشترین پاشماوەی کاک ئەحمەدی شێخە
کە لە مەیدانی شەڕا پەنجە لە پەنجەی شێر ئەدا

مــصطفی نام و چراغ نسب مــصطفــوی
نطفــهء هاشم و نقــدی کـمــری عــبـد مناف
مــدعی، گــو نزید لاف زهم چشــمیٔ او
تـکیــه بر جــای بزرگــان نتــوان زد بگزاف

واتا:

مستەفای ناوە و چرای ئەولادی مستەفایە
نوتفەیی هاشم و دراوی بەر پشتێنی عەبدولمەناف
بڵێ بە موددەعی با لافی سەرچاوەی ئەو نەدا
ناتوانێ بە هەرزەگۆیی پاڵ بە جێی پیاوی گەورەوە بدرێ

بزیارت گــهی آبای کــرامش چه عــجب
سـر قــدم ســاخـتــه آیند مــلائک بطواف
ای ترا بـندگی من نـه به امـــیــد طمع
ندهم دست کــریم تـو بصــد وجــه کــفــاف

واتا:

بۆ زیارەت کردنی با و باپیرە گەورەکانت
هیچ سەیر نییە ئەگەر فریشتە بەسەر سەربێن
ئەی کەسێ کە بەندەیی من بۆ تو بە هیوای تەماع نییە
دەستی بەخشندەی تۆ بە سەد مایەی ژیان ناگۆڕمەوە.

امـتــیــاز از دیگران داده خـدایت بسـهچیـز
همت عــالـی و دست کـرم و طینت صــاف
تکیـه بر مـسند جدت زن و اندیشـه مکن
جــز ســرانگشت ندامت تگزد اهل خــلاف

واتا:

خوا تۆی لە خەلقی تر بە سێ شت هەڵاویردووە

هیممەتی بەرز و دەستی بەخشش و ڕەگەزی پاک
پاڵ بە پشتەوانەی باپیرتەوە بدە و بیر مەکەرەوە،
ناحەزتان لەوە بەولاوە کە پەنجەی پەشیمانی بگەزن هیچی تریان پێ نابڕێ.

خصمرا تیغ زبان من و شمشیر توبس
دی ازان روز کە این هر دو برایند ز غلاف
بشکافد دم شمشیر توش مهرەء پشت
بگزرد نوک سنان منش از حقەء ناف

واتا:

بەسە بۆ دوژمن تیغی زمانی من و شمشێری تۆ
ئای لەو ڕۆژەی کە ئەم دوو تیغە لە کیلان بێنەدەر
نووکی شمشێری تۆ موورەعەبی پشت ئەو لەت ئەکا
نووکی ڕمی منیش لە ئەلقەی ناوکی تێ ئەپەڕێ.

کمترین جود تو ای زبدەء اولاد حسین
خرج دە سالەء دولت ز دولک خانەء جاف
تا بود همچو بنی آکلە با آل علی
چرخ در بارەء ارباب هنر بی انصاف
باد اندام عدو تو بسجیل قضا
(عصف ماکول لایلاف قریش ایلاف)

واتا:

کەمترین بەخششی تۆ ئەی پوختەی ئەولادی حوسەین،
خەرجیی دەساڵەی دەوڵەتە لە دوو صەد هەزار ماڵە جاف.
تا گەردوون لەگەڵ ئەولادی عەلیەدا بێ ئینسا بێ،
وەک چۆن (بنی آکلە) لەگەڵ ئالی عەلی بێ ئینسانی بوون
ئەندامی لەشی دوژمنی تۆ بە بەردی ڕەقی قەزا و قەدەر
وەک کای خوراوی سوورەتی (لایلاف قریش)ی لێ بێ.

لە ستایشێکی تری حەفیدان؛ شێخ سەعید و شێخ مارف و شێخ مستەفا دەڵێت:

توکز نبیرەء کاک احمدی و آل نبی

کـفـایت است ازین خـوبتـر چه مـیطلبی
بس است قدرو شرف این قدر که جد شماست
شـفـیع روز قـیـامت مـحـمـد عـربی

واتا:

تۆ که له نەوەی کاکه حمەد و ئالی پێغەمبەری،
ئەمەت بەسە، لەمە زیاتر داوای چی ئەکەی؟
ئەمەندە بۆ قەدر و شەرەفی ئێوە بەسە کەوا
شەفاعەتکاری ڕۆژی قیامەت موحەممەدی عەرەبی باپیرتانە

بنا مـحـمـدو، مـادر بتـول و، حـیـدر باب
زهی سـلالـه‌ء طاهر (فـدیتکم بأبي)
بهـر کـجـا کـه‌نسب نامـه‌ء شـمـا خـوانند
کـرا رسـد کـه کند ادعـای ذو نسـبی

واتا:

باپیره موحەممەد و، دایک بەتوول (فاتیمە)و، حەیدەر باوک بێ
بنەچە لەمە خاوێنتر نەبێ هەبێ باوکم بە قوربانتان بێ؟
لە هەر کوێ شەجەرەی ئێوە بخوێننەوە
کێ دەرفەتی ئەوەی ئەبێ ئیددیعای خاوەن بنەچەیی بکا؟

اگـر بحـرمـت آل نبـی بـردارد
بـه نیـمـراه بماند دعـای نیـمـه شـبی
اگـر گـذشت نزاعی مـیـان مـا چه عـجب
زمـانـه راست کـزینسـان هزار بو العـجـبی

واتا:

ئەگەر لەبەر حورمەتی ئالی نەبی (نەبوایە)
دوعا و پاڕانەوەی نیوە شەوان لە ناوەڕاستی ڕێگادا ئەمایەوە
ئەگەر هەرایەک لە نێوان ئێمەدا ڕووی دابێ سەیر نییە
زەمانە هەزار شتی سەیری لەم بابەتەی هەیە

تهی نبـود ز حکمت بخـیـر منجـر شـد

بخـوان (حكايت خـضـر نبى وقـتـل صـبى)
هەزار ســـال بگـويم اگـــر ثناى شـــمـــا
ســـخن هنوز بود در مـــقـــام بى أدبى

واتا:

هەرایێ لە نێوان ئێمەدا ڕووی دابێ خاڵی نەبووە، لە سەرەوە ئەنجامی بەخێر بووە
ڕازی حەزرەتی خدر پێغەمبەر و کوشتنی مناڵەکە بخوێنەرەوە،
ئەگەر هەزار ساڵ تەعریف و سەفای ئێوە بکەم
هێشتا کو قسە لە مەیدانی بێ ئەدەبی ناچێتە دەر

مـــحب آل رســـول از گـناه كى تـرســـد
(فـــقـل لمذنبـــه ذنبـــه علـى رقـــبى)
بس است عـــرض خلوص اى (رضـــا) زبان دركش
بزد آن كـــه بود در مـــقـــام (يســـمـع بى)*

واتا:

خۆشەویستی نەوەی پێغەمبەر کەی لە گوناه ئەترسێ؟
بڵێ بە گوناهباری خۆشەویستیان گوناهی ئەو لە گەردنی من
ڕەزا، با عەرزی ئیخلاس بەس بێ و زمان بکێشەوە،
لە خزمەتی ئەو کەسەدا کە لە پلەی (يسمع بی) دایە

* ئیشارەتە بۆ حەدیثی (مايزال العبد يتقرب الى بالنوافل حتى اكون سمعه الذى يسمع به وبصره الذى يبصر به)، واتە: بەندە زۆر لە خوا ترس و عیبادەتکار (واتە خوا) بۆی ئەبم بە هەموو شتێکی واتە هەموو کارێکی بۆ مەیسەر ئەکەم

جناب شـيـخ سـعـيـد آن حـفـيـد قطب جـهـان
كـــه يافـــتـــه است زجـــدش نشـــان منتـــخـبى
دوم نـبـيـــره، فـــرخنده، (شـــيّخ مـــعـــروف است)
بـه فـــضـل و دانش او مـــعـــتــرف ذكى و غـــبى

واتا:

جەنابی شێخ سەعیدی کوڕەزای قوتبی جیهان،
کە نیشانی هەڵبژاردەیی لە باپیری وەرگرتووە،
دوو هەمیشیان نەوەی پیرۆزی شێخ مارفی نۆدێیە،

که زیرەک و کەودەن دانیان بە گەورەیی ئەودا ناوە.

سـیم سـلالەء والا گـهـر جناب نقـیب
کـە شـیـر رم کند ازوی بگاه پر غـضـبی
دعـای این سـە حـفـیـداست ورد روزوشـبم
بلطف خـود هـمـەرا دست گـیـر یا ربی

واتا:

سێهەمیش وەچەی ڕەسەن باڵا جەنابی نەقیبە،
کە هەر کاتێ ڕقی هەستێ شێر لە تاوان لێی هەڵدێ،
ویردی شەو و ڕۆژم دۆعای خێرە بۆ ئەم سێ کوڕەزایە،
خوایە بە لوتفی خۆت دەستی هەر سیانیان بگرە.

لەگەڵ ئەم هەموو بەڕێزییەدا، شێخ ڕەزا، بەرامبەر بنەماڵەی حەفید، لەم لاوە لە ناوچەی بناری «گل» ڕووداوێکی خوێناوی لە نێوانی شێخانی بەرزنجە و شێخانی تاڵەبانی ڕووی داوە. شێخانی بەرزنجەی قەرەچێوار، هەر چەندە جێ ڕێزی شێخانی تاڵەبانی بوون، بەهۆی ناکۆکیی نێوانیان لەسەر زەوی و زار، یەکێک لە پیاوە ناسراوەکانی تاڵەبانی «شێخ صەمەد کوڕی شێخ عەزیز» بە جۆرێکی دڵڕەقانە لەلایەن شێخ حوسێنی قەرەچیوارەوە کوژرا، و لە تۆڵەی ئەودا شێخ حوسێن بە دەست شێخ حەمیدی شێخ عەزیز کوژرا و ئەم هەموو دۆستایەتی و بەڕێزییەی نێوانیان بە با چوو. ئەم دوژمنایەتییە هەر تەنییەوە، و هەر چەنێک شێخ مەحموودی حەفید لەکاتی حوکمداریدا تەقەلای سارێژکردنی ئەو دوو برینەی کرد، بەڵام هەر تەشەنەی دەکرد و بووە هۆی وەستانی زۆربەی تاڵەبانییەکان دژی هێزەکانی شێخ مەحموود و تێشکاندنی لە شەڕی «ئاوباریک»دا. لە پێناوی کوژرانی ئەم دوو پیاوە دیاری و ناسراوەی هەردوو ئێلدا چەند جارێک لەشکری هەردوولا بەیەکدا هاتن و گەلێک کوشتار لە ناویاندا ڕووی دا.

شێخ ڕەزایش لەمەدا نەیتوانی پشتیوانی ئێلەکەی نەکات، بەڵام لایەنگیری ناشت بوونەوەی هەردوو ئێل بوو و لە شیعرێکیدا دەڵێت:

(شێخ سەعید) سەردارە، (شێخ مەعروف) هەتا حەزکەی نەجیب
بۆ جوانمەردی و شەجاعەت (بینی بەینەللا نەقیب)
گەر ڕەقیب نەبوایە کەی مابینی ئێمە تێک دەچو

کــیــر بە کــوز داکی مــوفــەتتین، گــووبەڕیش باوکی ڕەقــیب

بەرامبەر کوشتنی شێخ حوسێنی قەرەچێوار، بەرزنجە چەند جارێک لەشکریان لە تاڵەبانی کردووە و بەڵام لەم شەڕانەدا سەرنەکەوتوون. لەم شەڕانەدا عەشیرەتی ڕەباتیش لە هاوشانی شێخانی بەرزنجەدا بەشدارییان کردووە. شێخ ڕەزا هەرچەنێک بەرامبەر بەرزنجە چاو پۆشی دەکات، بەڵام بە هاتنی ئاغای ڕەباتی زۆر تووڕە دەبێت و دەڵێت:

ئەگــەر (بەرزنجــە) غــەدرێکیش بکەن هەر نەیســە ســاداتن
(خــدر) ئاغــای ڕەباتی دایکی خــۆ گێ ئێــوە بۆ هاتن
خەزوورەی شێخ حەمید ئاغای ڕەباتی کۆنە قەڵتاغ شڕ
لە ئەسڵ و مــەعــدەنا ئەجــدادی ئێــوە دۆم و خــەڕاتن

لە یەکێک لەو لەشکر ئاراییانەی بەرزنجە و تاڵەبانیدا، بەرزنجە بە لەشکرێکی گەورەوە دینە سەر تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک. تاڵەبانی خۆیان و زەنگنە و گل و بەرزنجەیش هەمەوەند و جەبارییان لەگەڵ ئەبێت. ئەم لەشکرە گەورەیەی بەرزنجە دوو ڕۆژ چاوەنواڕی هاتنی ئاغا تەهای ڕەباتی ئەکەن. کەچی ئاغا تەها بە سواری نێرەکەرێک؛ دوو دەمانچەی «قەرەبینای» کۆن لە پشت و پیاوێکیش بە (قامە) و یەکێکیش بە (کوتەگ) لە دواین. پیاوێکی قۆشمەی جەباری قورئانێک دێنێ و دەیخاتە باوش ئاغا تەهاوە. «ئاغا بۆ خاتری ئەم قورئانە، تاڵەبانیش ئەولادی شێخ و مشایەخن، ڕەحم لە ماڵ و منداڵیان بکە» ئاغا تەها تووڕە ئەبێت و ئەگەڕێتەوە.

بۆ دامرکاندنی ئەم شەڕ و شۆڕە لە نێوان دوو فامیلیای پێشڕەوی ئایینیدا، حکومەتی عوسمانیش دەکەوێتە ناوبژی کردن و ئاوی تەیناڵ، کە موڵکی شێخ عەلی بوو دەیدەنە شێخانی بەرزنجە و لە جیاتی ئەوە زۆربەی ئاو و زەویی دێهاتی (لەیلان) و (یەحیاوە) ئەدەنە شێخ عەلی. شێخ ڕەزا کە لە شیعرێکا ئەیوت:

شــاه حــسین از خــواب دیدم در مــلا
گــفــتم ای شــاه شــهــیــد کــربلا
ســـیـــدی برزنجـــه از نسل تواند
(قـــال لا والله هذا مـــفـــتـــری)

واتا:
شاه حوسێنم لە خەودا دی بە ئاشکەرا
وتم ئەی شای شەهیدی کەربەلا
سەییدی بەرزنجە لە نەسلی توون؟
وتی ناوەڵلا ئەمە بوهتانە.

کەچی ئاشت بوونەوەی تاڵەبانی و بەرزنجەی پێ خۆش دەبێت و دەڵێت پەنجەدان لەگەڵ بەرەی پێغەمبەر پیشەی ئێمە نییە، بەڵام ئەمە کردەوەی خودایە.

ماه رمضان چون گذرد نوبت عید است
پیش از رمضان آمدن عید که دید است
کرکوک چرا برهمه آفاق ننازد
امروز که آرامگه این سه حفید است

واتا:
کە مانگی ڕەمەزان بەسەر بچێ نۆبەی جەژنە
کێ هاتنی جەژنی بەر لە مانگی ڕەمەزان دیوە؟
کەرکووک بۆ بەسەر هەموو جیهاندا نەنازێ؟
ئەمڕۆ کە ئەو سێ کوڕەزایەی کاکە حەمەدی تیا ئەحەسێتەوە

أز عید غرض صبحت آن قدوهء سادات
سردار گروه شرفا (شیخ سعید) است
صد شکر که مقدم آن یار عزیزان
هەر سال دو عید آمد و امسال سه عید است

واتا:
مەبەست لە جەژن هاوڕێیەتیی ئەو پێشەوای ساداتەیە
کە شێخ سەعیدی سەرداری گرۆی شەریفانە
سەدجار سوپاس بۆ خوا کە لە هاتنی ئەو دۆستە عەزیزانەدا
هەمو و ساڵی دوو جەژن هاتووە و ئەمساڵ سێ جەژن هەیە

أز سعدی آن (شیخ سعید) است که إمسال
مقراض حوادث سرمویی تبرید است

با آل نبی پنجه زدن پیشهء ما نیست

این واقعه؛ تقدیر خداوند مجید است

واتا:

لەبەرەکەتی ئەو شێخ سەعیدەوەیە ئەمساڵ

مقەستی ڕوودا و سەرەموویەکی نەقرتاندووە

پەنجە لێدان لەگەڵ ئالی پێغەمبەر کاری ئێمە نییە

بەڵام ئەم ڕووداوە قەزا و قەدەری خوای گەورە خۆیەتی

نسبت نه کنونست بدین دوده (رضا)را

در روز أزل، عاشق و درویش و مریداست

واتا:

خۆدانە پاڵی ئەم بنەماڵەیە، بەش بە حاڵی شێخ ڕەزا، لە ئێستاوە نییە

ئەو هەر لە ڕۆژی ئەزەلەوە عاشق و دەروێش و مریدە.

لە پاش ئەم ئاشتییە؛ شێخ ڕەزا دووبارە دەگەڕێتەوە دەربڕینی ڕێزی خۆی بۆ فامیلیای «حەفید» بەڵام ڕێزی شێخ ڕەزایی، کە دەڵێت:

«شێخ مستەفا» لە زومرەی ئەولادی مورتەزایە

هەر کەس کە خەصمی ئەو بێ دەیگێم لەلام غەزایە

حاجی ڕەسووڵ زادە مەفعوولی شێخ «رضا»یە

«ڕضا» بەناڕەزایی وەک ماری بێ ڕەزایە

لە شیعرێکی تریدا دەڵێت:

موخالەفەم نییە من سەعاتێکی میقاتم

غولامی حەلقە بە گوشی جەمیعی ساداتم

کەچی لە فەردێکی شیعری فارسیدا دەڵێت:

زهر جا جمع گشتند أهل سادات

فسادات فسادات فسادات

واتا:

لە هەر لایێ (سەیید) کۆببنەوە و (سادات) پێک بێنن ئیتر هەر (فەسادات) و (فەسادات) و (فەسادات) ئەبێ هونەرەکەی لە فاسییەکەدا لەوەدایە (سید) کە کۆکرایەوە و کرایە جەمع ئەبێ

به (سادات). ئەم ڕستەیەش شەرت و جەزایەو جەزا (ف)ی ئەچێتە سەر و بەم پێیە وشەی (سادات) کە (ف)ی چووە سەر ئەبێ بە (فسادات). هەروا کۆی (فاسد)یشە.

***

## شێخ ڕەزا و قوچ بەگی شاعیر

جارێک شێخ ڕەزا ئەچێتە سولەیمانی و ئەبێتە میوانی سەید ئەحمەدی نەقیب. نەقیب بە شەرەفی شێخ ڕەزاوە گەلێک لە ئەدیب و شاعیرانی سولەیمانی لەسەر خوانی نان خواردنی شام (شێوان)کۆ ئەکاتەوە. لە کاتی نان خواردندا شێخ ڕەزا کوردانە قۆڵی هەڵدەماڵێت دەس ئەکاتە تیکەی زل کردن. قوچ بەگی شاعیر بە دەرفەتی دەزانێت و دەس کاری لە شیعرێکی حافظی شیرازی ئەکات و ئەڵێت:

در حلقەیی گول و مول چەندە ئەکەی تیکەی زل
تەوقی ظالمت لە مل (یا ایها ال) ڕەزا را

بنەڕەتی هەڵبەستەکەی حافظ ئەمەیە:

در حلقەء گل و مل خوش خواند دوش بلبل
هات الصبوح هیوا یاایها السکاری

واتا:

لەناو حەلقەی گوڵ و شەرابا دوێنێ جوانی ئەخوێند بولبول
ناشتابی بهێنە و کۆبنەوە ئەی مەستان

شێخ ڕەزا تیکەکەی بۆ قووت نادرێ و دەری دێنی و ئەیخاتە ژێر خوانەکە و دەسکاری لە شیعرێکی تری حافظ ئەکات و ئەڵێ:

غلط گوفتی و گو خوردی بیا و خوش بتر قوچ بگ
کی بەر ریشی تو ئەفشانەد فەلەک ریتالی مانگارا

بنەڕەتی هەڵبەستەکەی حافظ ئەمەیە:

غزل گفتی و در سفتی بیا و خوش بخوان حافظ
کە بر نظم تو افشاند فلک عقد ثریارا

واتا:

غەزەلت وت و دوڕت هۆنیەوە وەرە حافز خۆش بڵێ

که بەسەر هەڵبەستی توا بیارێنێ فەلەک ملوانکی ثریا

کەچی شێخ ڕەزا ئەیکاتە:

خەڵتت کرد و گووت خوارد ، وەرە بترە قوچ بەگ

کە بەسەر ریشی تۆدا فەلەک ببارێنی ڕیخی مانگا

***

### لەگەڵ زێوەری شاعیر

شێخ ڕەزا لە پارچە شیعرێکی حەوت بەیتیدا هەجوی زێوەری شاعیر ئەکا و تەنها ئەمەی خوارەوەمان دەس کەوتووە و ئەڵێت:

لەبەر مەغبووریی و لیڵی دوو سێ تێلام لە (زێوەر) دا

وەکو شەخسێ کە چەند کێرێ لەسەر چەشمەی قوزێ وەردا

### لە هەجوی مەحویی شاعیردا

ئەم شیعرەی شێخ ڕەزا بەیتێکە لە پارچە شیعرێک، لە نەجمەددین مەلاوە وەرگیراوە. و لە (٤٠٥)ی کشکۆڵی محەمەد ئەمجەد ئەحمەدی سەدباری وەرگیراوە زۆر بەداخەوە هەندێ کەس دەستی بەسەرا گرتوون و هەر ئەمەیان دەسکەوت:

کووپە هەیئەت، ڕوو (مەرە)، سینەک سیفەت دینار پەرست

(ئەسکەمل) مل، مەشرەب (ئۆغلان)، کاری پاپازی دەکا

***

### شیعرێک کە هێشتا ساغ نەکراوەتەوە

ئەڵێن، لە زوبانی ڕەشید ئەفەندی عیزەت ئەفەندی عەبدوڵڵا ئاغای کەرکووکییە، کە بە ڕەشید چاوش ناسراوە، گوایا شێخ ڕەزا ئەمەی بە شێخ عەلیی کاکی وتووە. بەڵام مامۆستا جەمیلی ڕۆژبەیانی دەڵێت ئەمە بە شێخ مەحموودی حەفید وتراوە. بۆچوونەکەی مامۆستا جەمیل لە ڕاستییەوە نزیکترە، چونکە ئەم جۆرە قسانە لە نێوان شێخ ڕەزا و شێخ عەلیی کاکیدا نەبووە و گلەیی شێخ ڕەزا لە کاکی؛ هەر تەنها لەبابەت گوزەرانەوە بووە.

فـــەرمـــووتە: ئيـــجـــتـــيناب بكە لەو جـــەنابەتە
شـــێـــخم، ئەگـــەر بزانی، جـــەنابت جـــەنابەتە
پیـــر بووی و تەرکی ڕەســـمی کـــۆ دەکـــیت نەکـــرد
هەروا ئـەزانی ئەووەڵـی عـــــەهدی شـــــەبابـەتە

هەر چەنێک ئەمە لە شیعری شێخ ڕەزا ئەچێ، بەڵام لەو بڕوایەدام ئەگەر شیعری شێخ ڕەزا بێت، نەبە شێخ عەلیی کاکی و نەیش بەشێخ مەحموودی حەفیدی نەوتووە. *

چونکە کـە دەڵێ «پیـر بووی» شـێخ مـەحـموود لەسـەردەمی شـێخ ڕەزادا پیـر نەبوو. ئەم شیـعـرە یان شێخ ڕەزا بە شـێـخـێکی تری وتووە و یان یەکـێکی تری بە شێخ مـەحـموودی وتووە.

***

## شەڕە شیعری شێخ ڕەزا و شوکری فەزلی

شوکری فەزڵی لە باوکەوە کوردی شاری سنەی کوردسـتانی ڕۆژهەڵاتە و دایکی عەرەبی بەغدایە. زۆربەی ژیانی لە بەغدا و سولەیمانی ڕابواردووە و زمانی کوردی و عەرەبیی زۆر چاک زانیوە و توانیویە پەنجە لەگەڵ شاعیرێکی وەکو شێخ ڕەزا بدات. شوکری لەم شەڕە شیـعرانەدا، خۆی داوەتە پاڵ شێخانی بەرزنجەی سولەیمانی و هەروا زاوای موفتی زەهاوی بووە، لەبەرئەوە شێخ ڕەزا، لەگەڵ شـوکریدا جارجـار پەلاری لە شـێـخـانی سـولەیمانیش گرتووە و هەندێ جاریش شوکری لەگەڵ بنەماڵەی موفتی زەهاوی جووت کردووە. بەڵام ئەم هەموو هەجوەی یەکتر و ئەم هەموو جنێودانە بۆ دەرخستنی هونەرمەندی بووە و تەئسیری لەسـەر پێـوەندییـان نەکـردووە. هەر لەوکـاتانەدا شـوکـری تووشی گـێـچـەڵێکی گـەورەی کاربەدەستانی حوکمی عوسمانی دەبێت و مەترسیی لە سێدارەدانی لێ دەکەن. کەسوکاری هاوار دەبەنە لای شـێخ ڕەزا، ئەویش بە هۆی دۆسـتـایەتیی لەگـەڵ نازم پاشـای والیی بەغـدا، لە مـردن ڕزگـاری ئەکـات و لە پاش کـۆچی دوایی شـێخ ڕەزا شـوکـری زۆر بۆی دەگریێت.

لەو سەردەمەدا، مەیدانی قۆشمە لە نێوان دوو شار یان دوو گەڕەک، بە یاریی شەقێن و سینی و زەرف، یان لە مـەیدانی شـەڕە شیـعـردا کـراوە. ئەگـەر شێخ ڕەزا زوبانی تیـژی کەرکووک بوو بێت، شوکریش زوبانی سولەیمانی بووە و هەردووک بۆ دەرخستنی هونەریان

لەسەر چۆک بۆ یەکتر دانیشتوون، ئەم پەتاخی سولەیمانی و ئەویش هینی کەرکووکی دەرخستووە. لە سمکۆلانی ئەم دوو ئەسپە ڕەسەنەی شیعردا، گەلێک لە پیاوانی ئەم دوو شارە بەرکەوتوون، بەڵام هەردوولا لە سووچی هونەرییەوە تەماشای ئەو شەڕە جنێوەیان کردووە. بۆ هەڵسەنگانی هونەرییان شاعیری ناسراو (پیرەمێرد) ئەکەنە حەکەم. پیرەمێرد ئەڵێت: هەردووکیان شاعیرن و هونەرمەندن ناتوانم یەکێکیان بەسەر ئەویتریان دا بدەم.

شێخ ڕەزا لە شیعرێکی کوردیدا هەجوی شوکری ئەکات و ئەڵێت:

شوکری لە داخی تۆ ئەمە ساڵێکە یا دووە
کێرم نەخۆشە حاڵی پەرێشانە کەوتووە
جارێ بپرسە موخلیسەکەت چۆنە چۆن نییە
مەحسوبە کۆنەکەت عەجەبا ماوە مردووە
کوشتەی فیراقی تۆیە عیلاجی ئەگەر نەکەی
ئۆباڵی بەو ملەت کە دەڵێی نێرکە کاردووە
عەمدەن ئەڵێم نەخۆشە، موراعاتی تۆ دەکەم
وەرنە دەمێکە ڕووحی بە جەننەت سپاردووە
گەرمین درۆ ئەکەم ئەوە دایکت بپرسە لێی
یایە بەدەستی خۆی کفن و دفنی کردووە
شانە و خەنە و حەمامی حەرام کردووە لە خۆی
پاش ڕەحمەتی، حەرامە لەمن، سوێندی خواردووە
ئێستەش کراسی چڵکنە ناو لنگی کوڵکنە
وەک دێوەلۆکە تووکی بەری بستێ هاتووە
یایە ئەگەر سەکرمە بە ژێر کورکەیا بچێ
هەروا دەزانێ لاقە مەلێکی پیا چووە
یایە کە مەعبەری دوبری و دەهلیزی کوزی
پەتاغی ئەشقیایە گوزەگاهی ئۆردووە
شیعرێ کە تۆ بەچاکی دەزانی شیاکەیە

بەزمێ بەیانی دەفەرمووی گەنوگووە
هەر وەک تسێ کە جەوهەری خۆی دەربخا بە با
نامووسی خۆی بە شیعری سەفیهانە بردووە
بەم شیعرە بێفەڕانەوە نابی بە (شێخ ڕەزا)
زەحمەت مەکێشە ئایینەکاری (ئەریستو)وە

شوکریش لە وەڵامدا بە شیعرێکی کوردی دەڵێت:

ڕیشالی کێری خۆم کە لە زینا ڕەتاندووە
سەرسمی داوە، کەوتووە، جەرگی پساندووە

شێخ ڕەزا ئەزانێت شێخانی سولەیمانی شوکری هان ئەدەن کە ئەم جنێوانەی پێ بدات و دەڵێت:

پوورە شوکری بەسیە با نەتگێم و شەممەت لەق نەکەم
دایکە کێر خۆرت هەواڵەی سووری سەر ئەبلەق نەکەم
نیەتم بوو دەفعەیێ خۆمت پیادەم باز وتم
نەقصە بۆ ئەمثالی من با گوو لەهەر ئەحمەق نەکەم
من کە شەهبازی شکارەندازی شاهیم پێ دەڵێن
حەیفە با ئاهەنگی جەنگی سەرگەڕ و لەقلەق نەکەم
تو بە جارێ وەک ژنی فاحیشە پێت لێ هەڵبڕی
نەء، وتم: خەیری نیە چاوێکی گەر لێ زەق نەکەم
حیزە سا خۆ بگرە تا بۆت بێمە مەیدانی مەساف
شەرت بێ هیچت پێ نەڵێم، تا بن گونت نەستەق نەکەم
کۆنە حیزی شاری بەغدا لێم حەرام بێ شاعیری
گەر کوزی خوشکت وەکو ئەیوانی کیسرا شەق نەکەم
هەر وەکوو (مەستی)م بە فەردێ گا، خوا ڕووحم بەرێ
مولحیدی کافر مەزەب گەر تۆیش بە ئەو مولحەق نەکەم
من دەزانم کێ لە خەشتەی بردووی ئەمما چ سوود

سەییدە، سەیید قسەی سووکی دەبێ دەرحەق نەکەم
پێی بڵێ با مونتەبیە بێ، تۆیش گەنوگوو بەس بخۆ
با سولەیمانیش بە جارێ کافری موتلەق نەکەم
عەهدە کردوومە لە خزمەت (شێخ ڕەزا)دا ورچە کوێر
نەیخەمە ناو لنگی دایکت تا لە تۆی ئێرەق نەکەم

شوکری لە شیعرێکی بەرگری لە سولەیمانیدا ئەڵێت:

گوو مەخۆ یا شێخ ئیتر با شۆڕشێ بەرپا نەکەم
خۆت و کەرکووکت بە جارێ سەر بەسەر ئیفنا نەکەم

شێخ ڕەزا لەمە بێ دەنگ نابێت و ئەڵێت:

عالەم و دونیا ئەزانێ شوکرییەکوێر خەرجی منە
شۆخ و شەنگە هەر وەکو ڕەققاص ئەڵێی موتلەق ژنە
دایکی حیزی خەلقی بەغدا، باوکی گەووادی سنە
وەک بەدیعەی بنت بکراوی بێ حەیا و بێ بنە

شوکری لە وەڵامدا دەڵێت:

لۆتی و ڕەققاص من نیم، نێرەگای پیرە بنە
ئەی لە گوڵچینی ژنت بەمەر بو نەدر دێدیوبەنە

شێخ ڕەزایش دەڵێت:

تۆیچ لێمان بووگی بە شاعیر ئەی حەرام زادەی سنە؟
بوچە شانێ ناخەفێنی مەسرەفی چەس ئەو تنە؟

شوکریش دەڵێت:

شاهم شیعری خۆت وەرگرە کەم دەماغ و سەرسەری
من ئەگەر زۆڵی سنەم تۆ پوشت و گەوواد و کەری

شوکری ئەگەر لەمەیدانی شیعری کوردیدا پەنجەی لەگەڵ شێخ ڕەزادا دابێت لەمەیدانی شیعری فارسیدا لەکێشی ئەودا نەبووە. شێخ ڕەزا لە شیعرێکی فارسیدا ئەڵێت:

صبا ز بنده که هستم تهمتن شعرا
ببر سلام به شکری که ای زن شعرا
گواهست زردی رویت بدان که حاملهای
ولی بگو زکدامین قلم زن شعرا

واتا:

ئەی بای صەبا، لە بەندەوە، کە ڕۆستەمی زاڵی ناوشاعیرانم
سەلامێ بەرە بۆ شوکری و پێی بڵێ: ئەی ژنی شاعیران
زەردیی ڕووت شایەتی ئەوەیە کە دوو گیانی
بەڵام پێم بڵێ لە کام گانکەری شاعیران دووگیانی؟

اگر ز نطفهء من بخشیدت خدا پسری
نهاده کن لقبش آهرین شعرا
عجب مدار که آن کودک بزرگ نژاد
به یک دوو هفته شود شیر او ژن شعرا

واتا:

ئەگەر خوا لەمن کوڕێکت پێ ببەخشێت
(شەیتانی شاعیران) بکە بە لەقەبی
لات سەیر نەبێ ئەو منالە ڕەگەز گەورەیە
لە یەک دوو هەفتەدا ببێ بە شێری تووڕەی ناو شاعیران

ترا به محکمی و سختی کمر نازم
که منهدم نشد از گرز صد من شعرا
سرت چو کفهء میزان فرونشسته بخاک
فراز مانده دوپایت بگردن شعرا

واتا:

بنازم بە پتەوی و ڕەقیی کەمەرت
کە بە گورزی صەد تەوریزی شاعیران نەڕووخا
سەرت وەک تای تەرازوو نیشتووەتە زەوی
هەردوو قاچیشت بە بەرزەوە بەسەر شانی شاعیرانەوەن

زخـــيـــــرهء نبــــود از هنر در انبـــــارت
بغـــيـــر خــوشـــه چينى زخــرمن شــعــرا
دهان كــيـــســهء كــونت نه آپخنان شـده چاك
كـــه الـتــيـــام پزيرد بســوزن شــعـــرا

واتا:

هيچ زەخيرەيەكى هونەر لە عەمارتا نييە
جگە لە گوڵە گەنمێ كە لە خەرمانى شاعيرانى كۆيكەيتەوە
دەمى توورەكەى قنگت وا يەكالا نەبووەتەوە،
كە بە سووژنى شاعيران بۆ دوورينەوە بشێ.

د و بارە حــــاملە ات مـــيكنم اگـــر نزنى
سليطه دست دخـــالت بدا من شـــعــــرا
به اتفـاق سـخن گـســتـران قـافــيــه سـبخ
ســر آمــدى چو (رضــا) نيــست در فن شــعــرا

واتا:

ئەگەر دەستى خۆ بەدەستەوەدان نەگرى بە داوێنى شاعيرانەوە
جارێكى تر زگت پڕ ئەكەمەوە هەى بێ شەرمى بێ نابڕوو
هەموو قسەكەرانى شيعردانەر لەسەر ئەوە يەك دەنگن
سەر بە دەرەوەيەى وەكو (ڕەزا) لەناو دەستەى شاعيراندا نييە.

شەڕە شيعرى شێخ ڕەزا و شوكرى هەر دووراو دوور نەبوو. زۆرجار لە سولەيمانى و بەغدا يەكتريان ديوە و بەبێ جنێو گفتوگۆيان كردووە. بەڵام هونەرى هەردوو شاعير لەمەدا بوو. دووريش نييە شاعيرى ناسراو جەميل صدقى زەهاوى لە هاندانى شوكرى دەستى بووبێت، لەبەرئەوە شێخ ڕەزا لە شيعرێكى كورديدا هەردووكيان جووت ئەكات.

پێم مـــەڵێن ئەم دوو ژنەت بۆچيـــــە ئەى شـــێخ ڕەزا
(شـوكرى) بۆ تەسك و تروسكى و (جەمـيل) بۆ زگ و زا

هەر لەسەر ئەم شەڕە شيعرە، شێخ ڕەزا جارجار ڕقى لە سولەيمانيش هەڵساوە و پلارێكى تێ گرتووە كە ئەڵێت:

هەر مـــەتاعێ كـــە تەڵەبكەى لە ســـولەيمانيـــدا

هەیە، ئیللا کــوزی بیکر و کــونی نامــســتــعــمل

ئەڵێتیش:

ســـولەیمانی هەتانە، ناوی نابەم، وەک کــونی بێــچــوو

وەکــو دانێی لەســەر بەرگی شــەقــایق جێ ســمنی ئاهوو

و ئەڵێتیش:

مـوسـوڵمـانان، مـوسـوڵمـانان، مـوسڵـمـانی موسڵـمـانی

هەتیــوێکم ئەوێ خــەلقی ســـولەیمانی ســـولەیمانی

کەچی لەلایەکی تریشەوە ئەڵێت:

مــوخــالەفــەم نیــیــە من ســەعــاتی مــیــقــاتم

غــولامی حــەڵقــە لە گــوێی جــەمــیــعی ســاداتم

بێ گومان شوکریش شاعیر بوو و پەنجەی لەگەڵ شێخ ڕەزادا ئەدا. بەڵام شێخ ڕەزا، وەکو شەڕە کەڵەشێر مەرجی بەزاندنی ئەکرد و ئەڵێت:

حــیــزێ ئەگــەر قــســە ببــەســتێ بە (ڕەزا)وە

بێ شـک بەحــــەلالـی لـە کـــــوزی دایکـی نەزاوە

بێ حـیکـمـەت و بێ قـیـمـەت و بێ جێ نیـیـە شیـعـری

عـــومـــری لە هەوەڵ تاکــو ئاخـــر تێـــدا ڕزاوە

شــوکــری گــەنوگــوو خــۆری ســولەیمانیــیــە بۆیەم

هەرچەندە کــە ئەمـــدی وەکـــوو لۆتی دەگــەڕاوە

لە هەجوێکی تریشدا ئەڵێت:

ســــویەری ئەهلی سنە بۆ شـــــەڕی بێگانە تنە

خــۆبەخــۆ شــەڕ دەکــەن و ئەسلەحــەیان هەر بە تنە

ڕقی هەڵســـا ســـینەیی دێ لە ســـولەیمانی ئەدا

ئافـــەرین ئەهلی سنە ئەم ڕەقـــەتان هەر لە کنە

ئەهلی ئێـمـە کـە چووە شـاری (سنە) حـوکـمـە ئەگێ

به دوو شـــاهی و قـــەرەپوولێ ژنی کـــامــــیـــان مـــەزنە

لە بەیتێکی تریشدا ئەڵێت:

گـــــەر لەنامــــووست نەترسی هـای وەتەنگی تنتـــەوە

وەخـتێ بۆ تەکـیـــە ئەچی دەس بگرە پشـــتی قنکتـەوە

لەم شیعرەیش بە دایکی شوکری ئەڵێت:

کــــــوزی (یایە) ئـەگـــــەزێ کـــێــــــر وەکــــو گـــــاز

بەری عــــەرصـــەی پانە وەکـــو دەشـــتی حــــیــــجــاز

قــــیــــتکەیێکی هەیە وەک گــــردی (دەمــــاوەند) ئەعـــلا

پڕ لە هێــــلانە کـــەو و قـــەشـــقــــەر و کـــۆتر و باز

هەروا لە بەیتێکی تریدا ئەڵێت:

خـورووی نامـری بەشـیـشی من تلیـشی ناوگـەڵی دایکت

بڵـێم چی صـەد هەزار لەعنەت لە خـۆت و شـیـری ناپاکت

***

**شێخ ڕەزا و میرانی بابان**

**میرنشینی چی بوو؟** میرنشینی بە جۆرێکی ڕەسمی، بە پێی یاسایەک کە غازان خانی ئیلخـانی لە سـاڵی ۱۳۰۳م دەریهـێنا دامـەزرا. ئەو مـیـرانە کـە دەسـتـەڵاتـیـان بەسـەر هەرێمێکی فراواندا هەبوو، بەرهەمی ئەو هەرێمەیان بۆ خۆو بۆ پێکهێنان و بەکارهێنانی هێزێکی سەربازی بۆ یارمەتیی حکومەت بەکار دەهێنا.

عـوسـمانیـیـەکـان کـە لە شەڕی (چالدران)دا بەسـەر صـەفـەوییـەکـاندا سـەرکـەوتن، بە پێـچەوانەی ئەوان کە مـیرەکـانی صـەفەویـیان بەسـەر کـوردسـتـاندا دەچەسـپـان، ئەمـان، میرەکانی کوردیان بەوە بەلای خۆدا ڕاکێشا کە ڕژێمی میرنشینی ئیلخانییان نوێ کردەوە و دایانەوە دەستی میرانی کورد.

لەمـەدا (شـەرەفنامـە) و (ئەولیـا چەلەبی) و (مـۆذن زادە) و (هامـەر) یەک دەگـرن کـە ڕژێمی مـیـرنشـینی لە کـوردسـتـاندا لە هەمـوو کـاروباری ناوەوە بە تەواوی سـەربـەخۆ بوو.

کوردستان بە پێی ڕێک کەوتنێک لە نێوان سولتانی عوسمانی و پێشەوای ئایینیی کورد مەولانا شێخ حەکیمووددین ئیدریسی بەدلیسی، دابەش کرایە (سنجق) و (میرنشینی)، یەکێک لە میرانی کورد سەنجەقی دەبردە ڕێوە و میرنشینی برێتی بوو لە چەند سەنجەقێک، میری میران سەرۆکایەتیی دەکرد.

شەرف خان لە (شەرەفنامە) باسی گەلێک لەو میرنشینانە ئەکات، وەکو میرنشینی (آمد = دیاربەکر) و میرنشینی هەکاری و میرنشینی بۆتان لە جزیرە و میرنشینی یا ئییالەی شارەزوور کەمەرکەزی شاری کەرکووک بوو و بە سەرۆکی میرانی بەبە (بابان) بوو... هتد.

شێخ ڕەزا، ڕێز و خۆشەویستییەکی بێ پایانی بەرامبەر میرانی بەبە هەبوو. ئەو ڕێزو خۆشەویستییە هەستێکی نیشتمانپەروەری و کوردپەروەرییەوە بوو چونکە میرنشینی ئەو سەردەمەی بابان، ڕۆناکییەکی گەش بوو لە کوردستانی خوارووادا. شێخ ڕەزا ئەم میرنشینەی بە ولاتێکی سەربەخۆی کوردستان و میرانی بابانیشی بە پێشەوا و پارێزەری ئەو ولاتە دادەنێت، بەلام لە پاش شکستی عوسمانییەکان لە شەڕی (ڤیەننا) و بلاوبوونەوەی سەرمایەداری و پێویستی بە ولات و بازاڕێکی یەکگرتوو وای کرد کە لە سەردەمی حوکمداریی سولتان مەحموودی دووەم دەولەتی عوسمانی دەست بکات بە سەرنگوم کردنی ئەو میرنشینانە و دەستەلاتی حکومەتی مەرکەزی بەسەر کوردستانیشا بگرێت.

شێخ ڕەزا لە شیعرێکی کوردیدا بیرەوەریی خۆی لەسەر شاری سولەیمانی کە پاتەختی میرنشینی بابان بوو دەلێت:

لە بیرم دێ سولەیمانی کە دارولمولکی بابان بوو
نە مەحکوومی عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو
لەبەر قاپیی سەرا صەفیان دەبەست شێخ و مەلا و زاهد
مەطافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو
لەبەر طابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا
صەدای موسیقا و نەقارە تا ئەیوانی کەیوان بوو
درێغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەصرە، ئەو ڕۆژە
کە مەیدانی جریت بازی؛ لە دەوری کانی ئاسکان بوو

لەو سەردەمەدا والیی بەغدا لەبەر یاخی بوونی هەندێ عەشایەری عەرەب دەستەلاتی بەسەر ویلایەتدا نە ئەما و بۆگەڕانەوەی دەستەلات، داوای یارمەتیی لەشکری بابانیان ئەکرد و بە هێزێکی کوردەکان دەستەلاتی حکومەتیان ئەگەڕانەوە.

بە زەربی حەملەیێ بەغدایی تەسخیر کرد و تێی هەڵدا
سلێمانی زەمان، راستت ئەوی، باوکی سولەیمان بوو*

* مەبەستی ئەوڕەحمان پاشای بابانە کە باوکی سلێمان پاشا بوو.

شێخ ڕەزا (سەلاحەددینی ئەیوبی)ی بە کوردی بابان دادەنێ، کەچی ئەو لە عەشیرەتی ڕاوەندی کورد بوو. بە پێی ئایینی ڕێز لە فەضلی عەرەب دەگرێت، بەڵام کوردێکی وەکو سەلاحەددین وولاتی ئیسلامی لە دەس (صەلیبی)یەکان ڕزگار کرد و بە سەربەرزی چووە ناو قودسەوە.

عەرەب ئینکاری فەضلی ئێوە ناکەم نەفضەلن ئەما
(سەلاحەددین) کە دونیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو
عموومی شەهریاران و سەلاطین و رمنگستان
لە روعب و سەطوەتی ئەو شێرەدا گشتی هەراسان بوو
قوبووری پڕ لە نووری ئالی بابان، پڕ لە ڕەحمەت بێ
کە بارانی کە فی ئیحسانیان وەک هەوری نیسان بوو

لەو دەورەشدا عەجەم و عوسمانی هەر بەکورد شەڕیان ئەکرد، تورک بە لەشکری بەبە و قاجارییەکانیش بە لەشکری ئەردەلان و بووەتە هۆی شکستی هەردوولا و دەستەلاتی دوژمنان بەسەر هەمموواندا.

کە (عەبدوللا پاشا) لەشکری والیی سنەی شڕ کرد
(ڕەزا) ئەو وەختە عومری پێنج و شەش طفلی دەبستان بوو

لە شیعرێکی تریدا کە باسی بەخشش و کەرەمی (ئالی بەبە) دەکات دەڵێت:

سائیل بە غینا نائیل ئەکا بەخششی کەمتان
ئالی (بەبە) یاخوا نەڕژێ دەستی کەرەمتان
هەر چەند بە مەثەل خەنجەری ئەلماسە زوبانم

نابڕێ سەری مووییێ لە ئەدای شوکری نیعمەتان
گیرفانی گەدای کردووەتە کانی جەواهیر
ئیکسیری نیشاری زەڕ و شاباشی درەمتان
ئێوەن بە حەقیقەت مەلیکی میللەتی کوردان
شایانی زیارەت بکرێ خاکی قەدەمتان
ئینکاری حوقووقیان لەسەر ئەم میللەتە ناکرێ
ئابای فەرەیدوون، فرو، جەمشیدی حەشەمتان

***

## ستایشی ئەحمەد پاشای بابان

شێخ ڕەزا لەگەڵ هەندێ لە میرانی بەبە دۆستایەتییەکی تایبەتی هەبوو. لەبەرئەوە هەندێ جار پەردەی ویقار لادەدات و لە مەیدانی رەخنە و گاڵتە و گەپدا، شتی وا بۆ خۆی دروست دەکات کە دۆستانی لە هیچ داوایەک درێغیی لێ نەکەن. لەم ستایشەدا، دوو شتی مەبەستە، یەکەمیان، حکومەتی عوسمانی، لە ژێر پاڵەپەستۆی حکومەتە بێگانەکانی ئەوروپا یاسایەکی دانا کە بێگانەیەک مافی ئەوەی هەیە نەک بە پێی یاسای سزادانی عوسمانی، بەڵکو، ئەگەر تاوانبار کرا، بەپێی یاسایەکی تایبەتی کە - قانوونی ئەغیار «قانون اغیار»یان پێ دەوت دەبێت. لێرەدا شێخ ڕەزا گاڵتە بەو یاسایە دەکات کە هەتا، هەتیوێکی حیزی بولغار ئەو مافەی هەیە کە یاسای عوسمانلی بەسەرا دانەنرێت:

چاکی کرد پەردەیی نامووسی دڕی وتی سیکتی بنی
ویرمەدی پارەسنی بویلەمی قانون ئەغیار؟*

* پارەکەی نەدا، ئایا وایە قانوونی بێگانە؟

دووەمیان: شێخ ڕەزا، لە دروست کردنی ئەم باسە دوور و درێژە بێ بایەخە، مەبەستی داوای یارمەتییە لە دۆستێکی زۆر گیان بە گیانی، وەکو ئەحمەد پاشا، ئەگینا کەس نییە شتی وای لێ بقەومێ و ئابڕووی خۆی لای مرۆڤێکی وەکو ئەحمەد پاشا بەرێت و بڵێت کارێکی ناپەسەندی وام کردووە، تو پارەکەم بۆ بدە!

ئەمە سێ ڕۆژە کە سەر گەشتەو و حەیران دەگەڕێم

کـێم هەیە غـەیری وەلی نیـعـمـەتی فـەرخـونده شـیـعـار

فەرموون لەگەڵ سەرجەمی شیعرەکەدا:

ڕۆژی یەک شـەممە کـە مـەشـهـووره بە ڕۆژی پازار
من بەغـار کـەوتمە دومـبـالی کـوڕێکی بولغـار
کـوڕ چە کـوڕ لێـوی وەکـو لالەیی خـەمـرا ڕەنگین
کـوڕ چە کـوڕ چاوی وەکـو نێـرگـسی شـەهلا بیـمـار
ئەهلی ئینـصـاف بەخـوا ڕەنگە چەنەی بشکێنێ
گـەر کـەسێ بێت و بکا قـامـەتی تەشـبـیـە بە چنار
لە هەمـووی صـەرفی نەزەر سـمت و سـورینێکی هەبوو
نازک و نەرم و لەتیف، مـیـشلی تەلای دەسـتـەوشـار
خـڕ و مـەخـرووط و مـودەووەر، سـپی یو نەرم و دونیم
هەر وەکـوو کـۆمـەڵە بەفـرێ کـە شـەقی کـەی بە مـشـار
کـە بەدیقـقـەت نەزەرم کـرده سـورین و کـەفـەڵی
هەردوو چاوم پەڕییـە تەوقی سـەرم وەک سـەگی هار
دامـەنم گـرت و وتم «مـەرحـەمـەت ایت الماسم»
*«بویله پاندرمـه بنی آتشی عـشـقن ایله زار»**
*چشم جـادوی سـیـاهت همـه بنداست و فـریب*
*همـه نازاست و گـریشـمـه همـه خـوابست و خـمـار*
*بنی صـیـد ایتـدی سنک دیدەئی آهو ڕەوشن*
*ئەی سنـک دیدەلرک آهـوەکی شـیـر شکـار*

** واتا:*
*دامەبینم گرت وتم: «مەرحەمەت کە ئەلماسم*
*وا من بە ئاگری عەشقتەوە مەسووتێنە*
*چاوی سیحربازی ڕەشت هەمووی کۆت و بەند و فریودەرە*
*هەمووی ئاگر و ناز و بەلاچاو ڕوانین و خەو و سەرخۆشییە*
*چاوی ڕۆشن (ئاهو)ی تۆ منی خستە داوەوە*

*ئەی ئەو چاوانەی تو کە شێر دەخاتە داوەوە.*

ســاعــەتێ چاک لە ســەر و ســوورەتی ئەحــسم فکری
پیــمی ووت: «گــیت ایشنە حــاجی بەبە یاغــمــەمی وار؟
صــاچمــە لاقــردیلرک حــاصلی یوق آقــچــە گــتــیــر،
(آقــچــەســزا) ایتــمــە ســاقن آرەزوی بوس و کنار»
من کــــە یەک پارەیێ جلقم لە ئەزەل شک نەدەبرد
پێم وت: «ایشــتــە کــەمــردە دولیــدر یوز دینار»
«بن بیــوک ذات شــریفم وکــلا خــواجــە ســیــم،
طانیــور بندەکــزی جــملە‌ء شــاە و خــونکار»
ئەلغــەرەز هێندە درۆم کــرد و فــســوونم بۆ خــوێند،
کــەوتە دووم هەر وەکــو دووی گــورگ ئەکــەوێ بەرخی هەژار
مــوختــەســەر خــۆشــە قســە، بردمــە مــەنزلگەهی خــۆم
گــرتم و خــســتم و لێم برد و گــونم کــرد بە چوار
مــۆڵەتم ســاتێ نەدا ئەو شــەوە تا وەختــی ســەحــەر
کــاری خــەیرم بە مــەزەندە گــوزەری کــرد لە هەزار
وەخــتی ســوبحــەینێ کــە داوێنی فــەلەک ئەتلەسی بوو
هەر لە جێ ڕاســتــەوە بوو، دامــەنی گــرتم وەکــو خــار
چنگی وەک پەنجــەیی شــاهێن لە یەقــەم قــایم کــرد
دەســـتی کـــردە جـــەزەع و ناڵــە و هاوار هاوار
زەفــتــیــە و ئەهلی مــەحــەللە هەمــوو جەم بوون لە سەرم
پرســیــان: (مــالخبــر)، ئەی زاهیــدی سالووس شــیــعار؟
پێم وتن لەم کــوڕە بولغــارە بپــرسن کــە لە من
چیی دەوێ، بۆچی دەناڵێنێ وەکــو هەوری بەهار؟
چاکی کــرد، پەردەیی نامــووسی دڕی وتی: «ســیکتی بنی
*ویرمــدی پارەسنی، بویلەمی قــانونی اغــیــار؟»*

*«دیدیلر حاجی افندی چوجوقک حقنی ویر،*
*سرکه فاش اولدی دەها فائده ایتمز إنکار»*
*«یوقیسه پارەن ئەگەر مهلتن اوچ گون اولسون،*
*حقنی اوچ گونەدک ویرملیسن ای غەددار»*

** واتا:*
*پارەکەی نەدا، وایە قانوونی بێگانە؟*
*وتیان حاجی ئەفەندی حەقی منداڵەکە بدە،*
*سرەکە ئاشکەرا بوو ئیتر بێکەڵکە ئینکار.*
*گەر پارەت نییە سێ ڕۆژت مۆڵەت دەدەینێ،*
*دەبێت حەقی لەم سێ ڕۆژەدا بدەیت ئەی غەددار.*

**ئەمە سێ ڕۆژە کە سەرگەشتەو و حەیران دەگەڕێم**
**کێم هەیە غەیری وەلییولنیعمەتی فەرخوندە شیعار**
**یەعنی هەم نامی نەبی حەزرەتی (ئەحمەد پاشا)**
**فەخری دین، کانی حەیا، بەحری کەرەم، کۆهی ویقار**
**مەدحی ئیحسانی بکەم، عیلمی بکەم، فەضلی بکەم،**
**بەخوا خاریجە ئەوصافی حەمیدەی لە شمار**
**کەفی زەڕ بەخشی کەوا مەنبەعی دوڕ و گوهەرە**
**میثلی بەحرێ کە نە ساحیلی بێت و نە کەنار**
**طەبعی جەوواد و کەریم هەر وەکو (قاآنی) دەڵێ**
**«زر بە قنطار همی بەخشد و أشتر بە قطار»***

** زێڕ بە هۆقە ئەبەخشێ و حوشتر بە قەتار*

**تا وەکو دەورە بکات و بگەڕێ چەرخ و فەلەک**
**تا وەکو دێت و دەچێ، بێت و بچێ لەیل و نەهار**
**بە مورادی بگەڕێ شەمس و قەمەر چەرخ و فەلەک**
**زەفەر و فەتحی قەرین، بەختی موعین، طالعی یار**
**ڕەئیی ئەو باعیسی تەنظیمی ئومووراتە، وەلێ**

بۆ کــورەی عــالەمی ئیــمکان بووەتە قــوطبی مــەدار

لە مەدحێکی ئەحمەد پاشای بەبەدا لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێت:

آصــفی جم صــفت و داور إقلیم گــشــا
صاحب سیف و قلم حضرت (أحمد پاشا)
در گــروە وکــلا، عــارف و دانا تر از او
هست؟ گفتم بخرد، گفت: نه کلا حاشا
دهر در طاعت او (یصــرفــه کــیف یرید)

واتا:

ئاسەفی جەمشید صیفەت و دادپەروەری وڵاتان داگیرکەر
خاوەنی شیر و قەڵەم حەزرەتی ئەحمەد پاشا
وتم بە پیاوی ژیر: لەناو دەستەی وەکیلاندا لەو زانا و داناتر هەیە؟
وتی: حاشا، نەخێر نییە.
گەردوون لە ژێر رکێفی ئەودایە، چۆنی ئارەزوو لێ بێ وەری ئەچەرخێنێ،
چەرخی دونیا لە ناوی مشتیدایە، هەرچۆنی بوێت وای لێ هەڵئەگێڕێتەوە.

لە ستایشێکی تری بۆ ئەحمەد پاشا، دووبارە ڕەخنە لە ڕەوشتی خۆی و مەدحی ئەو دەکات و دەڵێت:

هر چند زغم دامن تقــوی بکمــر بر
تسـبیح بکف گیــرم و مســواک به بربر
ناکــه کــفلی نرم تراز پنبــهء مــحلوج
برجســتــه ز دنبــال یکی ســاده پســربر
چون دیدم واز شــوق دلم در طیش آمــد
چون خــایهء حــلاج بـه زیر و بـه زبربر

واتا:

هەر چەنێ، داوێنی لە خواترسان ئەکەم بە بەری پشتێنەکەم داو
تەسبیح ئەگرم بەدەستەوە و سیواک ئەکەم بەرما،
کوتوپڕ کە کەفەڵێکی وەک لۆکەی شیکراو نەرم
لە دوایی کوڕێکی لووسی بێ تووکەوە ڕاست ئەبێتەوە،

کە لە سۆزدا دڵم کەوتە دڵە کوتە
وەک گونی هەلاج کەوتە سەر و خوار.

آبم ز دهان ریزد و جـــانم بلب آمـــد
صـــد آه جگر ســـوز برارم ز جگر بر
چون افـعی سـرمـازده از تابش خـورشـیـد
بازم زند احلیل پدر ســوختــه ســریر

واتا:

ئاو لە دەمم زا و ڕژا و رووحم هاتە سەرلێو
سەد آهی جگەر سووتێن لە دەرووغە هەڵئەکێشم
وەک ماری سەرما لێداو بکەوێتە بەر تاوی هەتاو
کێری صەگبابم دیسانەوە سەریم پیا ئەماڵێتەوە،

دو شنبـه بودم مـعـتـکف کنج عـبـادات
آهو کـــفلی آمـــد و زد حلقـــه بدر بر
برجـــســـتم و درباز نمودم چو مـــرا دید
از داعـــیـــهء ســـاده پرســـتی بخـبـر بر

واتا:

ڕۆژی دووشەممە لە کونجی عیبادەتدا گۆشەگیر بووم
کەفەڵ ئاسکێ هات و ئەڵقەی دەرگاکەی لێدا،
هەڵسام دەرگاکەم بۆ کردەوە کە دیمی،
لە خەیاڵی هەتیوبازی بە ئاگام

بر زد بمن از خـــشم یکی بانـگ بتــهــدید
بانـگی کـــه زند ظابط حــربی به نفـــربر
کی شـیخ ربانی تـو نه آن (شـیخ رضـائی)
کــز رندیی تو بودهء جــهـــانی بخطر بر
اکنون ســر تزویر فـروشــتــەی به عــمـدا
یعـنی برخ ســـاده حــــرام است نظر بر

واتا:
له ڕقان هاوارێکی توندی له ڕووما هه‌ڵبڕی،
وه‌ک هاواری ئه‌فسه‌ر که‌ به‌سه‌ر نه‌فه‌ردا ئه‌یکا، وتی:
ئه‌ی شێخی ڕیائی تۆ ئه‌و شێخ ڕه‌زایه‌ نیت
که‌ عاله‌مێ له‌ ڕه‌ندی و زیره‌کیی تو. له‌ مه‌ترسیدا بوو؟
که‌چی ئێستا سه‌ری ساخته‌ و فروفێڵت داخستووه‌ به‌ ئه‌نقه‌ست که‌ گۆیا حه‌رامه‌ سه‌یری ڕووی بێ تووک بکا!

وانگاه بمن عطف نظر کــرد کــه برخـــیــز
تیــری بهــدف برزن و تیـغی به سـپـــر بر
این گفت و یکی شیشهء منی از جیب بر آورد
زان می کـه شعـاعش زند آتش به حجـر بر

واتا:
ئه‌وجا لایه‌کی به‌ لاما کرده‌وه‌ واته‌ ڕاست به‌ره‌وه‌
تشیرێ به‌ نیشانه‌وه‌ بنێ و کێردێ به‌ قه‌ڵغانا بکه‌
ئه‌مه‌ی وت و شووشه‌یه‌ک شه‌رابی له‌ گیرفان ده‌رهێنا
له‌و جۆره‌ شه‌رابه‌ی تیشکی ئاگر له‌ به‌رد به‌ر ئه‌دا

جـام دوســه پیــمــود زتاب می صــهــبـا
آویخت بسی خــوشــهء پروین به قــمــربر
ســودی نکند مــوعظه و ذکــر در آنجــا
کـز شـوق فـتـد رعـشـه بر اعـضـای ذکـر بر

واتا:
دوو سێ پیاڵه‌ی پێوا له‌ شه‌رابی سووری بێ گه‌رد
گه‌لێ هێشووی ئه‌ستێره‌ی به‌ مانگدا هه‌ڵواسی
په‌ند و ئامۆژگاری سوودێکی نابێ له‌ شوێنێکا
ئه‌ندامی نێرینه‌ له‌ سۆزدا هه‌موو بکه‌ونه‌ له‌رزین

افــتـــاد نگاهم چو بدان ســـاق نگارین
پیــچـیــده دوســاقم زهوس یک بدگــربر
در عــرصــهء اعــمــال نهــالی بنشــاندم

شـاخش بقــمـر بر شـد و بيــخش بسـقـر بر

واتا:

که چاوم بەو لاقە شیرین وێنەییە کەوت

لەبەر ئارەزوو هەردوو لاقم لەیەک ئاڵان

لە مەیدانی کاردا نەمامێکم ناشت

لقی ئەگەیشتە مانگ و ڕیشەی ئەگەیشتە دۆزەخ

هوشــدار (رضــا) هرزه مـگو زانـکه بد آيد

بر طبع ولی نعــمت فــرخنده ســيــربر

(احـمـد) لقب آن والی جم جـاه کـه باشـد

صـد رتبـه ز جـمـشـيـد به اصـل و به گـهر بر

واتا:

ئاگات لە خۆت بێ (ڕەزا)، قسەی پووچ مەکە، چونکە ناخۆشە لای

تەبیعەتی وەلی نیعمەتی ڕەوشت پیرۆزی خۆت

ئەوەی نازناوی (ئەحمەد)ە و، والییەکە شکۆی وەک هی جەمشیدەو

سەد پلە لە جەمشید بە ئەسڵ و بەڕەسەن لە پێشترە

طهـمورثو هوشنگ و کـيومـرث و سيـامک

جــمــشـــيــد کند فــخــر بدين چار پدر بر

نســبت نتــوان کـرد بدين جـمله، مـعـدود

آبا، کــرامش کــه نيــايد به شــمــر بر

واتا:

تەهموورس و هۆشەنگ و کەیوومەرس و سیامەک و

جەمشید شانازی بەم چوار باوکەوە ئەکا

بەراوردیان ناکرێ لەگەڵ ئەم کۆمەڵە هەڵژمێرراوە

باوک و باپیری بەخشندەی ئەو کە لە ژمارە نایەن

پێوەندی شێخ ڕەزا تەنها لەگەڵ ئەحمەد پاشادا نەبووە، پێوەندییەکی زۆریشی لەگەڵ حەمدی پاشادا بووە و لەم شیعرە فارسییەیدا مەدحی دەکات:

ورق از شــهــپــر جــبــريل خــواهد کلک إنشــارا

کـه در هرنامـه نتـوان برد نام (حـمـدی پاشـارا)

وجـود (مـعن) را (زائد) شـمـارد مـشـرب جـودش

ز (حـاتم) عـارش آید فـضله خـواند فـضل یحـیـارا

واتا:

قەڵەمی دانانی شیعری کاغەزی لە شاپەڕی جبرەئیل ئەوێ

چونکە ناتوانرێ لە هەموو نامەیەکدا ناوی (حەمدی پاشا) ببرێ.

ڕەوشتی بەخششی ئەو بوونی (مەعنی کوڕی زائدە) بە زیادە دائەنێ

قاری لە حاتەمی طەی دێتەوە، فەضلی یەحیای بەرمەکی بە فەزڵە پاش خوانی دابنێ.

بتـبریک قـدومش جـان فـشـانم گر نیـفـشـانم

ز شـرم کم بـهـای آسـمـان عـقـد ثریا را

تلی باید زدن لیکن ز نقـدم دست کـونه بود

خجالت میدهد پیوێسته این دست تهی مارا

واتا:

گیانم لە پیرۆزبایی هاتنیا دائەنێم، ئەگەر

لە شەرمی بێ نرخیدا ملوانکەی ئەستێرەکانی سورەییای ئاسمانی دابەش نەکەم

پێویست بوو تەلگرافێ لێ بدەم بۆ بەخێر هاتنت، بەڵام پارەم لە دەستا نەبوو

ئەم دەس کورتییەی ئێمە هەمیشە شەرمەزاریان بەسەردا ئەهێنێ

کـجـاشـد بامنش آن مـهـربانیـهـا نمیـدا نم

خطایی رفت یا از قطره إسـتـغناست دریارا

ســـبب اینـست یازره پروردن برفت از یاد

ز طالع نحـسی من آفـتـاب عـالم آرارا

واتا:

ئەو گشتە میهرەبانییەی لەگەڵ من چی بەسەرهات؟ نازانم

هەڵەیەک ڕووی داوە، یان دەریا پێویستی بە دڵۆپە بارانێ نییە

هۆکەی ئەمەیە، یاخود لە سیاچارەیی و بێ تاڵعیی من

خۆری عالەم ڕۆشن کەرەوە پەروەردەکردنی تۆزی لەیادچووە

چنان داند کـه بالی پشـه ء بخـشـد اگـر بخـشـد

بکمـــتـــر بندهء از بندگـــانش ملک کـــســـرارا
گر این دست و کرم دیدی نـگفت ای (رضـا) حـافظ
«بخــال هندوش بخـــشم ســـمــرقند و بخــارارا»

واتا:

وائەزانێ باڵی مێشوولەیەکی بەخشیوە ئەگەر بێتو
موڵکی کیسرا ببەخشێ بەیەکێ لە کەمترین بەندەکانی
ئەگەر حافزی شیرازی ئەم دەست و کەرەمەی ئەوی بدیایە، ڕەزا، نەیئەوت:
«سەمەرقەند و بوخارا بە خاڵی ڕەشی ئەو ئەبەخشم».

شێخ ڕەزا لە شەترەنجێندا دەستێکی باڵای هەبوو. خۆی باسی وەستایی خۆی لەم شیعرە فارسییەدا ئەکات و ئەڵێت:

عـــیـــراق و پارس و تبـــریز و صـــفـــهـــان
بـخـــــــــارا و خـطـاء و بـلـخ و بـاگـنـج
نبـــاشـــد چون (رضـــا) شـطرنج بازی
نـــه در تـــرک و نـــه در روم و نـــه‌در زنج

واتا:

عێراق و فارس و تەبرێز و ئەسفەهان
بوخارا و خەتا و بەڵخ لەگەڵ گەنج
شەترەنج بازێکی وەک ڕەزا نییە
نە لە تورک و نە لەناو ڕووم نە لە ناو زنجا

***

### سوپاس بۆ مستەفا زیهنی پاشای بابان

مستەفا زیهنی پاشای بابان تاخمێکی شەترەنجی جوان بەدیاری دەنێرێت بۆ شێخ ڕەزا. شێخیش لەم شیعرە فارسییەدا سوپاسی دەکات کە دەڵێت:

نـامــــه کـــز یار مــــهـــربان بـاشـــد
مـــــایهء عـــیش جـــاویدان بـاشـــد
کـــــافـــــرم گـــــر پیـــــام یـار چنین

کـــمـــتـــر از وحی آســـمـــان باشـــد
جـــان کنم بذل نـامـــهء کـــه دران
نام آن مـــیـــر عـــالیـــشـــان باشـــد
مـــصطفی بگ کـــه کلک مـــشکینش
همـــچـــو طوطی شکر فـــشـــان باشـــد

واتا:

نامه ئەگەر لە یاری میهربانەوە بێ
مایەی ژیانی جاویدان ئەبێ
کافرم، گەر پەیامی یارێکی وا
لە سرووشی ئاسمان لام کەمتر بێ
گیان بە قوربانی نامەیەک ئەکەم کەوا
ناوی ئەو میرە پایە بڵندەی تێدابێ
مستەفا بەگ کە قەڵەمی وەکو میسک
خۆشی وەکو و تووتی شکر بلاوئەکاتەوە.

شـــــاه بـاز بـلـنـد تـدبـیـــــــرش
طـائـر اوج کـن فـکـان بـاشـــــــــد
عـــزم ا و در مـــشـــیـــمـــهء تقـــدیر
باقـــضـــا طفل توأمـــان باشـــد
قـــــدر او در مـکـان نمـیـگـنـجـــــد
مـــرســـرا پرده لا مکان باشـــد
وصـف مـــاهـیـــتش تـوانم گـــفـت
گـرمـــه و مـــهـــر جـــسم و جـــان باشـــد

واتا:

شابازی بەرزی ڕا و تەدبیری
باڵداری پێژەی (ببە و بوو)یە
عەزمی ئەو لە منداڵدانی قەدردا
لەگەڵ قەزا و قەدەردا مناڵی دوانەن

قەدر ئەو لە جێگادا جێی نابێتەوە
مەگەر جێگاکە پەردە سەری لامەکان بێ
ئەتوانم وەسفی ماهییەتی بکەم
ئەگەر مانگ و خۆر لەش و گیان بێ

در قـــيـــافـت جـــوان بـدانـش پـيـــر
طرفـــه پـيـــري کـــه نوجـــوان باشـــد
دامنـی هـمـــــتش بـر افـــشــــانـد
آن چەدر جـــيـب بـحـــروکـــان باشـــد
بيـــەست فـــخـــر کـــيـــانيـــان چون جم
بلکه فـــخـــر جـــهـــانيـــان باشـــد
ای ســـفـــر کـــردەء کـــه فـــتح و ظفـــر
در رکـــــاب تـو هـم عنـان بـاشــــد

واتا:

بە قیافەت گەنجە، بە وێڵ و کەماڵ پیرە
پیرێکی نوێ کە جوانێکی نوێ بێ
داوێنەی هیممەتی، هەرچی لە باخەڵی
دەریا و کانا هەمووی هەڵئەرێژێ
وەک جمشید نییە مایەی شانازی تەنها
بەڵکو مایەی شانازیی هەموو خەڵکی دنیایە
ئەی ئەو سەفەر کردووەی کە فەتح و سەرکەوتن
هەمیشە هاو ئاوزەنگیی ڕکێفی تۆیە.

ســــفـــــرت بـه ازان کـــــه در ثـمـين
تـا بـه دريـا بـود نـهـــــان بـاشــــد
دســت در گـــــــــــردن هـدف نـکـنـد
تيـــر تاهـمـــــدم کـــمـــــان باشـــد
شـــــاعـــــــر تـرا بـريـده بـاد زبـان
گـــرنـه مـــــدح تو بـرزبـان بـاشـــد

چه تفـــاوت مـــيـــان ناز كنند

طبع چون ســـركش و روان باشـــد

واتا:

سەفەرت چاکترە چونکە دووڕی گرانبەها

تا لە دەریا دا بێ دەرناکەوێ

تییر تا هاودەمی کەوان بێ دەست

ناکاتە ملی نیشان و ناپێکێ.

یاخوا زبانی شاعیرەکەت بە بڕین چێ

ئەگەر تاریفی تۆی بەسەر زمانەوە نەبێ

در لغت (گـــرد) مـــردرا گـــويند

گـــر زبر دست پـهلوان بـاشـــد

مـن نـگـويم چو شـــاعـــران ديـگـر

كـــه چـنين باد يـا چنان بـاشـــد

از دعـــايـت همين قـــدر گـــويم

كـــه انچـــه خـــواهد دلت همـــان باشـــد

هديه آترا بجـــان قـــبـــول كنم

گـــرچه يـک ريزه اســـتـــخـــوان باشـــد

قـــدري شـــعـــر گـــران بـهـــاي (رضـــا)

داند آنكس كـــه نكتـــه‌دان باشـــد

واتا:

لە فەرهەنگدا (گورد) بەواتای مەردە

ئەگەر پاڵەوان و دەست لەسەرەوە بێ

من وەکو شاعیرانی تر ناڵێم کەوابێ و وابێ

بۆ دوعای خێر بۆ تۆ هەر ئەوەندە ئەڵێم

دڵت چیی دەوێ یاخوا وابێ

دیارییەکەت بەگیان قەبووڵ ئەکەم

تەنانەت ئەگەر وردە ئێسقانیش بێ

قەدری شیعری گرانبەهای (ڕەزا)

ئەو کەسە ئەیزانێ کە لە قسەی ورد تێ بگا.

***

## نامەیەکی سەرخۆشی بۆ مستەفا زیهنی پاشای بابان

مستەفا زیهنی پاشای بابان موتەسەڕیفی کەربەلا بوو و دۆستایەتیی لەگەڵ شێخ ڕەزادا هەبوو. شێخ ڕەزا بەم شیعرە فارسییە، بەبۆنەی مردنی برای، سەرخۆشیی لێ ئەکات:

لقد اصیب حبیب القلب وا أسفا

وصار صدر سماء المجد منخسفا

دلم بسوخت ز ناوعده مرگ قادر بگ

برادرت (غفر الله ذنبه و عفا)

واتا:

داخەکەم خۆشەویستەکەی دڵم گرفتار بووە

سینەیی ئاسمانی شکۆ ڕۆچووە

دڵم سووتا لەبەر مەرگی ناوەختی قادر بەگ

برات خوا لێی ببوورێت و لە گوناهی خۆش بێت

چو دید تازه نهالی کشید سر بفلک

زمانه ازین و بیخش بر آورد بجفا

بفضل و رحمت خود ایزدش بیامرزد

که اهل جود و خداوند عض و بود وفا

واتا:

گەردوون کە دیتی نەمامێکی تازە هەڵچو و سەری گەیاندووەتە ئاسمان

بە ناڕەحەتی لە ڕەگ و ڕیشەوو دەری هێنا

خوا بە ڕەحمەت و گەورەیی خۆی بیبەخشێ

چونکە دەسکراوە و بەخشندە و بە وەفا و لێبوردوو بوو

توبی جهت متصرف نیامدی بزمین

بکربلا که خداوند (زادها شرفا)

چو یاد آوری از وقعهء امام حسین

چگونه شمر لعینش برید سر ز قفا

واتا:

تو له خۆڕایی نەبووی بە موتەسەڕیفی ولاتی

کەربەلا، خوا پایە بەرزتری کا

کە لە ڕووداوەکەی حەزرەتی حوسێنەوە بیرت نەکەوتێتەوە

چۆن شمری لەعنەتی سەری لە پشت ملییەوە بڕی

کنی بحال جوانان اهل و بیت نظر

(لسهم حاسدهم کیف اصبحوا هدفا)

جماعتی نگری سر برهنه سینه زنان

بمرگ تشنه چو بیمار محتضر بشفا

واتا:

تەماشای حاڵی لاوانی ئەهلو بەیت نەکەی، نەبینی

چۆن بوون بە نیشانەی تیری ئەوانەی بەغیلییان پێ ئەبەن

سەیری کۆمەڵێ نەکەی بە سەری قوتی سنگ ئەکوتن

تینووی مەرگن وەکو بیماریێ کاتی گیان دان تینووی چاک بوونەوەیە.

وفات باب و برادر و ز یاد مبری

در آن مصیبت سادات و مأتم شرفا

هزار لعن بارواح قاتلان حسین

ولی چو شیعه مرو تا صحابه و خلفا

واتا:

مەرگی باوک و برات لە یاد ئەباتەوە

ئەم موسیبەتەی بەسەر ساداتدا هاتووەو ئەم مەنتەم و تەغرییەیە

هەزار لەعنەت لە گیانی ئەوانەی حوسێنیان کوشت.

بەڵام وەک شیعە ئەوەندە مەڕۆ ئەسحابە و خەلیفەکانیش بگرێتەوە

نه اعتماد بر افراط کن، نه بر تفریط

میانه جو که همین است مذهب عرفا

زمان عمر تو ممدود باد و درگزرد

بجاه و دولت واقبال و عیش و ذوق و صفا
همیشه تا بهوای (رضا)ی حق حجاج
گهی بمروه تکا پو کنند و گه بصفا

واتا:

نه پشت به زۆر ڕۆشتن ببەستە و نە بەکەم ڕۆیشتن
ناوەندی بگرە چونکە ڕێبازی خواناسان ئەمەیە
تەمەنت درێژ بێت و بە سەرچێت هەمیشە
بە پایە و دەوڵەت و شکۆ و ژیانی خۆش و ڕابواردن
بۆ ئەوەی حاجییان لە هەوای ڕەزامەندیی خوا
تاوێ لە (مەروە) بکەونە ڕاکردن و ناوێ لە (صەفا)

***

## مەدحی مەجید پاشای بابان

مەجید پاشای بابان قائیمەقامی قەزای کفری بوو کە کفریش بەشێک بوو لە میرنشینی میرانی بەبە. لەم شیعرە تورکییەدا. شێخ ڕەزا باسی شارستانیی ڕاستەقینە ئەکات کە بریتییە لە کردەوە و ڕەوشتی چاک لە مرۆڤدا و دەڵێت:

مدنیت ایکنجی عنقادر
او دخی اسم بی مسمادر
مدنیت مکارم اخلاق
بذل و احسان و فضل و تقوادر
معرفت گر سقل اوزاتمق ایسه
بز اخفش حکیم و دانا در
سر و دستاردن عبارت ایسه
جحش قاضی ده (ابن سینا) در

واتا:

شارستانی مەلی (عەنقا)ی دووەمە
ئەویش ناوێکە لە هیچ نەنراوە

شارستانی جوانیی ڕەوشت و
دەس کراوەیی و چاکە کردن و خواپەرستییە
زانست ئەگەر بە ڕیش درێژکردن بێ
بزنی (ئەخفەش)یش حەکیمی دانایە
گەر عیبارەت بێ لە مێزەر و سەر و کەللە
کەری قازیش (ئیبنی سینا)یە

صــــورت مـــادەدن کنایت ایســـه
آدم وابلیس، حــــیــــه و حــــوادر
گر عبـادت حجـازه کیـتـمک ایسه
خـــر صـــــوفی ده حـــاجی بابادر
حـــسنی اوصـــافی اولمیـــان آدم
شکـل آدمـــــده بـر مـــــقـــــوادر
شـخص کـامل اگـر بولونسـه بوگـون
مــرحــمــتلو مــجــیــد پاشــا در

واتا:

ئەگەر کیفایەت بێ لە شێوەی مادە
ئادەم و ئیبلیس، مار و حەوایە
ئەگەر ئەوە بێت کە بچیتە حجاز
کەری سۆفیش باوە حاجییە
ئەو مرۆڤەی صیفاتی جوانی نەبێت
مقەووایە کە لە شێوەی مرۆڤ دروست کرابێ
ئەگەر مرۆڤی تەواو هەبێت ئیمڕۆ
خاوەن بەخشش مەجید پاشایە

دودمـــــــــــان مـلـوک بـابـانـک
قـــالمه برشـــمس عـــالم آرادر
دست گـــوهر فـشـانی غـبطه ءکـان
کف احـــســــانی رشـک دیـاردر

دەستی اول دەستە بکزە مز کە دیدم
حلی مـــشکل اولان مــــعـــمـــادر
منت ایتـمـز جـهـانی ایتـسـە نـثـار
هـمـــــتی تا او رتبــــــە بـالادر

واتا:

لە خانەدانی میرانی بابان ماوەوەی
خۆرێکی جیهان ئارایە
دستی گەوهەر بڵاوکەرەوەی خۆشییەکان
دەستی بەخششی شەپۆلی دریایە
دەستی وەک ئەو دەستە نییە کە وتم
ئەوەی گرفتی هەبێ کردنەوەی ئاسانە
مننەت ناکا گەر جیهان دابەش بکات
هیمەتی تا ئەو ڕادەیە بەرزە

شــیــعــره قــارشی اقل جـائزەسی
یـا اوتـوز یـا ایـگـرمـی لـیـــــرادر
جـیـبـە گـیـرمـر مـحـاسن شـیـمـی
مــــاه تـابـان گـــــبی هـویـدا در
وعــــدەء جـــود حـــاتمانە لری
رســــتــــــە انـتـظار فــــردا در

واتا:

بەرامبەر شیعر کەمترین بەخششی
یا سی یا بیست لیرەیە
ڕەووشتی جوانی ون نابێ لە گیرفاندا
وەکوو مانگی تابان ئاشکەرایە
بەڵێنی جوودی حاتەمانەی
چاوەڕێی تەنها یەک ڕۆژە
ئیکرامی منعمانەی بۆ ئێمە
هەر لە کۆنەوە پیشەی باپیرانییەتی

دولتی وقف ثروتی مـــبـــذول

نعـــمـــتی ســائلینه یغـــمـــادر

ســاحـــهء مــدحنی مـســاحــه ایدن

کلک تحـــریر هرزه پیـــمــــادر

جــاه و اقـــبــال و عـــزتک برجــا

ول تـا کـــــائنات برجـــــادر

داورا همـــــتک دریغ ایتـــمـــز

مـقـصـدک گـر (رضـا)ی مـولادر

واتا:

موڵکی وەقف سامانی بۆ خەلق بەخشراوە

نیعمەتی بۆ داواکەران تالاّنییە

ئەوەی ساحەی مەودحی بپێوێ

خامەی نووسین زۆرپێژی نووسینە

جاە و ئیقبال و عزەتی بەرزتان

بەردەوام تاکو ئەستێرەکانی کائنات بەردەوامە

ئەی دادگەر هیمەتتان درێغی ناکات

ئەگەر مەقصەدتان (ڕەزا) مەولایە

وا دیارە شێخ ڕەزا هەجوێکی یەکێکی لە بابانەکان کردووە، بەڵام لە پەشیمانیدا دەڵێت:

جـــەوهەری مـــەحـــزە لە هەردوولاوە وەک تیـــغی دەبان

داک کـــچی پاشـــای ڕەواندز، باب کـــوڕی پاشـــای بەبان

«شـێخ ڕەزاش» هەجـوی بکا باز ئیـعـتـیـباری بۆ نیـیـە

چاک خـراپ نابێ بە شـیـعـری شاعـیـرێکی قـەڵتـەبان

***

### مەدحی عەباس ئاغای پشدەر

شێخ ڕەزا پێوەندییەکی فراوانی لەگەڵ پیاوە ناسراوەکانی ئێلانی کورد هەبوو. ئەوانیش

بۆ پتەوکردنی ئەو پێوەندییە، لە هەموو دەرفەتێکدا، بەدیارییەکی موناسب ئەو دۆستایەتییەیان نوێ دەکردەوە. لەو دۆستانەی شێخ ڕەزا سەرەک عەشیرەتانی ئاکۆ و بلباس و پشدەر و لەم شیعرە فارسییەدا، شێخ ڕەزا سوپاسی سەرداری ئێلی پشدەر دەکات بۆ ئەو دیارییەی بۆی ناردووە.

غرض از هدیه نه (در است) و (عقیق) و (الماس)
غرض الفت بود و دوستی و استئناس
هدیه از جانب جانانه گر زهر بود
خوشتر آید بمن از (فیه شفاء للناس)

واتا:

مەبەست لە دیاری دوڕ و ئاقیق و ئەڵماس نییە
مەبەست هۆگری یەک بوون و دۆستایەتییە
دیاری لای دۆستەوە ئەگەر ژاریش بێ
لای من لە هەنگوین خۆشترە کە خوا لەبارەیەوە فەرموویەتی: دەرمانی دەردی خەڵکی تیایە.

هدیەئی آمده از دوست یکی پوست پنیر
پوست مونین چو سر و صورتی آغا عباس
بامداد ان چو فرستادەء از جانب میر
عسل رانیه اورد و پنیر بلباس

واتا:

دیارییەکەم لە دۆستێکەوە بۆ هاتووە: پێستە پەنیرێکە
پیستە پەنیرێکی مووداوی وەک سەر و سوورەتی عەباس ئاغا
کە سبەینانێ نێرراوێ لەلایەن میرەوە
هەنگوینی ڕانیە و پەنیری بلباسی هێنا

گفتم آری چو مرا دید جگر خستەء هجر
عسلم کرد روان میر مسیحا انفاس
باز گفتم بچها ماش و نخود میطلبند
نکند شهد و عسل چارەء درد افلاس

واتا:

وتم: بەڵێ کەمنی دی جگەرم زاماری دوورییە

میری هەناسە وەک مەسیح (نەخۆش چاک کەرەوە) هەنگوینی بۆ ناردم (کە دەرمانی دەردە)

دیسان وتم: مناڵەکان ماش و نۆکیان ئەوێ

هەنگوین چاری دەردی لاتی ناکا

شکر نعـــمت کنمت بندهء احـــســـان توم

نیک ناسم نه چو (مـــخـــمـــور افندی) نسناس

من به غـــیـــر از تو کـــســیـــرا نشناسم مـــخـدوم

تو جـــز این بندهء خــود نیــز کـــســیـــرا مـــشناس

واتا:

سوپاسی نیعمەت ئەکەم، بەندەی چاکەی تۆم،

چاکەناسم، وەک مەخموور ئەفەندیی مەیموون نیم،

من لە تۆ بەولاوە کەسێکی تر ناناسم شایانی خزمەت کردن بێ،

دەسا تۆیش لەمن بەولاوە کەس بە بەندەی خۆت مەزانە.

من کـــه در بوتهء اخـــلاصی تو بگداختـــه اَم

بکســـان دیگرم مـــینتـــوان کـــرد قـــیـــاس

من چو مـــخـــمـــور نه اَز جـــملهء او باشـــانم

کـــافنگند بر ســر یک پای دوصـــد مـــهـــره بطاس

واتا:

من کە لە تەنووری دڵسۆزی بۆ تۆدا تواومەتەوە،

ناتوانرێ بەراوردم لەگەڵ کەسانی تر بکرێ

من وەک (مەخموور) لە ڕیزی هەتیو و مەتیودا نیم

کە لەسەر یەک پێ دوو سەد داش ئەخاتە ناو تاسەوە

منم آن شـــاعـــر نادر شـــخن و نـــادر گـــو

کـــه بهـــر شـعـــر کنم تعـبـیــه صـــد گـــونه جناس

آن شکم کنده و لـب گـنده جـناب سـکیـــویـر

نیـــست اَز صـــحـــبـت او فـــائده جـــز وســـواس

واتا:

من ئەو شاعیرە قسە نایابە، نایاب وێژەم
کە لە هەر بەیتێکا سەد جۆرە (جیناس) کۆئەکەمەوە
ئەو جەنابی(......) ورگ گەنیوی دەم و لێو گەنیوە
لە وەسوەسە بەولاوە سوودێ لە هاوڕێیەتی کردنیا نییە

بهـــمـــه مـــردم (رانیـــه) ســـلامی زمن است
جـــــــزبـه (ابـراهـیـم افـنـدی) پـدری الخنـاس
ســینەو و گــردن و پشت و شکم و ســاق و ســرین
گند و ناپاک و گـــوه آلود، ســـراپا انجـــاس

واتا:

سلاو لەمنەوە بۆ هەموو خەڵکی ڕانیە
تەنها بۆ برایم ئەفەندیی باوکی ئەلخەنناس نەبێ
کە سنگ و مل و پشت و سک و ساق و کەفەڵی
هەموو گەنیو و پیس و گواوییە و سەر تا پێی پیسییە

قـــاضـــیم نیـــز نپـــرســـد مگر از یادش رفت
خـــورش از کـــشـک دوســـه ســـاله پوشش ز پلاس
فـــررا گـــر کـــســـوت زربفت بپـــوشند پشم است
گـــوز بر ریش چنین قـــاضـی پشـــمـــینه لبـــاس

واتا:

قازییش هەواڵم ناپرسێ. بۆچی لە یادی چووەتەوە کە
خۆراکی کەشکی دوو-سێ ساڵە و بەرگی پەڵاس بوو؟!
کەر ئەگەر بەرگی لە تاڵی زێڕ چنراوایش لە بەرکا هەر خورییە لە بەریا
تڕ بە ڕیشی قازیدا کە بەرگی خوریی لەبەرایە

جـــاسم آغـــا کـــه دخـــانی نفـــرســـتـــاده مـــرا
به تـو بخـشـــیـدمش ای داور جـمـشـیـد أسـاس
یوقـــســـه، نامـــوسنی بن بیـــز گـــبی یرتردم
قـــاچرردم آنی تا مملکت مـــوش و ســـیـــواس

شکر ناس ار نکنم شکر خـــــدارا نکنم
تو ولی النعـــمی من کنمت شکر و ســپـــاس

واتا:

جاسم ئاغا کە دووکەڵێکی (واتە هەندێ تووتنی) نەنارد بۆ من
وا بە تۆم بەخشی ئەی داوەری بنەما جەمشیدی
وەیا ناموسی وەکو بێز دەدڕم
ڕاوم دنا تاکو مەملەکەتی مووش و سیواس
سوپاسی خەڵک ئەگەر نەکەم سوپاسی خودا ناکەم
تۆ نیعمەت بەخشی منی و منیش سوپاست ئەکەم

***

## تاڵان کردنی عەشیرەتی ئاکۆیان

عەشیرەتی ئاکۆ لە هەرێمی سەر سنووری عیراق و ئێران جێنشین بوون ئەم عەشیرەتانە، ئەوەندە ملیان بە حکومەتی عوسمانی نەدەدا و لەشکری عوسمانیش نەیدەتوانی کارێکی وا بکات سەر بەم عەشیرەتانە شۆڕ بکات. وەکو دەڵێن: «سەگ بە زەبری کلکی ئێسقان دەشکێنێت»، هانی تەقیەددین و عومەر پاشای دیاربەکریان دا و بە لەشکرێکی گەورەوە دایانە سەر عەشیرەتی ئاکۆیان و تاڵانیان کرد و ئاگریان لە دێهاتەکانیان بەردا و مراد ئاغای حارس ئاغا و موحەمەد ئاغای عەبدوڵلا ئاغایان گرت و حەپسیان کردن. مراد ئاغا لە بەندیخانەی کەرکووک مرد. شێخ ڕەزا بەرامبەر ئەم کردەوە ناپەسەند و دڕندانە بەرامبەر خانەدانی ئاکۆیان دەڵێت:

ڕوخـاندی گـەردشی گـەردوون لەهەر جێ ئاسـتـانێ بوو
سـووتاندی چەرخی دون پەروەر لەهەر کـوێ ئاشـیـانێ بوو
وەکـو طەییی (سِـجِلْ لِلْکُتُبِ) پێـچـایەوە گـەردوون
لەهەر مـیـهـمـانسـەرا ئاسـاری سفـرە و نان و خوانێ بوو
بە حـاتەم گـەر بکەی تەشبـیـهی ئەم ئاغـایە، بێ عـەقـڵی
کـە فـەرقی ئەم لەگـەڵ ئەو، ئاسـمـان و ڕێسـمـانێ بوو
دریغ بۆ خـانەدانی (مـارف) ئاغـای سـەروەری (ئاکـۆ)

که جێگەی عەیش‌و عیشرەت، مەنبەعی ئەمن‌و ئەمانێ بوو
لە جوود و بەخشش و ئینعامی خۆی و قەوم و ئەتباعی
وەکوو شانامەو و رۆستەم لەهەر جێ داستانێ بوو
کەیوومەرثی، دووەم جەمشیدی ثانی، خوسرەوی ثالث
سلەیمانی زەمان، ئەسکەندەرێ، صاحیبقرانی بوو
شەوی وەک زولفی یارد، رووی حەسوود و بەختی من تاریک
لەگەڵ دەیجوور و یەلدا وا حیساب کە ئەو ئەمانێ بوو
بەنامەردی شەهیدیان کرد وەکو حەمزە و عومەر، دوژمن
مراد ئاغا کە ڕۆژی جەنگ و دەعوا قارەمانێ بوو
کەسێ ئەم سەروی ڕەعنایەی لەپێ خست گەردنی بشکێ
چە زێبا صوورەتێ یارەب، چە شیرین نەوجوانێ بوو
(مراد)یان بۆیە ناو نابوو لە وەختی بەخشش و ئینعام
لە بۆ بانی مراد دەستی کەریمی نەردەبانێ بوو
لە حەق شێخ و مەلا و دەروێش و سۆفی و سائیل و سەییاح
وەکوو حاتەم شەفیق و دڵنیاز و میهرەبانێ بوو
ئیتر نەتبێ لە موڵکی ڕۆم (ڕەزا) ئومێدی ئاسایش
لە پێش ئەم کارەدا هێشتا ئومێدی پارچە نانێ بوو

لەو سەردەمەدا ئاڵۆزی و شەڕ و شۆڕ لە نێوان عەشیرەتەکانی کوردا زۆربەی لەسەر زەوی وئاو بوو. شێخ ڕەزا کە باسی میرانی خدر بەگی خۆشناو ئەکا و دەڵێت بەناهەق کوژرا، بەڵام داخی بۆ ناخوا، چونکە تووتنی عەشیرەتەکانی تری زەوت ئەکرد. کاربەدەستانی حوکومەتیش، بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان بەسەر کوردستاندا بکێشن، لە جیاتی ئەوەی ئەو شەڕانەی نێوان عەشیرەتانی کورد دامرکێننەوە؛ نەوتیان بەسەر ئاگردا کردووە. شێخ ڕەزا تەنها بەم چوار بەیتە فارسییە باسی شەڕی نێوان عەشیرەتی بلباس و عەشیرەتی ئاکۆ و خۆشناو ئەکات و ئەڵێت:

آنچە بلباس بخوشناوو بە آکو کردە است

نشنیــدم کــه ببــغــداد (هولاکــو) کــرده است
گــرچه مــیــران خـدر بگ نه بحق شـد مـقـتـول
کــشــتش به کــه بسی غــصب تماکــو کــرده است

واتا:

ئەوەی بڵباس بە خۆشناو و بە ناکۆی کردووە

نەمبیستووە هۆلاکۆ بە بەغدای کرد بێ

هەرچەند میرانی خدر بگ بە ناهەق کوژرا

کوشتنی چاکترە چونکە توتنی زۆری زەوت کردووە

***

## شێخ ڕەزا و میری شەقڵاوە

شێخ ڕەزا هاتوچۆی بە سواری هێسترێکی زین لێ کراو بوو. کاغزێک ئەنێرێت بۆ میری شەقڵاوە، میران بایز بەگ کە هێسترێکی باشی بۆ بنێرێت و لە هەمان کاتیشدا کاغزێک ئەنێرێت بۆ عادیلە خانمی خێزانی وەسمان پاشا. خانم دەیەوێت سەر بنێتە سەری و لێی دەپرسێت هێستری زیندووت دەوێ یان مردوو و ئەو شیعرەی سەرەوەی پێدا دەڵێت «هێستری زیندوو بڵێم بۆم چاکە یا گردووم دەوێ.» بەڵام میری شەقڵاوە هەر هێستری بۆ دەنێرێت و هیچی تر، ئیتر شێخ ڕەزا دەکەوێتە سەر و گوێلاکی هێستر:

مـیر بە صـەد مننەت هەناردی ئێسـترێکی ڕووت و قـووت

دەست و پا سست و سەقەت ئەندامی هەروەک عەنکەبووت

خــاوەنی نالیـکی نالێم پێی نەداوە مـــوتلـــەقـــا

داویەتی، ئەمما وەکـوو بیـسـتـومـە قـووتی لا یەمــووت

پووش لەلای حەڵوایە حەتتاکو پەڵووشەی چنگ کەوێ

بای ئەدا لوولی ئەدا قـــووتی ئەدا مـــانەندی حـــووت

گـــەرچی ناتوانێ ببـــزوێ هێند لەڕ و کـــەم قـــووەتە

دەنکە جـۆیێکی نیـشـان دەی، تا قـیـامـەت دێ لە دووت

پشــتی ڕێش و شـانی زامـدارو، جـەدە و بوو ناعـیــلاج

چەند قـــرووشـــێکم هەبوو بۆم دا بە نەوت و عـــەنزەرووت

مــەصلەحــەت وایە هەتا نەیخــواردوم بینێــرمــەوە
زۆر نەترسم دەفــعــەیێ قــووتم بدا بمکا بە قــووت
(سەی فەتاحی) مەیتەرم ڕۆژێ بە حجـجەت لێی نەوی
کلکی دەرهێنا لەبن ئەمـجـا بە ئاسـتـەم گـوێی بزووت
گــەر قــەڵەو بێ ئەم ئەجننە، لێـرە تەســخـیــر ناکــرێ
غــەیری چەند دەروێشی ڕەفــاعی بە زەبری جـەلجـەلووت
ئەم مــەتاعــە چاکــە هەر لایق بە حــاجی ئەحــمــەدە
جووتی پێ بکا هەروەکوو خۆت هەردوو لنگت کرد بەجووت
لایقی شـــانی من و شـــایانی شـــەئنی تۆ نەبوو
چاوەکـەم چیت پێ بڵـێم چارم نیـیـە غـەیری سکووت

***

### هەندێ لە هەجوەکانی شێخ ڕەزا

شێخ ڕەزا بە شاعـیرێکی هەجوکەر ناسـراوە. هەجوەکانی ئەوەندە توند و تیژن بوونەتە هۆی دڵگیریی گەلێک بنەماڵە و پیاوی ناسراو. ئەوانەیش کە لە سووچی هونەرمەندییەوە تەماشای هەجوەکانی شێخ ڕەزا ئەکەن، بە هیچ کلۆجێک لە قسە توند و تیژەکانی دڵگیر نابن. شێخ ڕەزا ئەو هەجوانەی وەنەبێ تەنها بەرامبەر بێگانە کردبێت، ئەوەی تەماشای هەجوەکانی بەرامبەر شێخ غەفووری مامی و شێخ عەلیی کاکی و شێخ محەمەد عەلیی برازای کردوویەتی، ئەوانەی لەمـان دوورترن، هیچ گـەردێک ناکـەوێتـە دڵیـان بەرامـبـەر شاعیرێکی هونەرمەندی وەکو شێخ ڕەزا.

شـێخ ڕەزا، خـۆی، ئەمـەی بە حـیکمـەت داناوە. لە سـتـایشـێکدا بۆ ناظم پاشـا لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێت:

زخیل شاعران من هم حکیمم گهی
گــویم هجــا ء وگــاه تحــسین
همی گـویم نکویانرا سـتــایش
همی خــواهم بدانرا لعن و نفــرین

بکام دوســــتـــان ریـزم بتـــرزد
زنم بر فـــرق بدخـــواهان تبـــرزین
کـــریمانرا دهانم گــوزهء شـــهــد
لئــیـــمـــانرا زبانم تـیغ روبین

بەڵام لەو بار و دۆخەی کە شێخ ڕەزا تێیدا ژیابوو، بۆ جیاوازی کردن لە نێوان (کەریم) و (بەد)، (دۆست) و (بەدخوا)، میعیارێکی تر هەبوو و شێخ ڕەزایش خۆی میعیارێکی (شەخصی)ی تایبەتی خۆی هەبوو. بۆ نموونە، هەجوی شێخ عەلیی کاکی و شێخ غەفووری مامی کردووە چونکە ئەوەی ئەو لێیانی ویستووە نەیانداوەتێ. هەروەها هەجوی موفتی زەهاویی کردووە چونکە لەگەڵ (ئیتتیحاری)یەکاندا هاوبیر بووە و هەجوی دەرویش ئەفەندیی موفتی کەرکووک ئەکات چونکە (مونافەسەی) لەگەڵ شێخانی تاڵەبانیدا کردووە و هەجوی مەلامارفی مەلا عەبدوڵڵای خدریی زەنگنە ئەکات چونکە جێ ڕێزی شێخ عەلی بووە و هەجوی حاجی ئەمین و ڕەفیق ئەفەندیی خادیمو سسججادە ئەکات چونکە زۆر دۆستی خزمانی خۆی بوون کە لێیان دڵگیر بوو. لەبەرئەوە داوای لێ بووردن لە هەموو ئەو بەڕێزانە و عەشیرەتانە ئەکەین کە بەر پەلاری شێخ ڕەزا کەوتوون.

***

### شێخ ڕەزا و مەستی ئەفەندی

ڕەسوول مەستی لە زاناکانی شاری سولەیمانییە. زانستی ئیسلامی لەسەر دەستی مەلاکانی کوردستانی عیراق و ئێران وەرگرتووە و لە ئەنجامدا خوێندنی لەلای مەلا و دانای بەناوبانگ مەلای خەتێی ڕەواندز پێک هێناوە. لە پاشان دەچێتە ئەستەموڵ لە زانیاریی فیزیا و فەلەک دەبێتە مامۆستا و لە شاری کەرکووک و مووسڵ مامۆستایی قوتابخانە ئەکات و لە پاشان ئەبێتە بەڕێوەبەری مەعاریفی شاری (وان) لە کوردستانی باکوور و دەچێتە میسر فێری زمانی فرەنسی دەبێت و گەشتێکی ئەورووپا ئەکات و ئەگەڕێتەوە ئەستەموڵ. لە زانیاریی فیزیا و فەلەک گەلێک نووسین و لێکۆڵینەوەی چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

مەستی ئەفەندی، لەگەڵ شێخ ڕەزادا، چە لە کەرکووک و چە لە ئەستەموڵ شەڕە دەنووکیان بووە. لە وەڵامێکی شوکری فەزڵی بۆ شێخ ڕەزا، دەڵێ: مەستی ئەفەندی

قسەی پێ وتووی جنێو بەمن بۆ ئەدەی. شێخ ڕەزا ئەم هەجوەی مەستی ئەکات:

دەسـتـێکی هەیە (مـەسـتی) ئەفـەندی لە کـەرەمـدا
مـێـوانی ئەزیزی هەیە دایم لە حـەرەمـدا
ئەلحـەق ژنەکـەی مـوشـفـیـقـە دەرحـەق بە غـەریبـان
صـەد گـانی بە ڕۆم داو، هەزاری بە عـەجـەم دا
هێند کـێـری هەتیـوان بە کـوزیا چووە دایکی
دەسـتـێکی شکا بو بە منالی لە شکەمـدا
بەر زەریەیی کـام کـێـری قـەوی کـەوتووە ئاخـۆ
بەو دەردە چووە سـاعـیـدی مـەسـتی لە ڕەحـەمـدا
حـەتتـا کـە مـەجـیـدی کـوڕی زۆر طەبعی جـەوادە
صـەد گـانی بە یەک لەحظە بەبێ پوول و درەم دا
گـەوواد و تەرەس، مـولحـیـد و بێ دین و مـونافق
مـردووە نیـیـە مـیـثلی لە مـسـقـوف و عـەجـەمـدا
بۆ سـەددی ڕەهی لەشکـر وەک تـەپڵـی سـکەندەر
ئاوازی دەهۆڵی کـوزی داکی دێ لە حـەرەمـدا
ئەو کـێـرە زلەی کێ بوو لە کـێـلانی فـەتاح بەگ
مـشـتـێکی کـوتایە قـوزی، مـشـتـێکی لە دەمـدا

شـێخ ڕەزا دان بەوە دانانێت کـە مـەسـتی ئەفـەندی پیـاوێکی دانابوو و لە بەیتـێکی فارسیدا ئەڵێت:

مـسـتی و داعـیـەء حکمت هیـئت هیـهـات
برنـدارنـد بـیـک دسـت دوتـا خـربـزرا

***

### هەجوی مەلا مارفی مەلا عبدوڵڵای خدری

مەلا مـارف کـوڕی مـەلا عـبدوڵڵای کـوڕی مـەلا سولەیمانی خدری یە. ئەم بنەمـاڵەیە پشتـاوپشت مەلا و مامۆستـای ئایینی، لە تیرەی گەڕاوی ئێڵی زەنگنەن. مەلا سولەیمانی

خدری ناوچەی گەڕاوی بەجێ دێڵێت و لە گەڕەکی (بەگلەر)ی قۆریەی شاری کەرکووک جێنشین دەبێت. مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مامۆستایەکی دانا و لە مزگەوتی جەلالییەکان مامۆستا بووە. موفتی زەهاوی؛ بە بۆنەی کۆچی دوایی مەلا سولەیمانی باوکییەوە؛ بە هەڵبەستێک پرسەی بۆ مەلا عەبدوڵڵا ناردووە تێیدا دەڵێت:

ألا انما الدنيـا سـجيـتـهـا الغـدر

فليس لمغـرور بزخـرفـهـا عـذر

فظاهرها ود وباطنهـــا قـلي

وادبارها خَـيـرٌ واقـبـالهـا شـر

ورغـبـتـهـا غـيـيٌ ورهبـتـهـا هوي

وطالبـهـا عـبـدٌ وهاربـهـا حـر

وعـزتهـا ذل وفـرحـتـهـا أسيً

وصحـتـهـا سـقم وثروتهـا فـقـر

مەلا مارفی کوڕی مەلا عەبدوڵڵا. زانستی ئیسلامی لەلای باوکی تەواو کردووە و لەسەردەمی حوکمداریی عوسمانی سەرەتای ژیانی بە قازی شەرع لە مەلا طیەی ویلایەتی (ئەدەنە) دەست پێ دەکات و لە پاشان دەبێتە حاکمی بدایەتی ویلایەتی مووصڵ. لە مووصڵ بە هۆی بەرهەڵستی لە دەست درێژی والیی مووصڵ بۆ کاروباری دادگاه، دەگوێزرێتەوە بۆ حاکمی بیدایەتی کەرکووک.

ئەم بنەماڵەیە پێوەندییەکی زانستی و ڕووحییان لەگەڵ شێخ عەلی تاڵەبانیدا هەبووە و زۆر جێ ڕێزی شێخ عەلی بوون و مەلا عەبدوڵڵا و مەلا مارف گۆڕستانیان لە تەکیەی تاڵەبانییە.

***

### شێخ ڕەزا بۆ هەجوی مەلا مارف ئەکات؟

هەر چەنێک شێخ ڕەزا گوتی بە دۆستایەتیی شێخ عەلیی کاکی لەگەڵ پیاوە، ناسراوەکانی کەرکووک نەداوە، هیچ هۆیەکی وا نییە ئەم هەموو جنێوانە بداتە مەلا مارف. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەمە، خوالێخۆشبوو مامۆستا ئەسعەدی سەعید ئەفەندیی نائیب کە لە ئەدەبی تورکیدا دەستێکی بالای هەبوو دەڵێت: مەلا مارف لە والیی مووصڵ

دلگیر بوو، چونکە لەسەر داوای ئەو لە حاکمی ویلایەتەوە گوێزرایە حاکمی بیدائەی کەرکووک. کە والی دێت بۆ سەردانی لیوای کەرکووک، لە کاتی پێشوازیدا، والی بە تەوسەوە هەواڵی مەلا مارف دەپرسێت و مەلا مارفیش زۆر بەڕەقی وەڵامی دەداتەوە، والیش بە تورکی: «هر نە سویلەسن معروف سن = هەرچی بڵێیت ناسراویت»ی پێ دەڵێت. شێخ ڕەزا کە دۆستایەتییەکی قووڵی لەگەڵ والیدا هەبوو ئەمە بە هەل ئەزانێت و ئەم هەجوەی مەلا مارف ئەکات.

من وا ئەزانم ئەمە ڕێی تێ ناچێت. ئەگەر وا بوایێ شێخ ڕەزا نەک بە کوردی بەڵکو بە تورکی هەجوی مەلا مارفی ئەکرد کە بگاتە والی. ئەوەی ڕێی تێ بچێت ئەوەیە، مەلا مارف زۆر دۆستی شێخ عەلیی کاکی شێخ ڕەزا بوو. شێخ ڕەزایش ڕقی لە دۆستانی شێخ عەلی هەڵدەستا و دەیویست بیانتۆرێنێت و ئەم هەجوە توندەی مەلا مارفی کردوە.

شێخ ڕەزا لە پێنج خشتەیەک لەسەر شیعری حافظ ئەم هەجوەی مەلا مارف ئەکات:

(معروف)ی بێ دیرایەت گووت کردە ناو بیدایەت
چیت پێ بڵێم قورمساغ هەردوو گونم بە دایەت
گونی بە ترِ شەهید کرد کێرم ئەکا ڕیعایەت
(زان یار دلنوازم شکریست با شکایت
گر نکتەدان عشقی خوش بشنو این حکایت)

مەعرووف کە حیزی وەک خۆی نەبو لە نەسلی ئادەم
ئازاری مەقعەدی بوو بۆم ڕاکشا لەسەر دەم
مردم ئەوەند سوار بم، خۆم کوشت ئەوەند پیادەم
(بی مزد بود و منت هر خدمتی کە کردم
یارب مباد کسرا مخدوم بی عنایت)

خاشاکی دەوری دوبری لێم بوون بە ماری هەیجا
کێرم بە صەد مەشەققەت ڕۆیی گونم نەگونجا
کێرم لە پەشمی پاشی دانەی کونی ترنجا
(در زلف پر شکنجش ای دل مپیچ کانجا
سرها بریدە بینی بی جرم و بی جنایت)

ڕووم کردە سمتی سمتی، یەعنی مەکانی مەعهوود
ئەرزێکی پڕ نەجاسەت دەشتێکی شەهوەت ئالّوود
ڕانیم فەرەس چەپ و ڕاست ڕێگەم نەبردە مەقصود
(از هر طرف کە رفتم جز وحشتم نیفرود
زینهار أزین بیابان وین راه بی نهایت)
دەرمانە سمتی ئەمما نەرمانە وەک بەری دەست
کاروانی کێر بەناویا دەڕوا هەمیشە سەربەست
هەر مەنزلێکی سەد میل، هەرمیلی سێسەد و شەست
(این راهرا نهایت صورت کجا توان بست
کش صد هزار منزل بیش است از بدایت)
باوکی پیاوی چاک بوو ذاتێکی زۆر موقەددەس
خۆی پوشت و داکی خۆگێ هەتا خوا بلێ بەس
بۆ نەختێ ئاوی شەهوەت جەرگی بووە بە قەقنەس
(رندان تشنە لبرا آبی نمی دەهند کس
گویا ولی شناسان رفتند ازین ولایت)

***

**هەجوی مەلا سەعید**

مەلا سەعید پیاوێکی ڕەوشت پاک و خۆش گوفتار بوو. زۆر جێ ڕێزی شێخ عەلی و کوڕەکانی بوو. لە کاتێکدا شێخ ڕەزا لە شێخ عەلی بە گلەیی بوو، هەر کەسێک لە شێخ عەلییەوە نزیک بوایێ، دەبووە جێ پەلار و هەجوی شێخ ڕەزا. لەم شیعرە تورکییەدا هەجوی مەلا سەعید ئەکات:

باغدەمی یوقسە داغدەد
صولدەمی بوقسە صاغدەدر
هرگیجە بر باجاغدەدر
انساسی بر قوجاقدەدر

غـــــائب اولانـده کـــــیم بیلور
جن گـــبی نبـــرده صـــاقـــلانور
هانـگی قـــوناغـــــده اگلـنور
کـــیــــملر ایله یتـــاقـــدەدر
مـــسجـــدده لامـــپـــه یاندیرر
ذکـــــر ایله خلقی قـــــاندیرر
بر الی ســـبـــحـــه گــیــــزدرر
بر الی ســـیـک دشـــاقـــدەدر
بـو تـرس اوغـلـی گـــــوت ویـران
ســــــــیـک اوزرنـده اوتـوران
بـاشـی هـوایـه قـــــــالـدیـران
صـــــانکه دروب ایاقـــــدەدر

واتا:

له باغدایه یان له چیا له چەپدایه یان له ڕاست
هەر شەوێک لەناو گەلێکدایه پاشەڵی لەباوەشێکی تردایه
که ون دەبێت کێ چوزانێت وەک جن له کوێ خۆی شاردووەتەوە
له کام ماڵدا ئاهەنگ ئەکا لەگەڵ چی کەسان له جێگادایه
له مزگەوت چرا هەڵئەکات به ذیکر خەلق هەڵدەخەڵەتێنی
به دەستێکی تەسبیح سووڕ ئەدا دەستێکی به کێر و گونیەوەیه
ئەم تەرەس بابەی قووندەرە لەسەر کێر دانیشتووە
سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیوە وەکوو وەستا بێت به پاوە

حـــــامـل ایـکـن جنـابـتــــــه
بـاشـلـر اذان و قـــــامـــــتـــــه
بر ایاغی جـــمـــــاعـــتـــــده
بـــر ایـــاغـــی بـــولاقــــــــــدەدر
ایشـلیـــه ایشـلیـــه باشـــلادی

قــــابـتـی فــــــرنـگـی علـتـی

بـوزمـــــادی اسـکـی عـــــادتـی

شــــمـــدیده ایشلهمـــاقـــدهدر

قـــیـــز گـبی اینجــه در ســـوزی

نـازایـلـه قـــــالـدیـریـر گـــــوزی

ایــپــلــگ ایــلــه آلــور یــوزی

چـونـکـه گــــــوزی بـراقــــــدهدر

گـــــــر آنـی زار و اغـلـیـــــــان

گـــــــــورسـن اینـانمـهبـو یـلان

بـاشـی آزلــــــــهده یـیـــــلان

قـــــویروغـین دولامــــاقـــــدهدر

واتا:

که لهشی پیسه به جهنابهت دهست نهکاته بانگ و نوێژ

پایهکی له نوێژی جهماعهتدایه و پایهکی وا له بولاغدا

ههر دهستی کرده کارکردن نهخۆشیی فرهنگیی وهرگرت

نهیگۆڕی عادهتی پێشووی هێشتا ههر له کاردایه

دهنگی وهکو کچ باریکه بهناز چاو ههڵدهبڕێت

به دهزوو ڕووی ههڵدهگرێت چونکه چاوی له بوڕاقه

گهر دیت به زار و گریان بڕوا مهکه ئهمه درۆیه

سهریشی داڕزی مار ههر کلکی سووڕ دهدا

شێخ ڕهزا ههمـیشـه، لهسـهر مـووچهی گـوزهرانی، لهگـهڵ مـهئمـوورانی دارایی بگره و بهردهی بوو و ئهوهی تهگـهرهی بخسـتـایێ كـاروباری زوبانـی بۆ دههێنایه كـار، ههندێ لهوانیش دهستی شاعیرییان ههبوو و وهڵامیان دهدایهوه و شێخ ڕهزایش لهسهر چۆك بۆیان دادهنیشت، وهكوو دهڵێت:

دهرحــهقی، بۆچی نهترسم، به خــوا تا نهمـــرێ

چی له دهس نایێ، مـهگـهر بێ گـونی ئهسـپم بگرێ

به خهبیثی نییـه میـثلی كه وهكـو جهوههری گـوو

مەگەسی پێوە بنیشێ، وەکوو صەگ پێی دەوەڕێ
پێی بڵێن بەو تەرەسە گەر لە عەلەیهیم بدوێ
بە فوویێ عەزلی ئەکەم، نابێ لەوێدا بتڕێ
پدەری نێرەکەر و مادەری وەک ماچەخەرە
کێ دەڵێ ئادەمە، کەربابە، وەکوو کەر دەزەڕێ
وەرە لادە لە شەڕی ئالەتی مەعهوودی (ڕەزا)
موقتەزای گرتنە طەبعی بەخوا پێت ئەگرێ

***

### هەجوی حافظ ئەفەندیی قەردار

بنەماڵەی قەردار لە کەرکووک، هەر چەنێک ئێستا خۆیان بە تورکمان دادەنێن بەڵام لە ڕەسەندا لە ئێلی بڵباسی کوردن، چەند کەسێکی دیاریان لە دەوڵەتی عوسمانی مەئمووری گەورەو، لە دەوری کۆماری تورکیایش یەکێکیان والیی ئەستەمووڵ بوو. حافظ ئەفەندی لە بەغدا دەژیا و لەگەڵ شێخ ڕەزادا زۆر ڕێک نەبوو، لەبەرئەوە شێخ ڕەزا ئەم هەجوەی کردووە:

مرا بخانەء پاشا بضرب سیلی و مشت
(حسین ئەفەندی) زن قەحپە راند و حافظ پشت
کدام بگچی و قائق چی و ترمپا چی
بکون (حافظ ئەفەندی) فرو نبردا نگشت

واتا:
بە زەبری شەقازلە و مشتەکۆلە
حوسێن ئەفەندیی قەحپە ژن و حافزی پوشت پاڵیان پێوەنام بۆماڵی پاشا
کام نێشکگیر و بەلەم لێخوڕ و ترومپاچی
پەنجەی نەکردووە بە قنگی حافز ئەفەندیدا

زبسکە حیز بود همچو جسر بغدادش
همیشە آب بزیراست آدمی بر پشت
بدست این دو لعین کشتە گر شوم چەعجب

مگر حسین علی را، یزید و شمر نکشت
نعوذ بالله اگر این بود مسلمانی
صواب دین یهود است و مذهب زردشت

واتا:

لەبەرئەوەی حیزە وەک پردی بەغدا
هەمیشە ئاوی لە ژێر دایە و پیاوی بەسەرەوەیە
سەیر نییە ئەگەر بە دەستی ئەم دوو مەلعوونەوە بە کوشت بچم
بۆچی یەزید و شمر حوسێنی کوڕی عەلییان نەکوشت!
پەنا بەخوا، ئەگەر موسڵمانەتی ئەمەبێ
ئایینی جوولەکە و ڕێبازی زەردەشتیش ڕاستە.

***

### هەجوی حاجی مستەفا

لە دەوری عوسمانیدا، هەندێ کەس لە دائیرەی ئەوقاف و هەندێک لە خەزینەی دەوڵەت مووچەیان بۆ بڕابووەوە. ئەم مووچەیە، بە پێی هەڵبژاردنی مەئموورانی هەرێمەکان دەبوو. شێخ ڕەزا، نە لە تەمەندا و نەیش لە بێ وڵەتیدا وا لێکەوتوو نەبوو کە میری بیژێنێت ئەویش داوای سنوورێکی بۆ نەبوو و لەبەر ئەوە ئەکەوتە تەقەوە لەو جۆرە مەئموورانە یەکێک لەوانە حاجی مستەفایە.

گل اگر یکدم بکام بلبل شیدا شود
کام دل نگرفته خاری درمیان پەیدا شود
مستحقیرا معاشی داد خواهد پادشاه
حاجی میکوشد که اورا مانع اجرا شود

واتا:

گوڵ ئەگەر تاوێ بە ئارەزووی بلبل شێت و شەیدا بێ
ئارەزووی دڵی نایەتەدی، دڕکی لە نێواندا پەیدا ئەبێ
پادشا ئەیەوێ مانگانەیەک بدا بە مستەحەقێک.
حاجی هەوڵ ئەدا ببێ بە کۆسپ لە ڕێی جێ بەجێ کردنیا.

در میان مالک و رضوان صباح روز حشر

از خصوصی ریشی حاجی مصطفی غوغا شود
بانگ بر رضوان زند مالک که ای رضوان مهل
این یهودی ریش سوی جنة المأوی شود

واتا:

له نێوان مالیک و ڕیزواندا سبەینێی ڕۆژی حەشر
لە بارەی ڕیشی حاجی مستەفاوە غەڵبە پەیدا ئەبێ
مالیک بانگ ئەکاتە ڕیزوان ئەڵێ: ئەی ڕیزوان مەیێڵە
ئەم جوولەکە ڕیشە بەرەو بەهەشت بچێتەوە.

گویدش رضوان نه آخر پیر مرد حاجی است
کی خدا فرموده حاجیرا جهنم جا شود
مالکش گوید فراوان از یهودان حاجی اند
سالک بیت المقدس حاجی انها شود

واتا:

ڕیزوانیش پێی ئەڵێ ئاخر بۆ ئەم پیرە پیاوە حاجی نییە؟
کەی خودا فەرموویە حاجی لە جەهەننەما جێی ببێتەوە.
مالیک پێی ئەڵێ: زۆر لە جوولەکەکان حاجین
ئەوەی چووە (بیت المقدس) ئەبێ بە حاجیی ئەوان.

چون سخن اینجا رسد رضوان بماند بی دلیل
ریش بر دعوای مالک حجت عظمی شود
پس برغم انف رضوان در جحیمش افگند
درمیان دوست و دشمن عبرت و رسوا شود

واتا:

کە قسە ئەگاتە ئەم ئاستە ڕیزوان بەڵگەی نامێنێ
ڕیش ئەبێ بە بەڵگەیەکی گەورە بۆ ئیددیعاکەی مالیک
بە کوێرایی چاوی ڕیزوان فڕێی ئەداتە دۆزەخەوە و
لەناو دۆست و دوژمنا ڕیسوا ئەبێ و ئەبێ بە پەند

حاجی بابا چارەء این ریشرا امروز کن

ورنه فـــردا فـــتنهـــا زان ریش تو بریا شـــود

برکنش از بیخ و بن نی صـــد رهش گـــر بر کنی

هفـــتـــهء نگذشـــتـــه این تخم بلا بالا شـــود

واتا:

حاجی بابا هەر ئیمڕۆ چارەی ئەم ڕیشەت بکە

ئەگینا سبەینێ چەند هەراو فیتنە لەم ڕیشەی تۆوە بەرپا ئەبێ

هەڵی کەنە لەبن و ئەگەر صەد ڕەگی لێ هەڵکێشی

هەفتەیەکی پێ ناچێ ئەم تۆوی بەڵایە بەرز ئەبێتەوە

چون ترا خـــــواهد بدوزخ بردایـن نـاپـاک ریشـی

وقف کن تا خلقـــرا جـــاروب اســـتنجـــا شـــود

هاجی همـچـون (رضـا) و حـاجی همـچـون شـمـا

قـــرنهـــا باید کـــه تا از لطف حق پیـــدا شـــود

واتا:

چونکە سەرەنجام ئەم ڕیشە ناپاکە ئەتباتە دۆزەخ

بیکە بە وقف تا خەڵک بیکەن بە گسکی گووماڵین

هەجو کەرێکی وەک (ڕەزا) و حاجییەکی وەک ئێوە

سەدان ساڵی ئەوێ تا لە لوتفی خوداوە پەیدا بێن

***

### هەجوی دەفتەردار

دەفـتـەردارێکی تورک، لە کـاتی داگـیـرکـەرانی عـوسـمـانی. لە کـەرکـووک بووە. ئەم دەفـتـەردارە، وەکـوو زۆربەی کـاربەدەسـتـانی دەورویەری عـوسـمـانی، هیچ کـارێکی بەبێ بەرتیـل نەدەکرد. شـێخ ڕەزایش هەرچەن تەقـەلای وەرگرتنەوەی مـووچەکـەی دەکـرد، بەڵام بۆیان نەدەکـرد. ئیـتـر وەکـو شـێخ ڕەزا دەڵێت؛ دۆم بێت و کـڵاش بۆ خـۆی بکات. لە هەجوێکی بە زوبانی فارسی دەڵێت:

مـــیکنم هجـــو اگـــر لطف خـــدا باشـــد یار

مـــویی از خـــایهء من بـر نـکند دفـــتـــردار

خـــايه، همچ و جـــبل دارم و كـــيـــري چو منـار
هردو، هرمـی هـمــــه درکس زن دفـــتـــــردار

واتا:
ئەگەر لوتفی خوا یار بێت هەج و ئەکەم
موویێ لە گونی من هەڵناکێشێ دەفتەردار
گونێکی وەک کێو و کێرێکی وەک منارەم هەیە
هەردوو گونم و لەگەڵ کێرم بە کوزی ژنی دەفتەردار

لە ئەنجامدا، شێخ ڕەزا، سەیر ئەکا کە دەفتەردار نە بە تکا و نە بە هەجو مەعاشەکەی ناداتێ. لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت: با بزانین کێ زیان ئەکات:

نامـوسی ارەیان کـیـمـسـه، هجـادەن حـذر ایلر
شـــاعـــرلر ایله خـوش گـــيـچنور دفع شـــر ایلر
تأخـــيـــر مــــعـــاشم سکا بر فـــائده ويرمـــز
ای بـاعـث رزقـم بـاقــــەلـم کــــيم ضــــرر ايـلر
اربـاب کــــــرم اولـه فـــــقط حق شـنـاس اول
وجـــدانی اولان کـــيـمـــســـه بو راهه گـــذر ايلر
جـانـدان اوصــانوب، دوغــريسی ترک ادب ايتـدم
مــعناسنی ويرمگله دگل حـرفنه صــرف نظر ايلر
انســـــان اولان انســــانلره حـــسن نظر ايـلر
مـــيـــدان حـــمـــيـــتـــده دوروب ترک ســـر ايلر

واتا:
ئەو کەسەی لە نامووس بگەڕێت لە هەجو خۆی لا ئەدا
لەگەڵ شاعیراندا خۆش ڕادەبوێرێت و لەشەڕ خۆی لا ئەدا
دواخستنی مەعاشم هیچ سوودێکی بۆ تۆ نییە
ئەی مایەی ڕزقم با بزانین کێ زیان ئەکا
خاوەنی بەخشش مەبە بەڵام حەقناس بە
ئەوەی ویژدانی هەبێ لەم ڕێگایەوە دەڕوات
لە گیان بێزار بووم، بە ڕاستی وازم لە ئەدەب هێنا

به مانا دانەوە نییە چاوی لە حەرفی نەپۆشێت
ئەوەی ئینسان بێت لەگەڵ ئینساناندا چاکە ئەکات
لە مەیدانی حەمییەت دەوستێت سەری فیدا ئەکات

لەلایەکی ترییەوە کاظم بگ وەعدی دەداتی کە مووچەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە بەڵام بەجێی نایەنێت:

آلنجـــه خـــزنه ء مـــاليـــهدەن..........
بنم سـعـيـم گـبی کـاظم بگک وەعـدی مـهـدردر
بنی خـوشنود ایدر، فـردا دیور وعـد ایدرهر گـون
ا و فـردادک مـرادی غـالبـا فـردای مـحـشـردر

واتا:
تا لە خەزینەی مالیە (گەنجینەی دارایی)
وەکو و کۆششی من گفتی ناظم بەگیش بە خۆڕایی دەڕوا
دڵی من خۆش ئەکات، ئیمرۆ و سبەی دەڵێت، هەموو ڕۆژێک گفتم ئەداتێ
ئەو ئیمرۆ و سبەیەی، ڕەنگە ئەنجامی ڕۆژی حەشر بێت.

***

## شێخ ڕەزا و ئێران

پێوەندیی شێخ ڕەزا لەگەڵ ئێراندا لە دوو ڕێگاوە بوو: یەکەمیان شێخانی تاڵەبانی پێوەندییەکی ئایینی (ڕێبازی قادری)یان لەگەڵ ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا هەیە. هەر لە کۆنەوە و تاکو ئێستایش، لە کرماشان و سنە و سابلاغ و موکریان لقی تەکیەی تاڵەبانی هەیە و ژمارەیەکی زۆر لە کوردی ئەم هەرێمانە دەروێش و موریدی شێخانی تاڵەبانین. دووەم، لەو سەردەمەی کە کوردستان لە نێوان عەجەم و تورکدا دابەش کرابوو، ئەم سنوورەی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە بۆ کورد قەدەغە نەبوو. زۆربەی ئێلاتی کۆچەری کورد لەم بەر و لەوبەری سنووردا، گەرمیان و کوێستانیان ئەکرد و تا ڕادەیەک کوردستان یەک هەرێمی ئابووری بوو و هاتوچۆی کاروانی کوتاڵ بە سەرانسەری کوردستاندا بە سەربەستی دەگەڕان و کوردانی هەردوو هەرێم بەبێ پاسپۆرت، بەپێی پەیمانی هەردوو دەوڵەت هاتوچۆیان دەکرد. شێخ ڕەزایش جگە لەم پێوەندییانە، پێوەندییەکی تایبەتی ئەدەب و زوبان هەبوو کە یەکێک لە هەرە شارەزاکانی زوبان و ئەدەبی فارسی بوو. ئەم

پێوەندییانە وای لە شێخ ڕەزا کردووە، نەک تەنها لەگەڵ کوردانی ئێران، بەڵکو لەگەڵ کاربەدەستانی گەورەی ئێرانیشدا پێوەندی بکات و لە جێگای خۆیدا مەدح و جارجاریش هەجوی زۆر ڕەقیان بکات کە بە عەجەم دەڵێت:

بشکست سرو افسر کسرای عجم را
برباد فناداد رگ و ریشەء جم را
آورد شبیخون مدینە بمدائن
بگرفت ز شاهان عجم تاج و علم را
این عربده با آل عمر بهر علی نیست
با آل عمر کینەء قدیمست عجمرا

واتا:

سەر و تاجی کیسرای عەجەمی تێشکاند
ڕەگ و ڕیشەی جەمی دا بە بای فەوتان
(مەدینە) شەبەیخوونی کردە سەر (مەدائین)
تاج و ئاڵای لە شاهانی عەجەم وەرگرت
ئەم بێ ئەدەبییە لەگەڵ ئالی عومەر لەبەر خاتری عەلی نییە
عەجەم کینەیان لەگەڵ ئالی عومەر کۆنە.

لە جێگایەکی تری، لەسەر «شیخین و شیری لافتی» کە گوایە لەسەر وتەی پێغەمبەر (ص): «لافتی الا علی ولا سیف الا ذو الفقار» شێخ ڕەزا ئەمە بەدەست درێژییەکی زۆر دادەنێ و لەم شیعرەی خوارەوە لە پۆزیان دەدا.

نعش خبیث خویشرا ایرانیان بهر شرف
پیویستە سوی کربلا می آورند ازهر طرف
در دادە آخوندها صلا، کز سایەء أهل ولا
(ان یدفنوا فی کربلا یغفر لهم ماقد سلف)

واتا:

ئێرانییەکان لە پێناوی شەرەفدا تەرمی چەپەڵی خۆیان
پەی دەرپەی لە هەموو لایەکەوە ئەهێنن بۆ کەربەلا
ئاخوندەکان بانگ و سەلایان هەڵداوە کە وا لە سایەی ئەوانەدا دۆستی ئالوبەیتن.

ئەگەر لە کەربەلا بنێژرێن لە هەموو گوناهی پێشوویان خۆش دەبرێت.

پس ای گروه بدگمان، شیخین و شاه انس و جان
پهلوی هم در یک مکان، چون سه گهر در یەک صدف
باشند از رحمت بری، در حیرتم زین داوری
تاکی به این جهل و خری، ای مردمان نا خلف

واتا:

کەواتە ئەی گرۆی بەد گومان، (شەیخەین) (ئەبوبەکر و عومەر) و پێغەمبەر
لە پاڵ یەک و لەیەک شوێنا وەک سێ گەوهەر وان لە صەدەفێکا.
لە ڕەحمەت بەری بن، من لەم داوەرییەی ئێوە سەرسامم
ئەی پیاوانی نارەسەن تاکەی لەم نەزانی و کەرییەدان!

شیخین و شیری لافتی عین هم اند این هرسه‌تا
بر دینتان واحسرتا، برکینتان یا للأسف
آخر زشاه انبیا، شرمی کنید ای بی حیا
کی شاه باز کبریا، کمتر ز مولای نجف

واتا:

ئەبوبەکر و عومەریش هەر وەک ئەبوبەکر و عومەر و پێغەمبەرن
ئەی داخم بۆ نایینتان و وەی خەفەتم بۆ کینەتان
هەی بێ حەیایینە شەرمێ لەشای پێغەمبەران بکەن
چۆن ئەبێ شابازی کیبریا کە پێغەمبەرە لە حەزرەتی عەلی کەمتربێ!

بگشا (رضا) درج دهن، پاشیده کن درسخن
بر قلب بدخواهان بزن تیغ زبان لاتخف

واتا:

(ڕەزا) نقێمی دەم و دانت بکەرەوە و قسەی وەک دوڕ بلاوکەرەوە،
بیدە لە جەرگی ناحەزان بە تیغی زمانت و هیچ مەترسە.

***

## مەدحی ناصیرەددین شاه

ناصیرەددین شاه (١٨٣١-١٨٩٦) لە بنەماڵەی شاهانی قاجارەکە لە ڕەسەندا لە

ئازەری ئازەربایجانن و تاکو ئینقیلابی ڕەزاخانی پەهلەوی دژی ئەحمەد شاه حوکمی ئێرانیان کرد. ناصیرەددین شاه پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپادا پەیدا کرد و دەرگای ئێرانی بۆ سەرمایەدارانی ئەوان کردەوە. لەکاتی حوکمڕانیدا گەمارۆی (هەرات)یدا، بەڵام لەبەر ئەوەی ئینگلیزەکان باشووری ئێرانیان داگیرکرد، گەڕایەوە. لە دواییدا لەلایەن میرزا ڕەزای کرمانی کوژرا.

شێخ ڕەزا، لەم شیعرە فارسییەدا مەدحی ئەکات و ئەڵێت:

گــــر شـــعـــاع خـــســرو انجم بنودی مـــاهرا
مـــاه مـــیگفـــتم جـــمـــال (ناصــرالدین) شـــاهرا
نورمـــاه از آفـــتـــاب و نور شـــاه از خـــویشـتن
در حـقــیــقت فــرق بســیــارست شـــاه و مـــاهرا

واتا:

ئەگەر مانگ لە تیشکی شای ئەستێرەکان نەبوایە (کە ڕۆژە)
ئەموت جوانیی ناصیرەددین شا مانگە، (بەڵام ناڵێم چونکە)
ڕۆشنایی مانگ لە خۆرەوەیە، ڕۆشنایی شا لە خۆیەوەیە
لە ڕاستیدا جیاوازی زۆرە لە نێوان شا و مانگدا

گــرنە از خط شــعـــاع مـــهـــر بگرفـــتی ضــیـــاء
در فـلـک از شـــــــــرم رویـش گـم نمـودی راهـرا
کـبـک را از سـایەی عـدلش ز شـاهین باک نیـسـت
مـــیـــزند هردم بگردون بانگ قـــاها قـــاهرا

واتا:

ئەگەر مانگ لە ئاسماندا تیشکی لە هێڵی تیشکی ڕۆژ وەرنەگرتایە
لە شەرمی ڕووی شادا ڕێی لە ئاسماندا ون ئەکرد (چونکە بەرچاوی تاریک ئەبوو)
لە سایەی داد پەروەریی ئەودا کەو باکی لە شاهین نییە
بۆیە هەمیشە بانگەوازی (قا.. قا..) لە گەردووندا لێ ئەدا

این هـمـان شـاهیـست کـزبهـر عـدالت گـسـتـری
شـــیـــررا گـــوید شـــبـــان شـــوگلە، روباهرا
گـــفـت بامن ابلـهی کـــوتاه بین از روی تیـــز

قـــبلهء عـــالم توانی گـــفتن این جم جـــاهرا

واتا:

ئەمە هەر ئەو شاهەیە کە بۆ داد بلاوکردنەوە

بە شێر ئەڵێ ببە بە شوانی ڕانە ڕێوی

گێلێکی کورت بین لە ڕووی ڕق و کینەوە پێی وتم:

ئەتوانی بەم شاهە بڵێی: قیبلەی جیهان؟

گـــفـــتم ای کـــوتە نظر آخـــر نە او ظل خـــداست

ســــرور عـــــالم ببـــــاید گـــــفت ظل اللە را

این هـمـــان شـاه جـهـــاندارست کش خـاقـــان چین

عـــرضـــە مـــیـــدارد کـــە دیرن بندە ام درگـــاهرا

واتا:

پێم وت: ئەی بەرچاو کورت ئاخر ئەی ئەو سێبەری خوا نییە؟

کە گەورەی جیهان ئەبێ پێی بوترێ: سێبەری خودا

ئەم ئەو پاشا دونیا بە دەستەیە کە خاقانی چین عەرزی ئەکا

ئەڵێ: من بەندەیەکی کۆنی دەرگای تۆم.

***

## تەلغرافێک بۆ ناصیرەددین شا

لە دەس پێکردنی ئەم شیـعرەدا، شـێخ ڕەزا، باسی تەلگراف دەکات چۆن بەیەک لەحزە وەکـو تیـشکی هەتاو دووریی صـەد سـاڵە قـەمچ دەکـات و هاواری دەگـەیێنێـتـە شـا و دەڵێت:

أی تـل تـونـیـک واسـطـە‌ء داد خـــــــــواهـرا

واقـف کـنـی ز حـــــال گـــــدا پـادشـــــاهـرا

در یک نظر، بەیـک حـرکت، چون شـعـاع شـمس،

طی مـــیکنی مـــســـافـــە‌ء صـــد ســـالە راهرا

واتا:

ئەی تەلگراف! تۆ هۆیەکی چاکی بۆ ئەوەی دادی بوێ

پادشا لە حاڵی گەدا ئاگادار ئەکەی

بە جووڵەیەک و لە چاوترووکانێکا وەک تیشکی ڕۆژ
پێوانەی سەد ساڵە ڕێ ئەبڕی

فــــــرسخ بریـدن تـو بـقــــــدر پریـدنسـت
از صـــــحن دیده تـا ســـر مـــژگـــان نگـاهرا
تـا پـای تخت خـــسـرو گـــیـــتی ســـتـان برو
از مـن بـبـــوس خـــــاک در بـارگـــــا هـرا

واتا:

فرسەق بڕینی تۆ ئەوەندەی ئەوەیە
کە ڕوانینی چاو لە ناو چاوەوە تا برژانگ ئەفڕێ
تا بەرپێی تەختی پادشای جیهانگیر بڕۆ
لە جیاتیی من خاکی بەر دەرگای بارەگای ماچ بکە

بر خـــوان دوعـــای دولت و انگاه عـــرض کن
شـــــرح نیـــــازمندی این بنده‌ء شـــــاهـرا
آرایش اریکه‌ء جم، خـــســـــر و عـــجـم،
دارای مـلـک ری، شـــهگـــیـــــتی پنـاهـرا

واتا:

دوعای بەردەوامیی دەوڵەتی بۆ بکە و پاشان بە درێژی
داواکارییەکانی ئەم بەندەیە عەرزی حوزووری شا بکە
ئەی مایەی ڕازانەوەی پشتێنی جەمشید و خوسەرەوی عەجەم
ئەی خاوەنی موڵکی ڕەی و شای جیهان پەنا

آن خـــسـروی کـــه (ناصـــردین مــحـــمــد است)
بـر خـلـق آیـتـی است ز رحـــــــمت إلـهرا
آز انجـــــمش ســـپـــــاه فـــزونـتـــر بـود ولی
انجـــا کـــه حـــیـــدراست چه حـــاجت ســپـــاهرا

واتا:

ئەو خوسرەوەی کە یارمەتی دەری ئایینی موحەممەدە
نیشانەی ڕەحمەتە لە خواوە بۆ خەلق

لەشكری لە ئەستێرە زۆرترن بەڵام
مادام حەیدەر هەبێ بۆ پشتیوانیی، سوپای بۆچییە؟

مــــهـــرا بروی انور شـــه مـــیکند قـــیـــاس
آنکس کـــه از ســـفـــیـــد نداند ســـیـــاهرا
یـــارب بـــحـــق آل عـــلـــی پـــایـــدار کـــن
جـــاه و جـــلال، حـــشـــمت روحی فـــداهرا

واتا:
ئەو کەسەی ڕەش و سپی لە یەک ناکاتەوە
قیاسی مانگ لە ڕووی شا ئەکا
خوایە بۆ خاتری ئالی عەلی
جاه و جەلال و حیشمەتی ئەم شایە- بە قوربانی بم - پایەدارکە

درشـــه کـــمـــال ذاتی و درمـــاه عـــارض است
فـــرق است آســـمـــان و زمین شـــاه و مـــاهرا
باز یچـــه نیـــست منقـبت خـــسروان (رضـــا)
کی طاقت تحـــمل کـــوه است کـــاهرا

واتا:
تەواوی لە شادا هی خۆیەتی و لە مانگدا لەلاوە هاتووە
شاه و مانگ جیاوازییان جیاوازیی ئاسمان و زەوییە،
(ڕەزا) تاریف کردنی پادشایان گاڵتە نییە
کەی گایەک توانای هەڵگرتنی کێوێکی هەیە

***

## مەبەستی ،حافظ، لە پرسیاری ناصیرەددین شادا

ناصیرەددین شا لە شاعیران دەپرسێت: مەبەستی «حافظ» چییە کە دەڵێت: «بلبلی برگ گلی خۆش رەنگ در منقار داشت». گەلێک لە شاعیران وەڵامی شا دەدەنەوە، بەڵام شا هیچیانی بە دڵ نابێت. ئەم پرسیارە دەگاتە شێخ ڕەزایش. شێخ ڕەزا لەسەر هەمان کێش و قافیە ئەم وەڵامەی شا دەداتەوە و زۆری بە دڵ دەبێ و بەخششی دەداتێ.

شـــــــاه والا وقت طـالـع روی در ادبـار داشـت

این دل غم منزلم را غـــرق در اکـــدار داشت
بر سرورم صد هەزاران کـوه عـصـه بار داشت
صاحـبا در حالتی کین بنده غم بسیـار داشت
یادم آمـــد آن کـــلام آنجناب اظهـــار داشت

واتا:

ئەی پادشای پایە بڵند، کاتێ کە بەخت ڕووی لە پشت هەڵکردن بوو
ئەم دڵەی خۆم لە ماڵمدا نوقمی لێڵی کردبوو
صەدان هەزار کێوی غەم بەسەر شادیەوە بووە بار
گەورەم: لە کاتێکدا کە ئەم بەندەیە خەمی زۆری لە دڵا بوو
هاتە بیرم ئەو قسەی ئەو حەنابە کە وای دەربڕی

کرده بـردی ز امتحان با شاعـران گـفت و شکفت
کـــز وجـــود من بر و در منظر عـــالم برفت
هیچ کـسی بر وفق طبع من در مـــعنی نســفت
گفتـه بودی مقصد حافظ چه بود از آن چه گفت
«بلبلی برگ گلی خـوش رنگ در منقـار داشت»

واتا:

بۆ تاقی کردنەوە لەگەڵ شاعیراندا قسەت کردبوو و گوێت بۆ شل کردبوون
کە بوونی من بە دیەن لەبەر چاوی جیهان ڕۆیشتبوو*
کەس بە گوێرەی ئارەزووی من مرواریی مانای نەسمی
فەرمووبووت مەبەستی (حافظ) لەوە چییە کە وتوویە؛

* واتە: کەس بیری لە بوونی من نەکردبووەوە تا بانگ بکرێم بۆ ئەو تاقیکردنەوە و پرسیارە.

زان حـبـیب حی وحق امـداد فـیض سـرمـدی
بس تضـرع کــردمــاند در باب آل احـمـدی
ذات احـمـد را شـفـیع آورده برهر مـقـصـدی
نصف شب غـواص کـردیدم به بەحـری ابجـدی
تا ببـــینم این صـــدف آیا چه در دربار داشت

واتا:
زۆر داوای بەرەکەتی هەمیشەییان لەو خۆشەویستی خوای بە حەق و زیندوە کردووە
لە بارەی ئالی پێغەمبەرەوە زۆر پاڕاونەتەوە
بۆ هەر مەبەستی زاتی پێغەمبەریان کردووەتە تکا کار
نیوە شەو وەک ئەوانەی ئەچنە بنی ئاو بە دەریای حەرفی ئەبجەدیدا نوقم خوارد
تا بزانم چە مرواریيەک لەناو ئەو سەدەفەدا شارراوەتەوە.

زان همـه مـردان بیـامـد صـفـوت جـاروی کش
بر دل آمـد مـعنئ شـیـرین بس بی عـیب و غش
لوح قلبم را صـــفـــاداند همی آیینەوش
بلبلی برگ گلی شـد سـیـصـد و پنجـاه و شش
با حـسین و با حـسن هم با علی مـعـیـار داشت

واتا:
لەو هەموو مەردانی خواوە خاوێنییەکی زۆرێ گەردو ناتەواوی هات بە دڵدا
واتایەکی جوانی زۆر بێگەردو ناتەواوی هات بە دڵدا
تەختەی دڵمی خاوێن کردەوە وەک ئاوێنەیەک پاک بکرێتەوە
ڕستەی «بلبلی برگ گلی» ئەکاتە سێی صەد و پەنجا و شەش
لەگەڵ سێ وشەی (حسین) و (حسن) و (علی) هاوسەنگە.

این چنین جـاری است عـادات حکیم ذو المنن
بهـر ترفـیـع همـان قطب رفـیـع ممتـحن
بـر گـروه اولـیـا بـارد بـلاهـای فـتن
برگ گل سـبـزاست آن دارد نشـانی از حـسـن
چونکه در روز وفـاتش سـبـزی رخـسـار داشت

واتا:
عادەتی خوای خاوەن حیکمەتی بەخشندە وا ڕۆیشتووە
بۆ پایە بەرز کردنی ئەو قوتبە بەرزە تاقی کراوەیە
بەڵا و فیتنە بەسەر دەستەی ئەولیادا ئەبارێ
بەرگی گوڵ سەوزە و نیشانەی (حەسن)ی پێوەیە
چونکە لە ڕۆژی وەفاتی ڕوخساری سەوز هەڵگەڕابوو

این نمیباشد خدا نخواسته آزین و شین
این همی باشد خداوداند پی اسرار بین
آنچه رفت برنسل شاه غازی بدر و حنین
رنگ گل سرخست آن دارد نشانی از حسین
چونکه در حین شهادت سرخیء رخسار داشت

واتا:

خوا خۆی ئەمە لە چاکی و خراپییەوە نییە
خوا خۆی ئەزانێ ئەمە هەمووی لە ڕازەکانی نێوانەوەیە
ئەوەی بەسەر نەوەی غەزاکەری بەدر و حونێندا تێپەڕیوە
ڕەنگی گوڵ سوورە نیشانەی حوسەینی پێوەیە
چونکە لەکاتی شەهید بوونیا ڕوخساری سوور هەڵگەڕابوو

چونکه در عصر سعادت قطب بوده نزد کل
پیش آزین دانسته حالت زان شده مأمور پل
وز معارف نوش کرده از نبی نوشاب مل
بلبلی باشد علی کز فرقت آن هردو گل
واندران برگ و نوا خوش نالهای زار داشت

واتا:

چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا لای هەموان قوتب بووە
لە پێشتردا حاڵەتەکەی زانیوە
لە پێغەمبەریشەوە شەرابی زانستی نۆش کردووە
بولبلەکەیش (عەلی)یە چونکە لەبەر جیابوونەوەی لە و جووتە گوڵەی
ناڵە و هاواری زۆر خۆش هەبو لەناو ئەو گەلا و ئاوازانەدا

صد هزاران رحمت حق باد برجان رضا
بس بەوالله پیمبر شافعش روز جزا
من ز ایمان کرده ام از جان حب مرتضی
من نهانی گویم این تخمیس از بهر رضا
تا بدانندش (رضا) ایمان بسی انوار داشت

واتا:
سەد هەزار ڕەحمەت لە گیانی (ڕضا) بێ
تەنها پێغەمبەر تکاکاری بێ لای خودا لە ڕۆژ سزادانەوە
من لە باوەڕی خۆمەوە بە گیانی خۆشەویستیی (عەلی)م کردووە
من بە نهێنی ئەم پێنج خشتەکییە بۆ ڕەزامەندیی ئەڵێم
تا بزانن (ڕەزا) باوەڕی زۆر ڕۆشن بووە.

***

## مەدحی حوسامولمولک لە پێنجەیەک لەسەر شیعری حافظ

لە مەدحی حوسامولمولک، شێخ ڕەزا بەو هیوایەیە کە قسەکانی بگاتە شا کە دەڵێت:

من اگـر روان نسـازم به پیـمـبـر صـبـارا
بحـسـام ملک و مللت کـه ترحـمی خـدارا
ز مـقـربان خـاقـان کـه شـود وسـیله مـارا
بملازمـان سلطان کـه رسـاند این دعـارا
کـه بشکر پادشـاهی ز نظر مـران گـدارا

واتا:
من ئەگەر بە پەیامبەری بادی سەبادا
هەواڵ نەنێرم بۆ (حسام الملك والملة) کە
کێ لە نزیکانی خاقان ئەبێ بە هۆ بۆ ئێمە
ئەم پاڕانەوەیە بگەیەنێ بە نزیکانی خاقان
کە لە سوپاسی پادشاییتدا گەدا لە بیری خۆت مەبەرەوە

مـن اگـرچی بینـوایم، تـو وزیر پادشـاهی
من اگـرچی در حـضـیـضم، تو بر اوج مـهـرومـاهی
ز مـیـان مـا تفـاوت زمـه است تا بماهی
همـه شب دراین امـیـدم کـه نسـیم صـبـحگاهی
بـه پیـام آشـنـائی بـنـوازد آشـنـارا

واتا:
من هەر چەند هەژارم و تۆ وەزیری پادشای

من هەر چەند لە بنی چاڵام و تۆ لە خۆر و مانگدای
لە نێوان ئێمەدا جیاوازی لە مانگەوە تا ماسییەکەی گا بەسەر پشتیەوەیە
هەموو شەوێ بە هیوای ئەوەم شنەبای بەیانیان
بە پەیامی ناشنایی دڵنەواییی ناشنای خۆی بکا

من اگـــر بحکم تقـــدیر شـــده روم جـــایگاهم
بهـــوای ملک ایران بأمـــیـــد قـــرب شـــاهم
شـــده رومـــیـــان زهر ســـو چو رقـــیب سـد راهم
ز رقـــیب دیو ســـیـــرت بخـــدای خـــود پناهم
مگر آن شـــهـــاب ثاقب مـــددی کند ســـهـــارا

واتا:

من ئەگەر بە بڕیاری قەدەر وڵاتی ڕۆم بووە بەجێم
بە هیوای نزیکی لە شاوەم لەبەر ئارەزووی وڵاتی ئێران
ڕومییەکان لەهەر لا وەک دوژمن وان بەسەر ڕێمەوە لێیان گرتووم
پەنام بە خوای خۆم گرتووە لە دوژمنی دێ و ڕەوشت
مەگەر ئەو ئەستێرەی کشاوە (کە ڕەجمی شەیتان ئەکا) یارمەتییێکی ئەم ناچیزە بدا کە وەک ئەستێرەی (سوها)یە.

تو کـه آفـتـاب صـبـحی قـدحت زنور لب ریز
پی زرەهای ناچیـــز کـــرمت وســـیله انگیـــز
ســـحـــری (رضـــای) خـــودرا بدهن نوانهء ریز
بخـدا کـه جـرعـهء ده (بحـافظ) سـحـر خـیـز
کـــه بوقت صـــبـــحگاهی اثری بود دعـــارا

واتا:

تۆ کە خۆری سبەینانی، پیاڵەکەت لێوانلێوە لەنوور
بەخشش هۆ ئەدۆزێتەوە بۆ گەیشتن بەم وردە ناچیزانە
بارانێکی ڕەحمەتی سبەینانی ڕەزامەندیی خۆت بەسەر سەلوتێکی منا بڕێژە
تو خودا قومێ بدە بە حافزی سبەینان لە خەو ڕاپەڕیو
چونکە کاتی سبەینان کاری خۆی ئەکا دۆعا و پاڕانەوە

شێخ ڕەزا، وەکو هەموو ئادەمیزادێک، یەکێکی خۆش دەویست و ڕقی لە یەکێکی تری دەبێتەوە. لە کاتێکدا دەڵێت:

افتخار همه ایران به نظام العلما است
این سخن مظهر تصدیق جمیع حکما است

واتا:

شانازیی هەموو ئێران بە نیزامولعولەماوەیە
ئەم قسەیە دیەنی باوەڕ پێ کردنی هەموو خاوەن وێڵ و کەماڵێکە

لە چوار خشتەیەکدا ئەمەی خوارەوە بە (ابن ملجم) دەڵێت:

نخواهم ملک کیخسرو، نجویم مسند جم را
بنرخ نیم جو نخرم متاع هر دو عالمرا
نگردم روز محشر عهد باشد داخل جنت
بحق شاه مردان تا نگایم (ابن ملجمرا)

واتا:

موڵکی کەیخوسرەوم ناوێ، پایەی جەمشیدم ناوێ
هەموو کەلوپەلی هەردوو دنیا بە نرخی نیو دەنکە جۆ ناکڕم
عەهد بێ ڕۆژی حەشر ناچمە ناو بەهەشت
تا ئیبنو مەلجەم نەگێم، قەسەم بە شاهی مەردان

***

## مەدحی یوونس خانی والیی سنە

شێخانی تاڵەبانی لە ئێراندا، بە تایبەتی لەناوچە و شارەکانی کرماشان و سنە و سابلاغ و موکریان و هەورامان دەروێش و مریدێکی زۆریان هەبوو. شێخ ڕەزا لەبەر ئەوەی شێخ عەلیی کاکی پوست نشینی تەکیەی کەرکووک بوو، دەچێتە سنە و دەیەوێت تەکیەیێک لەوێ دروست بکات، بەڵام بە چی. ئەم شیعرە دەنووسێت بۆ یوونس خانی والیی سنە.

من دراین مملکت روم که بادا ویران
خوار و بدنام شدم همچو عمر در ایران

نه بایران بودم جـــای اقـــامت نه بروم
گـشـتـه ام زیر فلک همـچـو فلک سرگـردان
شـیـخم و نیـست مـراجـای برو تکیـه کنم
نکنم تکیـــه مگر بر کـــرم یوونس خـــان

واتا:

من لەم ولاتی ڕۆمەدا - خوا وێرانی کا -
زەلیل و بەد ناو بووم وەک عومەر چۆن لە ئێرانا زەلیل و بەد ناوە
نە لە ئێران جێم هەیە نیشتەجێ بیم و نە لە ڕۆم
لەژێر ئەم ئاسمانەدا وەک کەشتی سەرگەردانم هەر ڕۆژێ لە جێیەکم
شێخم و جێیەکم نییە پاڵی پێوە بدەم و پشتی پێ ببەستم
پشت بەکەس نابەستم مەگەر بە بەخششی یوونس خان.

***

## شێخ ڕەزا و دەوڵەتی عوسمانی

شێخ ڕەزا لە سەردەمی حوکمی عوسمانی لە کوردستاندا لە دایک بووە و لە دووا ساڵانی ئەو حوکمەدا (١٩١٠) کۆچی دوایی کردووە. سوڵتانی عوسمانی؛ بە ناوی «خەلیفەی ئیسلام» دەستەڵاتی خۆیان بەسەر گەلێک لە وڵاتانی ئیسلام، بە تایبەتی وڵاتانی عەرەب و کورددا کێشاوە. شێوەی حوکمی ئەم سوڵتانانە، حوکمێکی ئۆتۆکراتی، کە دەستووری وڵات دەستەڵاتی سوڵتان بوو و ناوی «امیر المؤمنین»ی لەخۆ دەنا و ئەو حوکمەی بە حوکمی ئیلاهی دەناسرا و هیچ هێزێک نەیدەتوانی سنوورێک بۆ دەستەڵاتی دانێت. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دابەش کرابووە دەیان «ولایەت» کە (والی) دەیبردە ڕێوە و لە سەرووی ئەوانیشەوە سەرلەشکر (میر ئالای) دەیتوانی والی و موتەسەڕیف لابەرێت و یەکێکی تری بۆ دانێت. لەبەر ئەوە یاسایەک نەبوو بۆ پاراستنی مافی ئەمانە، ئەمانیش دەیانەویست بە کەمترین کات خۆیان دەوڵەمەند بکەن و بە هەوەسی خۆیان جۆرەها باجیان دەخستە سەر میللەت و لەدزی و بەرتیل خواردن درێغیان نەدەکرد و بۆ دەمکوت کردنی میللەتیش چەشن چەشن سوپاییان ڕێک دەخست. لە پێشاندا لەشکری دەرەبەگی و لە پاشان «یەنکی چەری» و لە پاشاندا لەشکری نیزامی و بۆ یارمەتیی ئەوانیش، هێزی (ژاندارم = جەندرمە) لە زەمانی حوکمڕانی سوڵتان عەبدولحەمیدیش، لە

کوردستـاندا سوپای (حەمیدییە) لە کوردەکان دانرا، وەکو حەسەن ئاغای زەنگنە لە ناوچەی خانەقین تاکو شارەبان و صالح بەگی نەوتچی لە کەرکووک و حوسێن ئاغا هەمەوەند لە ناوچەی سولەیمانی کرانە (تابور ئاغاسی).

شێخ ڕەزا لە سەرەتای ژیانیدا، وەکو و زۆربەی خەلق، دەوڵەتی عوسمانیی بە پارێزەری وڵاتی ئیسلام دژی گاوران دادەنا. بەڵام وەکو ڕۆشنبیرێک ڕەخنەی لە کەمو کورتی و کردەوە نارەواکانی کاربەدەستانی گرتووە و پەردەی لە ڕوو هەڵماڵیون و لە پاشاندا، نەک تەنها لە کاربەدەستان، بەڵکو لە ڕژێمی ئەو دەوڵەتە و لە سوڵتانیش دەگرێت. لە شیعرەکانی شێخ ڕەزادا، لە سەرەتاوە مەدحێکی زۆر سوڵتان عەبدولعەزیز و سوڵتان عەبدولحەمید ئەکات و بە سێبەری خوا لەسەر ئەرز دادەنێ و لەپاشان کە هاتوچۆی ئەستەموول ئەکا و لەگەڵ گەلێک لە ڕۆشنبیرانی کورد و تورک ناسیاوی و پێوەندی پەیدا ئەکات، دەس دەکاتە ڕەخنە گرتن و لە پاشان هەجو و لەعنەت لێ کردنیان.

ئەم گۆڕانکارییانە هاوکاتن لەگەڵ گۆڕانکاریی بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی وڵات و دەرکەوتنی هەست و بیروباوەڕی نوێی ئەو سەردەمە.

شێخ ڕەزا لەم شیعرە تورکییەدا لە سەرەتای ژیانیدا مەدحی سوڵتان عەبدولعەزیز ئەکات. سوڵتان عەبدولعەزیز؛ هەر چەنێک ویستی هەندێ ئیسلاحات لە ئیمپراتووریەتی عوسمانیدا بکات، بەڵام بووە هۆی پامال کردنی سامانی دەوڵەت و جیابوونەوەی ڕۆمانیا و صرب و بولغارستان و مصر. شێخ ڕەزا دەڵێت:

کـــردم بکار نامـــەء شـــاهان بسی نگاه
برهم زدم جـــریدەء این کـــهنە کـــار گـــاه
از حـــال خـــسروان زمـــان جـــستم آگـــهی
انان کـــە بوودە اند خـــداوند دســـتگاه

واتا:

سەیرێکی زۆری کارنامەی پادشاهانم کردووە
دەفتەری ئەم کارگا کۆنەی دونیام پەڕە پەڕە کردووەتەوە
بە دوای هەواڵی پادشاهانی جیهاندا گەڕاوم
ئەوانەی کە خاوەن بارەگا بوون

ســاســانیـــان بحکمت و ســامـــانیـــان بملک

عـبـاسـيـان بدولت و سلجـوقـيـان بجـاه

هر چند خـواسـتم كـه بيـايم نيـا فـتم

شـاهى بفـر و دولت (عـبـدالعـزيز شـاه)

واتا:

ساسانيان به حيكمەت و سامانيان به دارايى

عەبباسيان به دەوڵەت و سەلجوقيان به پايه و پله

هەرچەند ويستم بيدۆزمەوە نەمدۆزييەوە

شاهێ لە شان و شكۆى دەوڵەتى سوڵتان عەبدولعەزيزدا بێ.

چشم سـپـهـر و ديده‌ء دوران نديده است

شـاهنشـهى بدين حـشم و لشكر و سـپـاه

اين تخت واين اسـاس واين گنج واين گـهـر

وين تاج و تخت واين علم و چتـر و بارگـاه

واتا:

چاوى ئاسمان و ديدەى زەمانە نەيديوە

شاهنشايێ ئەوەندە دەستو دائيرە و لەشكر و سوپاى بێ

ئەم تەختە و ئەم بنەڕەتە و ئەم گەنجە و ئەم گەوهەرە

ئەم تەخت وتاجەو ئەم بەيداخ و چەتر و بارەگايە

اين لشكر نظام كـه كـوكـرده گـوش چرخ

از ناله‌ء نفـيـر بهـر شـام و صـبـحگاه

خـورشـيـد سـايه گـسـتـر و جـمـشـيـد تاجـور

داراى بـنـده پـرور و سـلـطـان ديـن پـنـاه

واتا:

ئەم سوپاى ڕێک و پێک و نيزامييە كە گوێى چەرخى گەردوونى كەڕ كردووە

بە هۆى ناڵەى بووقييەوە ئێواران و بەيانيان

وەک خۆر سێبەرى بۆ هەمو و لايێ كردووە وەک جەمشيد خاوەنى تاج.

وەک داراى بەندە پەروەررو، سوڵتانى پشتوپەناى ئايينە

فـــخـــر دول، مـــلاذ ملـل، مـــايهء أمـل

ظل خـــدا، امـــام هدى، ســـايهء الاه

مـــيگفـــتم از ســتـــايش او شــمـــهء ولى

يـاراى هـركـس نبـــود مـــدح پادشـــاه

واتا:

شانازی دەوڵەتانە، پەنای گەلانە، مایەی هیوایە

سایەی خودایە پێشەوای ڕێنموونییە، سێبەری خودایە

ئەمویست چەردەیێ باسی ئەو بکەم و بە شان و باڵیا هەڵدەم

بەڵام لە توانای هەموو کەسێکا نییە تاریفی پادشا بکا

كى دارد احـــتـــيـــاج بتـــعـــريف چون منى

بسط جـــلال شـــه كـــه زمـــاهيـــست تا بماه

خـــواهم يكى مـــســـاعـــده از طبع تا دهم

داد ســـخن بمدحت دســـتـــور پادشـــاه

واتا:

کەی پێویستی بە تاریف کردنی کەسێکی وەک منە

بەربلاویی شان و شکۆی پادشا کە لە مانگەوە تا گا و ماهی گرتووە

ئەمەوێ سروشتم یارمەتیم بدا

تا ڕازی قسە بێنمە سەر تاریفی وەزیری شا

صـــدرى كـــه گـــر تلافى وافى نميـــشـــدى

دولت خـــراب گـــشـــتى و ملت شـــدى پناه

مـــحـــمـــود نديم پاشـــا صـــدرى كـــه بر درش

كـــرداست چرخ، قـــامت تعظيـــمـــرا دوتاه

واتا:

سەرەک وەزیرێ کە ئەگەر نەبوایە بە چارەسازی بەشکەری،

وڵات وێران ئەبوو و میللەت لەناو ئەچوو

مەحموود نەدیم پاشا ئەو سەرەک وەزیری لەبەر دەرگایا

چەرخی گەردوون باڵای خۆی نوشتاندووەتەوە بۆ دووبارە تەعظیم کردنی

یەک یەک بەدست و بازوئی زرین ببـــــست
هر رخنەء کــــە یامـــتــــە ببنیـــاد ملک راه
دم درکش ای (رضـــا) کـــە ندارند نســـبــتی
دریاؤ قطره، ذره و خـــورشـــیـــد و کـــوه و کـــاه

واتا:

بە دەست و بازووی بیرورای سەنگینی خۆی
یەکە یەکە هەموو ئەو کون و کەلەبەرانەی گرتووە کە ڕێیان کەوتووەتە بنیادیی دەوڵەت
دەمی خۆت بگرە (ڕەزا) چونکە بەراورد ناکرێن بە یەک:
دەریا و دڵۆپ و، تۆزقاڵ و خۆرو، کێو و کا.

***

## شێخ ڕەزا و سوڵتان عەبدولحەمید

زۆربەی ژیانی شێخ ڕەزا لە سەردەمی حوکمڕانیی سوڵتان عەبدولحەمید بوو. سوڵتان بۆ چەسپاندنی (دەستەڵاتی ئیلاهی)ی خۆی، پیاوانی ئایین پەرست و شێخانی ڕێبازی دەروێشی و مەلاکانی لە خۆی نزیک ئەکردەوە و چاوەدێریی مزگەت و تەکیە و خانەقاکانی دەکرد، لەبەرئەوە پیاوانی ئایین بە چاوی پارێزەری وڵاتی ئیسلام تەماشای سوڵتان عەبدولحەمیدیان ئەکرد.

شێخ ڕەزا، لە سەرەتای ژیانیدا، هەر بەو هەستە تەماشای سوڵتانی دەکرد و لەم شیعرە تورکییەدا مەدحی سوڵتان عەبدولحەمید ئەکات و ئەڵێت:

ســریر سلطنت ملک الیـــمن آل عـــوســـمـــاندر
خـلافت خـاندان پروەردە (عـبـدالحـمـیـد خـان) در
وکـــــیـل فـــــخـــــر عـــــالم، زبدەء ذریت آدم
امـیـــر المؤمنین، ظل خـــدا، مـــحـــبـــوبی یزداندر

واتا:

شکۆی پادشاهی تەختی شاهیی ئالی عوسمانە
پەروەردەی خانەدانی خەلافەت عەبدولحەمید خانە
جێنشینی پێغەمبەر، زوبدەی نەوەی ئادەم
میری موسڵمانان و سێبەری خودا و خۆشەویستی یەزدانە

بیلنمــز هیــئت شــاهانەسی عکس تجــلادن
ملکدر، یا ملک شــاه جــهــان، یا مــاه تاباندر
خــرد مندانده عـــاجــز عــقل کل قـــاصـــر
زه اندیشـــه باغلو قـــوهء ادراکـــه حـــیـــراندر

واتا:

لە عەکسی جلوە کردندا نازانرێت هەیئەتی شاهانەی
فریشتەیە یا مەلیکی شای جیهان یان مانگی تابانە
هۆشمەندان پەک کەوتووە عەقڵی هەموو قاصر
بە پێی بیرکردنەوە بەستراوە، هێزی لە تێگەیشتنی سەرسامە.

الندە کـاسـەء شـمس و قـمـر دەرگـاهنە قـارشـو
بوکلمش صـانکە گـردون بر گـدای کـاسـە گـرداندر
باصـوب ناف زمینە، عـرشە چیـقمش تخت اجلالی
دگل باد اوزرە دوران ایلیـــان تخت سلیـــمـــاندر

واتا:

ئەوەی کاسەی خۆر و مانگی بەدەستەوەیە بەرامبەر دەرگای ئەو
قەمچ بووە وەکوو گەردوون گەدایەکی کاسە هەڵگرە
تەخت شکۆی کوتراوەتە ناوکی زەوی شکۆی گەیشتووەتەر عەرشی ئاسمان
دەڵێی تەختی سولەیانە بەسەر هەوادا دەسوورێتەوە

بـولنمـــز گلش عـــصـــرندە غـــمـــدن دیدەء گـریان
نســـــیم رأفـــتندن گل گـــبی بلبلدە خنداندر
اوگوندن کیم ایشـتـمش صیت عدلک چرخ دون پرور
بنملە ایتـدیکی جـورو جـفـالردن پشـــیـمـــاندر

واتا:

لە عەصری شادیدا، چاوی گریانی غەم نابینرێت
لە شنەبای دڵ نەرمیدا، بولبولیش وەکوو گوڵ پێدەکەنێت
لەو ڕۆژەوە ئەوەی بیستوویەتی ناوی عەدلت، چەرخی ناکەسان
لەو جەور و جەفایەی کە لەگەڵ مندا کردوویەتی پەشیمانە.

یقـه قــورتارمق ایســتــر پنجـهء قــانون عـدلکدن
انکچـون گـاه یر آلتنده، گـاه ابر ایچـره پنهــاندر
ینه چیـقـمـاز او شـاهک عـهـدهء مـدح و ثناسندن
(رضــا) گـر فی المثل فن سـخندانیـده حســاندر

واتا:

له چنگی یاسای عەدلت دەیەوێت یاخه ڕزگار کات،
لەبەرئەوە دەمێک لەژێر ئەرز و دەمێک لە ناوی هەوردا شاراوەیە
دیسان لە عەهدەی مەدح و سوپاسی ئەو شایە دەرناچێت،
ڕەزا ئەگەر لە هونەری قسەزانیدا بێتە (حەسـان)

همــیــشـــه تاقــمــر رونق فــزای طارم خـضــرا
همــیــشـــه تا(زحل) آرایش ایوان کــیــواندر
الهی بر قـــرار اولــــون عـــافــیت اوزره
وجـود پادشـاه عـصـرمـز کیم جـود و احســاندر

واتا:

هەمیشە تا وەکو مانگ ڕەونەق ئەداتە ئاسمانی شین
هەمیشە تا (زحل) ئەیوانی گێتی ئەڕازێنێتەوە
خودایا هەر پایەدار بێ بە لەش ساغییەوە
هەبوونی پادشای سـەردەمی ئێمە کە ئەو هەم سەخاوەت و هەم چاکەیە.

لە مەدحێکی تری سولتان عەبدولحەمید: شێخ ڕەزا لە دوا بەیتەکەی شیعرێکی تری تورکیدا، خۆی بە سولتان دەناسێنێت کە سولتان ڕێزێکی زۆری بەرامبەر شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی هەبوو و دەڵێت:

(قـل هو الله احــد) حــرز ســرمــاه افــســرک
مــست صــهــبــای (ألم نشــرح) دل دانشــورک
مـــســـتـــشــار عــقل او همــدمک (روح الأمین)
دســتگیــرک فــیض اقــدس (اسم اعظم) یا ورک

واتا:

(قل هو الله احد) مایەی ئاسایشی گەنجینەی تاجت

مەستی شەرابی (الم نشرح) دڵی دانات
عەقل یەکەم پرس پێکەرت و هاودەمت (روح الامین)
فەیض ئەقدەس دەستگیرت (اسم اعظم) یا وەرت

تاج و تختک تا ابد محفوظ (الله الصمد)
(آیة الكرسي) مدد (انا فتحنا) رهبرک
ریزه سنک آستانک دره‌ء تاج الملوک
قرة العین سلاطین خاکپای انورک

واتا:

تاج و تەختت تا ئەبەد پارێزگاری (الله صمد)ە
(آیة الكرسي) یارمەتیدەرت (انا فتحنا) رەهبەرت
وردە بەردی بەردەرگات دوڕی تاجی شاهانە
خاکپای نوورانیت (قرة العین)ی شاهان

برجهان کفاره قارشو، غمزه‌ء خوبان گبی
صف چکوب آماده‌ء هیجا سپاه صفدرک
تاج و تخت دولت یونان دل عاشق گبی
سینه چاک ناخن سم سمند عسکرک

واتا:

بەرامبەر جیهانێکی گاوران وەکو چاو هەڵتەکاندنی جوانان
سوپای دلێرت ڕیزی بەست ئامادەی جەنگە
تاج و تەختی دەوڵەتی یونان وەکو دڵی عاشق
سینەی قڵیشاوە لەبەر سمی ئەسپی سەربازتا

جوهر فردن وجودی یوق دیەن جاهل دگل
نص قاطعدر بو دعوی اوزره نوک خنجرک
عرشه آصمه قورقارم عرشی ده ایتسون رخنه‌دار
جوهر فرد کیان تیغ ثریا جوهرک

واتا:

ئەو کەسەی بڵێت جەوهەری فەرد وجودی نییە نەزان نییە

نووکی خەنجەرت ئەم داوایە بە یەکجار دەبڕێتەوە
بە عەرشا مەیکەرە دارا ئەترسم عەرش بریندار کات
تیغەکەت کە گەوهەری تاقانەیە و لە گەوهەری(ثورەییا)یە

هدهد شـــاهد (ســـبـــأ) و ســـایەء بال هـمـــا
یـا دەم بـاد صـــــبـــــــادر رخـش آهـو پـیـکـرن
جـــانشین فـــخـــر عـــالمسک عـــجب می اولســـەلر
(جم) قـولـک (کی) بنده (خـاقـان) کـوله (کـسـرا) چاکـرن

واتا:

هود هودی (سبأ) دۆزەرەوەیە یا سێبەری باڵی (هوما)یە
باوەشێن بای صەبایە ڕەخشی ئاسکە ئاسات؟
ئایا سەیرە، کە جێنشینی فەخری جیهانی
(جم) کۆیلەت، (کەی) بەندەت، (خاقان) عەبدت و (کسرا) نۆکەرت بن؟!

حی قـــائمله حـــسـابی بر گلور (عـــبـدالحـمـــیـد)
چوق دوام ایـتـسـون گـرک ذات عـدالت گـسـتـرک
مـرحـمت کـارا، سلیـمـان حـشـمـتـا، شاهنشـهـا
ای (رضـــا) لـب تشنەء احـــســـان عـــالم پرورک

واتا:

ژمارەی (حی قائم ١٧٠) لەگەڵ ژمارەی (عەبدالحمید ١٦٩) یەک دەگرن
بۆیە دەبێ ذاتی داورتان زۆر بژین
بەزەیی کارا، سولەیمان پایە، شاهی شاهان
ئەی (ڕەزا)ی لێو تینووی چاکەی عالەم پەروەری ئەو

شـفـقـت ملت نوازک صـورصـه کـیـمـدر بو (رضـا)
(طالبـانی) (عـبـدالرحـمن) زاده مـوری احـقـرک
مــــهــــرمــــاه اولدقـــچـــه روز و شب تابان اوله
اوج بـرج سلـطنتــــــده آفــــتـــــابی منظرک

واتا:

دلسوزی گەل نەوازتان گەر بپرسێ کێیە ئەم ڕەزایەم

ئەم مێرووله هیچ و پووچه کوڕی عەبدولرەحمانی تاڵەبانییه
تا خۆر و مانگ و ڕۆژ و شەو هەیە و هەر شەوق دەداتەوە
خۆری ڕووتان لە کەشکەڵانی کەلوو کونگەرەی شاهییا

سوڵتان عەبدولحەمید بۆ ڕاکێشانی دڵی موسڵمانان لە ئاوەدان کردنەوەی تەکیە و مزگەوت و جێی خواپەرستی دریغیی نەدەکرد. لەبەرئەوە به فەرمانی ئەو جێگایەکی لایەق بۆ (بەرماڵی پێغەمبەر) کە لەژێر چاوەدێریی بەرەی (خادم السجادە) لە کەرکووک دروست کراوە. شێخ ڕەزا لە سوپاسدا لە شیعرێکی تورکیدا دەڵێت:

پادشاه آل عوسمان، یعنی خان (عبدالحمید)
قابل انکار دگل احسان فوق العاده سی
پادشاه انبیایی مس ایدەن سجادەیە
گورمادی لایق زیارتخانهء معتاده سی
بر زیارتخانهء شاهانه انشا قیلدیلر
آسمان دوردقچه دورسن شاه ایله شهزادەسی

واتا:

پادشای خانەدانی عوسمانی، یانی خان عەبدولحەمید
چاکەی لە عادەت بە دەری قەد ئینکار ناکرێت
بۆ ئەوانەی دەس لە بەرماڵی پادشای پێغەمبەران دەدەن
ئەو زیارەتگایەی ئێستای بە لایەق نەدی
زیارەتگایەکی شاهانەی بۆ دروست کرد
تاکو ئاسمان هەیە بمێنێت شاه و شازادەی

بۆ ڕوونکردنەوەی مێژووی دروستکردنی زیارەتگای بەرماڵی پێغەمبەر، شێخ ڕەزا لە دوا بەیتی ئەم شیعرە تورکییەدا، لەسەر ژمارەی (ئەبجەدی) دەری دەخات کە لە ۱۳۰۳ی کۆچیدا دروست کراوە.

دولسون همیشه جیب همایون پادشاه
کیم جود (معن)ی (حاتم)ی افسانەیا پدیلر
سجادهء شریفەیە عبدالحمید خان
پک منتظم عمارت شاهانه یاپدیلر

مــركــز جــهــانه كلمــدی مــانندی بر فلک
هر كــاری یاپدیلرســه ملوكــانه یاپدیلر
تـاریـخـی مـطـابـق واقـع دیـدی (رضـــا)
«سـجـادهء پیـغـمـبـر» «ایچـون» خـانه یا پدیلر

واتا:

هەر پڕ بێ گیرفانی پیرۆزی پادشاه
كە بەخششی (معن)و(حاتم)یان كردە ئەفسانە
بۆ بەرماڵی بڵند پایە عەبدولحەمیدخان
ساختمانێكی زۆر ڕێک و پێكی شاهانەیان دروست كرد
ئەهاتووە مەڵبەندی جیهانەوە پادشای وا
هەر كارێكی كردووە شایانە كردوویەتی
مێژووی كردنی پڕ بەپڕ دۆزییەوە (ڕەزا)
بۆ سوججادەی پێغەمبەر یانەیان دروست كرد

شێخ ڕەزا كە دەچێتە ئەستەمووڵ و لەگەڵ ڕۆشنبیران و ئەدیبانی كورد و تورک ناسیاوی پەیدا ئەكات، بۆی دەردەكەوێت ئەم سوڵتانە ئەو ئەفسانەیە نییە كە وەكوو ئابیدە، بەبێ ڕەخنە لە گردن لە كردەوەی سەری بۆ دانەوێنن. لەوێدا چاوی كردووەتەوە، تەماشا دەكات ئەم شـانشـینانەی پادشـا لەسـەر لاشـەی هەزاران چەوسـاوەی مـیللەت دامـەزراوە. كاربەدەستانیش بە دزی و بەرتیل خواردن میللەت دەڕووتێننەوە. دەس دەكاتە شكایەت كردن و ڕەخنە گرتن:

قـلـم آلـدم یـازەیم شـــاهە شـكـایـت نـامـــە
دهشـت واقـــعـــەدن چاتلدی نـوک خـــامـــە

واتا:

خامەم گرتە دەس سكالانامە بنووسم بۆ شا
لە تاوی خراپەی باسەكە نووكی قەڵەم شەقی برد

بەو جۆرە كاربەدەستانە دەڵێت:

ایشـی كـورمكدە جـبـان اقـچـە المقـدە جـســور

واتا:

لە كار بەڕێوەبردن ترسنۆک و لە پارە وەرگرتن ئازا

بەڵام بۆی دەردەکەوێت کە دەوڵەت لە سەرەوە بۆگەنە:

بو انواع فـســادک باعــثی، ظن ایتــمــه والیــدر

بالق باشـدن قـوقـار، ضـرب المثل، مـعلوم عـالیـدر

واتا:

ئەم چەشنە فەسادە، وا مەزانە تەنها لە «والی»یەوەیە، وەکو دەڵێن ماسی لە سەرەوە بۆگەن ئەکات.

هەر والییەک دێت لەویتر خراپترە. ئەمانەش لە «باب العالی»یەوە دانراون. کەواتا ئەم باب العالییە «باب السفلی»یە. وەکوو ڤینگ وایە کە گووی لێوە دێ:

نســبــتی یوق باب عــالیــدەن گلن والیــده

بویله بر بوق والی آنجق باب ســفــلادن گلیــر

و لەبەرئەوەی، پادشاە بەڕاست و چەپدا لە قەبی پاشا و بەگ دەبەخشێت، کەریش لە سایەی شاهانەوە، لەقەبێک بۆ خۆی پەیدا دەکات.

عــالمه عــام اولدیغندن التــفــات پادشــاه

خــر دخی بر آد قــزاندی ســایه ء شــاهانەدن

لە پاشا، پەنجەی تاوانباری، بۆ سوڵتان خۆی درێژ دەکات:

دوشـمنه قـارشی کـدی، ملتـه قـارشی اصـلان

لـعنه الله عـلی حــــضــــرت هذا السـلطان

واتا، بەرامبەر دوژمن پشیلە و بەرامبەر میللەت شێرە، لەعنەتی خوا لە حەزرەتی سوڵتان بێت. کەچی ڕەصافی لە پاش چەند ساڵ دوای ئەم دەڵێت: «عـبيد للأجانب هم ولكن على ابناء جلدتهم اسود»

میللەت دەیویست دەستەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید، بەپێی یاسای بنەڕەتی (قانون اساسی) کەم کاتەوە و وای دەزانی کە ئەم یاسایە هەموو. گیروگرفتێکی وڵات چارەسەر ئەکات. بەڵام ئەمە نەبوو. زۆریش هەبوون وایان دەزانی کە دەوڵەت وازی لە (قانونی ئیلاهی) کە قورئانە هێناوە، بۆیە کاروباری میللەت خراپتر بووە. شێخ ڕەزایش لەو باوەڕەدا بوو، کە دەڵێت:

بیــچـاره عـدالت کـه یـیقلمـشـدی بناسی

بردن ایچنه سـجـدی بو قـانون اسـاسی

واتا:

بێچارە عەدالەت کە بیناری ڕووخابوو،

بە یەکجاری، ئەم قانون ئەساسییە گووی تێ کرد.

دیانت مـضـمـحل، دولت بوزق، مللت پریشـاندر

سببی تحقـیـر دین، تأسیس قـانون، ترک قرآن در

واتا:

ئایینی کز، دەوڵەت تێک چوو و میللەت پەرێشانە

لەبەر تەحقیری ئایین و دانانی یاسا و وازهێنان لە قورئانە

میللەت دەیویست دیکتاتورییەتی سوڵتان عەبدولحەمید پامال کات و دەستی بخاتە کۆتی یاسای ئازادی و دیموکرات. شێخ ڕەزا هەر چەنێک دژی حوکمی عەبدولحەمید بوو، بەڵام ڕقیشی لە ئیتحادییەکان بوو، هێرشی دەکردە سەر سوڵتان چونکە گوێی نەدەدایە پەریشانیی میللەت. لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێت:

آسـمـانش آن چنانست و زمـینش آین چنین

چشم عـبـرت برگـشـا و قـدرت حق را ببین

گـرچه از روی زمین را مـالک چیـزی نیم

وز زمین تا آسـمـان (حـمـداً لرب العـالمین)

واتا:

ئاسمانی بەم جۆرەیە و زەمینی بەو جۆرە

چاوی عیبرەت بکەرەوە و توانای خوا ببینە

هەر چەنێک لە ڕووی زەمیندا خاوەنی هیچ نیم

هەر لە زەمینەوە تاکو ئاسمان سوپاس بۆ خوای عالەمین

کـاشی یک روزم بما بین همـایون را دەهند

تا (حـمـید خـان) را بگویم: ای (حـمـیر المؤمنین)

بعـثت تو بر خـلاف بعـثت پیـغـمـبـەر است

(انت مـا ارسلت الا زحـمـة للعـالمین)

واتا:

خۆزگە ڕۆژێ ڕێیان ئەدام ئەچوومە دەرگای شاهانە

تا بە (حەمید خان) بڵێم ئەی (گوێدرێژی موسڵمانان)

ناردنی تۆ بە پێچەوانەی ناردنی پێغەمبەرە

تۆ بۆ هیچ نەنێرراوی بۆ ئەوە نەبێ ئەزیەتی خەڵک بدەی

چونکە سوڵتان خۆی بە خەلیفەی پێغەمبەر (امیر المؤمنین) میری موسڵمانان دادەنا. شێخ ڕەزایش وشەی (امیر) دەکاتە (حمیر) و سوڵتان دەکاتە کەری موسڵمانان.

وەک دەگێڕنەوە، وەزیری ئەوقاف ناردویە بە شوێنی شێخ ڕەزادا و لەسەر ئەم شیعرە بەرپرسیاری بکات. شێخ ڕەزا دەڵێت من نووسیومە (امیر المؤمنین) و (رحمة للعالمین)، ئێمە بە قەڵەمی قامیش دەنووسین. جارجار نووکی لە کاغەز گیر دەبێ (أ) دەبێتە (ح) و مەرەکەب لە نووکی دەپەڕێ و خاڵێک دەکەوێتە سەر (ر) دەبێتە (ز). لەسەر ئەوە مەعاشەکەی دەبڕن، کە دێتەوە لێی دەپرسن چییان لێی کرد؟ دەڵێت (لەت)ێکیان پێوەنام. (ڕەزا) بووم، بووم بە (ڕەزالەت).

***

## داوایەک لە وەزیری ئەوقاف

شێخ ڕەزا (عرضحال)ێک دەنووسێت بۆ وەزیر ئەوقافی دەوڵەتی عوسمانی ئەحمەد موختار، ناڕەزایی خۆی بەرامبەر کاربەدەستانی کەرکووک دەردەبڕێت کە مووچەکەیان بڕیوە. لەم شیعرەدا کە سەرەتاکەی بە تورکی و لە پاشان بە فارسییە تکای ئەوە دەکات کە بە چاوێکی میهرەبانی سەیری داواکەی بکات.

شفاعتله اوقور عرضحالی خونکار

شفاعت است سزاوار احمد مختار

محالی قلب ایدەجک ممکناتی مکتوبه

ایدرسه خامهء معجز طرازنی درکار

تو ابر فضلی و دانش یکی مشاهده کن

بخاک تیره چه گونه است ابر گوهربار

تو آفتاب کمال و آفتاب ببین

چه گــونه برکــشــد این روزهای کم مــقــدار

واتا:

به شەفاعەتەوە عرضحالم ئەخوێنێتەوە خوێنکار
شەفاعەتە شایستەی ئەحمەد موختار
مەحاڵ دەگۆڕێتە ممکنات بە نووسین
ئەگەر قەڵەمی موعجیزاتی بێنێتە کار
تۆ تەماشای هەوای فەضل و دانش بکە
ئەرزی بەدبەخت چۆنە هەوری گەوهەریار
تۆ هەتاوی کەمالی و هەتا و ببینە
کە چۆن ڕۆژانی دونیا ڕووناک ئەکاتەوە

تو سـرو گلشن مـجدی و سـەد سایە راست
علی الخصوص کە وقت گل است فصل بهار
بشــاه عــرضــە گــدایی نمیــرســد یاری
بە جــــور ناظو اوقــــاف مـــــرهم دلزار
اگــر امــیــد نبــاشــد بلطف عــالیــرا
چە گونە گفت (رضا) شعرهای خوش گفتار

واتا:

تۆ سەروی باغی شکۆی، سەروی سێبەر ئەخەیەوە
بە تایبەت کە کاتی گوڵە و فەصلی بەهار
بۆ شا سکاڵای پیاوی هەژار ناگات
بە جۆرێ وەزیری ئەوقاف مەلهەمە بۆ دڵی نەخۆش
ئەگەر ئومێدم نەبێت بە لوتفی پایە بەرزتان
چۆن (ڕەزا) شیعری خۆش گوفتار دەڵێت.

***

## مەدحی کەمالی پاشای موتەسەڕیفی کەرکووک

لە دەورانی پێشووی دەوڵەتی عوسمانیدا، کەرکووک ناوچەی ویلایەتی شارەزوور بوو. بەڵام لە دابەش کردنی ساڵانی دوواییدا، کەرکووک دەبێتە ناوچەی لیوای سەر بە

ویلایەتی مووصڵ و لە لایەن موتەسەڕفێکی تورکەوە دەبرایە ڕێوە.

شێخ ڕەزا لەم شیعرە فارسییەدا هەم بەخێرهاتنی کەمالی پاشای موتەسەڕیف ئەکا و هەمیش لە دوا بەیتەکەیدا، کە بە تورکییە مێژووی هاتنی لەسەر ژمارە تیپی ئەبجەدی ڕوون دەکاتەوە.

سالها از سر اخلاصی دعا میکردم
که خدا یا گره أزکار ضعیفان بگشا
متصرف بفرست اهل دلیران، توی
متصرف بهمه کون و مکان کیف بشا
مژدهء آمدن آصف ثانی چو رسید
شاعران جمله فتادند بفکر انشا
ارایوب بولدی (رضا) تام اولەرق تاریخی
(گلدی کرکوکه سلامتله کمالی پاشا)

واتا:

ساڵەهابوو لە ڕووی دڵسۆزییەوە لە خوا ئەپاڕامەوە
خوایە گرێ و ئاڵۆزیی کاری هەژاران بکەرەوە
موتەسەڕیفێ بنێرە لە قارەمانان چونکە تۆی
تەسەڕوف لە هەموو جیهانا ئەکەی بە ئارەزووی خۆت
کە مژدەی هاتنی ئاسەفی دووهەم گەیشت
شاعیران هەموو کەوتنە بیری شیعری دانانەوە

لە شیعرێکی تری فارسیدا، شێخ ڕەزا گلەیی حاڵی خۆی دەکات. چونکە نە لە موتەسەڕیف و نە لە والی و نە لەمالیە و نەیش لە ئەوقاف و نەیش لە سوڵتانەوە هیچی دەس نەکەوتووە و لە دواییدا داوا لە کەمالی پاشا دەکات کە مووچەکەی بداتێ:

دلم از غصه پر و کیسه ام از زر خالی
نه عطا از متصرف، نه کرم از والی
نهز مالیه اعانت، نهز اوقاف مدد
نهز مابین همایون نه ز باب عالی

قلبــهء اهل كـــمــال است كــمـــالى پاشـــا
(من جـمـيع الوزراء غـيـر كـمـالى مـالى)
داعـــيـــانرا بنود طاقت تأخـيــر مـــعـــاش
بنگر برســـر احـــوال پريشـــــان حـــالى

واتا:

دڵم پڕه له خهفهت و كيسهكهم خاڵييه له زێڕ
نه بهخششم له موتهسهڕيفهوه ديوهو، نه دهس بڵاوى له والييهوه
نه يارمهتييهک له داراييهوه و، نهفرياكهوتنێ له ئهوقافهوه
نه له دهربارى هومايوونييهوه و، نه له قاپيى بهرزى ئاستانهوه
قبيلهى ئههلى كهماڵه كهمالى پاشا
له ههموو وهزيرهكانا له (كهمالى) به و لاوهم نييه
دوعا گۆيان تهحهمولى دواكهوتنى مانگانهيان ناكهن
سهرنجێكى ئهحواڵى پهرێشان حاڵێ بده بزانه چهند سهخته

***

## سهردانى واليى مووسڵ بۆ كهركووک

له سـهردهمى حـوكمى عوسـمـانيـدا ئهيالهتى شـارهزوور ههمـوو كـوردسـتـانى خـوارووى دهگرتهوه و كـهركووكيش (موتهسهلليمى)يهى ئهم ئهيالهته بوو. بهڵام له پاش شكسـتى لهشكرى عـوسمـانى له نزيكى (ڤييهننا)ى پايتهختى نهمسا، سوڵتان مهحموودى دووهم بڕيارى دا ڕژێمى دهرهبهگيى سهربازى پامـاڵ بكات و سوپايهكى نوێ به ناوى (يهنگى چهرى) دروست بكات و مـيرنشـينانى كـوردسـتـانيـان يهک له پاش يهک لهناو برد و كهركووكيشيان له شارهزوور جياكردهوه و يهكانسهر بهسترايه ويلايهتى مووسڵهوه و ميرنشينيى بابان له سولهيمانيش بهسترايه وويلايهتى بهغداوه.

واليى مووسڵ له سهردانێكى بۆ ليوا كهركووک، شێخ ڕهزا له كاتى پێشوازى كردنى ئهم پارچه شيعره فارسييه دهڵێت:

خــوابه ديدم دوش كــز مــغــرب بر آمــد آفـــتــاب
چيــست؟! گـفــتم اى عــجب تعـبـيــر خــواب
ناگــهــان از ســمت مــوصل عــازم كـركـوک شـد

آفـــتـــاب عـــالم آرا والی عـــالی جناب
چون شنیـدم این خـبـر از مـهـر تبـریک قـدوم
ره نـورد بـاد یـارا پـانـهـــــادم در رکـــــاب
تیـــز رفـــتـــاری چو عـــزم عـــالم بالا کند
ره بمنزل مـــیـــبـرد پیش از دعـای مـــســتـجـاب

واتا:

دوێنێ شەو لە خەوما دیم ڕۆژ لە ڕۆژئاوا هەڵاتبوو
سوبەینێ وتم: سەیرە! ئەبێ لێکدانەوەی ئەم خەوە چی بێت؟
لە پڕ لەلای مووسڵەوە کەوتە ڕێ بۆ کەرکووک
خۆری عالەم ڕازێنەوە، والیی پایە بڵند.
کە هەواڵم بیست، بۆ پێ و قدوومی خەیری،
پێم نایە ئاوزەنگی بۆ برینی ڕێ بە پەلەپەل
توند ڕەفتارێ کە نیازی جیهانی سەرەوەی هەبێ
بەر لە قەبووڵی دۆعا دەگاتە مەنزل.

برق کـــرداری چ و از بالا جـــهـــد ســوی نشـیب
بهـر صـیـدی از هوا گـوئی فـرود آمـد عـقـاب
یک دو فـرسخ ره باســتــقــبـال بیـرون ناخـتـم
خـیـمــهـا دیدم زهر جـانب طناب اندر طناب
دشت گـفـتی قلزم است و جـسـتـخـیـز و خلق مـوج
در مـیـان مـوج مـردم خـیـمـهـا همـچـون حـبـاب
باز بگرفـــتـم عنان تا مـــوکب والی رســـیـــد
در زمـــان کـــردم بســـویٔ مـــوکب والا شـــتـــاب
خـــویشـــرا از خـــانهء زین برزمین انداخـــتـم
جـــبـــهـــهء تعظیم را صـد جـا نهـادم بر تراب
آصف خـــاکی نهـــادم چون فـــراز خـــاک دید
کـــرد در ســاعـت ســر افـرازم بـه توجـیـه خطاب

واتا:
کەسێکی کردار وەک بروسکە کە لەسەرەوە بفڕێ بۆ خوارەوە
وەک بڵێی هەڵۆ لەئاسمانەوە دائەچۆڕێ بۆ نەچیرێ
یەک دوو فەرسەخ ڕێ غارم دا بۆ دەرەوە بۆ پێشوازی
چەندان خێوەتم دی لە هەر لایەکەوە تەناف بە تەناف هەڵدرابوون
دەشتەکەی لە حەشامات بوو بوو بە دەریا خەلق شەپۆلی ئەدا.
دەوارەکانیش لەناو شەپۆلی خەلقا وەک بڵقی سەر ئاو بوو
دیسان لەغاوەکەم گرت تا کەژاوەی والی گەیشتە بەرەوە
ئیتر گورج ڕام کرد بۆ لای کەژاوەی بالای
لە زینی ولاغەکەمەوە خۆم فڕێ دایە زەوی
تەوێلی ڕێز لێ گرتنم صەد جار خستە سەرخاک
ئاسەفی خاکی تەبیعەت کە بەر خۆڵەکەوە دیی
گورج بەوەی ڕووی گفتوگۆی کردمێ سەربەرزی کردم

آمـــد از روی تواضع بامن اندر گـــفـــتـــوگـــو
گـــرم گـــرم آزوی ســـؤال و نرم نرم از من جـــواب
تا شـدم یک بارەگی سـرمـست صـهبـای حـضـور
عندلیب آســـا دریدم پرده ٔ شـــرم حـــجـــاب
کـــــردم آغـــــاز ثـنـا خـــــوانی بآواز بلند
وز جـــمـــال شـــاهد مـــعـنی برافگندم نقـــاب
خـیـر مـقـدم مـرحـبـا ای خـسـرو مـالک رقـاب
ملک و ملت شـد بتـشـریف قـدومت فـیـضـیـاب
هم ز شـــادی قـــدوم تست آخـــر این همـــه
خنده ٔ برق و صـــدای رعـــد و شـــاباش ســـحـــاب
بر زبـان گـــرمی براند نام عـــزمت تـا خـــدا
مـــیـــرود بی امـــتنان بادبان گـــشـــتی بر آب

واتا:
لە ڕووی تەوازوعەوە لەگەڵما کەوتە گفتوگۆ

ئەو گەرم گەرم پرسیاری لێ ئەکردم منیش نەرم نەرم وەڵامم ئەدایەوە.
تا بە یەکجاری مەستی شەرابی حوزووری بووم
وەک بولبول پەردەی شەرمم دڕی
بە دەنگی بەرز دەستم کرد بە تاریف کردنی
لەبەر جوانیاری مانای وتەکانی پەردەم لادا کەوتمە دوان، وتم
مەرحەبا بەخێر بێت ئەو پاشایەی خاوەنی گەردنی ئێمەیە
موڵک و میللەت بە تەشریف هێنانی ئێوە فەیزیاب بوون
ئاخر لە خۆشی هاتنی ئێوەیە ئەم هەموو
پێکەنینی بروسکە و گرمەی هەور و بارانی شاباشی هەورە
ئەگەر کەشتییەوان ناوی هێزی ئێوە بێنێ بەسەر زمانیا
بێ منەتی بایەوان کەشتی بەسەر ئاودا ئەڕوات

کــاری عــاقل نیــست رفتن بر خــلاف رأی تو
خــویشــرا رســوا کند دیوانهء جنت مــآب
در ولایت بعــد از این حــادث نکردد فــتنهء
تاتو باشی و فــهــیم پاشــا ترا نائب مناب
بعــد از این از دور عــقــرب بنودم اندیشــهء
چون بدیدم اقــتــزان مــاهرا بر آفــتــاب
اقــتــران این دو نیــر مــایهء آســایش است
من چنین فــالی زدم (والله اعلم بالصــواب)
از خــدا خــواهم کــه دارد درجــهــان این هردورا
بر قــرار و پایەدار و کــامکار و کــامــیــاب

واتا:
کاری پیاوی عاقل نییە بە پێچەوانەی رای تۆ بجووڵێتەوەو
دێوانەی سەرەنجام شێتی خۆی ڕسوا بکا
لە وڵاتان بەوەیش ڕوونادا هیچ ئاژاوە و هەرایێ
تا تۆ هەبیت و فەهیم پاشا جێنشینی تۆ بێت
پاش ئەمە ترسم لە سووڕانەوەی بورجی (عەقرەب) نییە
کە دیم مانگ و ڕۆژ هاو جووت بوون

هاو جووت بوونی ئەم دوو ئەستێرەیە مایەی ئاسایشە
من ڕەملێکی وام لێدا، خوا خۆیشی ئەزانێ چی ڕاستە
لە خوام ئەوێ ڕێکی لە جیهانا ئەم دووە
بەر قەرار و پایەدار و بە مراز گەیشتوو بکا.

***

## نامەیەک بۆ عەبدولوەهاب پاشای والیی مووسڵ

شێخ ڕەزا نامەیەکی هەڵبەست بەزوبانی تورکی بۆ عەبدولوەهاب پاشای والیو مووسڵ دەنێرێت، تکای لێ دەکات کە ناسیاوێکی بە (مەئووری باج = قۆڵچی) دامەزرێنێت و دەڵێت:

والیٔ عــالیــجناب ای عــالم آرا آفــتــاب
عــالم آرا آفــتــاب، ای والی عــالینجــبــاب
فــیـضـیــاب اولسم عــجب می لطفکزدن بن دخی؟
بن دخی اولسم عــجب می لطفکزدن فــیـضـیــاب!

واتا:

والیی پایە بڵند، ئەی ڕۆژی جیهان ڕازێنەوە
ئەی ڕۆژی جیهان ڕازێنەوە، ئەی والیی پایە بڵند
ئەگەر نوقمی بەخششی لوتفتان بم عەجیبە؟
عەجیبە گەر منیش نوقمی بەخششی لوتفتان بم؟

مــســتــجــاب ایلر دعــامی حق عــالیکزده حق
حق عــالیکزده ایلر حق دعــامی مــســتــجــاب
بر جــواب احــســان ایدرسک چوق تشکر ایلرم
چوق تشکر ایلرم احــســان ایدرسک بر جــواب

واتا:

دۆعام قەبووڵ ئەکات خودا لە دەرحەقی پایە بڵندیتان
دەرحەقی پایە بڵندیتان خودا دۆعام قەبووڵ ئەکات
ئەگەر وەڵامێک بفەرموون زۆر سوپاستان ئەکەم
زۆر سوپاستان ئەکەم ئەگەر بفەرموون جەواب

کـــامـــیـــاب اولســـون إلهی والی پاشـــا تا أبد
تا ابد اولســـون الهی والی پاشـــا کـــامـــیـــاب
اجـتناب ایـتـمـه (رضـا) دن ایله تحـصـیل رضـا
ایله تحـصـیل رضـا ایـتـمـه (رضـا) دن اجـتناب

واتا:

کامیران بێت خودایه والی پاشا تا ئەبەد
تا ئەبەد ببێت خودایە والی پاشا. کامیران
دوو دڵ مەبە لەوەی لە (ڕەزا) ڕەزامەندی وەرگریت
ڕەزامەندی وەرگرە لە (ڕەزا) مەبە دوو دڵ

قـولچـیلگله بر صـدیقم بویله اولسـون بهـریاب
یا نعم یالا، ثنا خـوانک (رضـــا)یه بر جـواب
اول صـــدیقم هر کـــســـه مـــعلومـــدر اهلیـــتی
حـاشـالله لطفک ایتـــســـون اهل اولانی رد باب

واتا:

هاوڕێیەکم بۆ (قوڵچی)یی وا ببێتە جێ بەخششتان
یان ئا یان نا وەڵامێک بدەرە سوپاس کارت (ڕەزا)
ئەو هاوڕێیەم لەلای هەموو کەسێک دیارە شایستەیی
حاشا، ئەوکەسەی لایقە دەرگای لوتفتانی لێ داخەن

یک قلندر مـــشـــربم ای داور عـــالیـــجناب
آمـــــــر مـطلـق جنـاب اکـــــــرمـکـدر داورا
سن بیلورسن هر کـیـمی ایلرسک ایله انتـخـاب
عـالی شان، عـالی نسب، عـالی همم، عـالی جناب
آصف ثانی ولی النعـــمـــتم عـــبـــدالوهاب

واتا:

ئەواو مەشرەبی دەروێشی ئەی داوەری پایەبەرز
خاوەنی ئەمری موتلەق جەنابی ئەرەمی خۆتە ئەی داوەر
تۆ ئەزانیت هەر کەسێک هەڵبژێریت

پایە بەرز، نەسەب بەرز، هیمەت بەرز، عالی جەناب
ئاصەفی دووەم، خاوەن نیعمەتم عەبدولوەهاب

***

## هەجوی بەهرام پاشا

لە دەوڵەتی عوسمانیدا، لەگەڵ موتەسەڕیفی لیوا فەرماندەیەکی عەسکەریش حوکمڕانیی دەکرد. بەڕێوەبەری لیوا، چاوی لە دەس ئەو قوماندانە بوو. شێخ ڕەزا گەلێک تەقەلا لەگەڵ هەمزە پاشای موتەسەڕیف دەدا کە شێخ مەحەمەدی کوڕی بکاتە مەئمووری ژماردنی ئاژەڵ کە گوزەرانی پێوە بکات، بەڵام نایکا و لە پاش هەجوی ئەم داوا لە بەهرام پاشا دەکات ئەویش گفتی ناداتێ. لەو دەمەدا، کاربەدەستانی عوسمانی، سەرتاپا خەریکی بەرتیل خواردن بوون و، شێخ ڕەزایش ئەم هەلە لە دەست نادات کە دەڵێت:

بو عجل سامری کیم؟ آدی بهرام پاشادر
آنک تصویری الله ایچون جای تماشادر
هنردن، معرفتدن، فهمدن، ادراک و دانشدن
تهی، خالی، مجوف، صانکه برشکل مقوادرا

واتا:

ئەم گوێرەکەی سامرییە کێیە؟ ناوی بارام پاشایە.
تو خوا سەیری وێنەی کەن، جێی تەماشایە
لە هونەر، زانست، تێگەیشتن وئیدراک و دانش
بوش و خالی، وا دەزانی کە مقەوایە

مقوی شکلنه برشی دینور، اما بو عکروتە
نەوار دینسون کە صورتدن مجرد بر هیولادر
قدومی نحسی ملزومی ویران ایتدی ایرانی
دگل ایرانه، ایراندن اویانه دفع اولادر

واتا:

لە شەکلی مقەوواشتێک دەبێ، بەڵام بۆ ئەم عەکرووتە
چی هەیە پێی بڵێت، هەر هیوولایە
هاتنی نەحسی ئێرانی وێران کرد

نەک بۆ ئێران، دەبێت بۆ ئەولای ئێران دەرکرێت

اگــرایلدن ایله ایلر ایســه احــبــابه بر دعــوت
بســاط آرای خـوان نعــمـتی زیتـونله خـورمـادر
تورم ایلمش اشکمــبــهسی باســور ریخندن
گگردکچه و کچه صانورسون صوت ناقوس نصارادر

واتا:

ئەگەر ساڵ بە ساڵ مێوانداریيەکی خۆشەویستانی بکات
سوفرە ئارای نیعمەتی خوانی زەیتوون و خورمایە
کۆمی ئاوە ساوە لەبەر باسووری ڕیخی
کە قرمێنە ئەدات وا دەزانی دەنگی ناقووسی دیانە

نیچـون مطران افندی سیـومەسون (بهرام پاشایی)
کــه ناقــوس دیردن نغــمــه پرواز کلیــســادر
ید اشــراره تسلیم ایلمش اغنام واعــشــاری
لوانک حــاصلی کــاتبلرک بیننده یغــمــادر

واتا:

بۆچ مەتران ئەفەندی (بەهرام پاشا)ی خۆش نەوێت
کە دەنگی ناقووسی (دیر) دێت بۆ کلیسا ڕادەکا
باجی سەرانەی مەڕ و ئەعشاری داوەتە دەس ناکەسان
بەرهەمی لیواکە لە نێوان کاتباندا تالآنییە

بنم مــخـدومی اغنامــه مــەئمـوور ایتــمــدی زیرا
بیلردی لیــره بندن حــاصل اولماز ایش بداوادر
ندامت حـاصل ایتـدم شـمـدی هجـو حـمزه پاشـادن
کــه بو دیوســه نســبت حــمـزه افـلاطون و دانـادر

واتا:

کوڕی منی نە کردە مەئمووری باجی مەڕ و مالآت چونکە
دەیزانی لیرە لە من دەرناچێت کار خراپە
ئێستە لە هەجوی حەمزە پاشا پەشیمان بوومەوە

که حەمزە لە چاو ئەم دەیبووسە ئەفلاطوون و دانایە

***

## هەجوی هەمزە پاشای موتەسەڕیفی کەرکووک

بەرتیل و دزی لە حکومەتی عوسمانیدا بووبووە پیشەی کاربەدەستان هەر کەسێکیان دەکردە کاربەدەست، دەیویست بە زووترین کات گیرفانی پڕکات. هەمزە پاشایەکێکبوو لە و کاربەدەستە بەرتیل خۆرانە. شێخ ڕەزا لە چەند شیعرێک هەجوی ئەکات. لە شیعرێکی تورکی دەڵێت:

تیکدی پالانی خری ایشتـه علی الاستـعجـال
شـرقـدن غـربه خـروج ایلیـهجکدر (دجـال)
بایمال ایتـدی بوتون مللت اسـلامی یـازیق
ای مـسـیحـاء یره ایندرمـه بو دجـاله مـجـال
صـویدی رشـوتله اگـر حـمـزه بنم طائفـهمی
بنده اصـلانم آنی هجـو ایله الحـرب سـجـال
مـتـصـرفـمی اولور حـمـزه گـبی بر ایشک
هر نه ایتـدک سن بزه ایتـدک ای قـحط رجـال

واتا:

به پەلە کورتانی کەری دووری
لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژ ئاوا (دەججال) دەرئەچێت
بە داخەوە هەموو میللەتی ئیسلامی پامال کرد
ئەی مەسیحا لە ئەرزدا ڕێگا مەدەرە ئەم دەججالە
ئەگەر هەمزە بە بەرتیل تایفەی منی ڕووت کردەوە
منیش شێرم بە هەجوی ئەم (الحرب سجال)
کەرێکی وەکوو هەمزە بە موتەسەڕیف ئەبێت؟
هەرچی کراپێمان توو کردت ئەی (قحط رجال)

لە پاشا مزگێنیی بۆ دێنن کە هەمزە پاشا عەزل کراوە. ئەم هەمزە پاشایە دۆستی سەی مەحەمەدی سەی منجوغ* بووە و. شێخ ڕەزایش ئەمەی پێ دەڵێت:

(حـمـزه پاشـا) ایله غـوغـاده ایکن کلدی بشـیـر

کـه بشـارت سنه اوخـائنی عـزل ایتـدی مـشـیـر

ســـاده عـــزلـیله قـنـاعت ایـدمم اول ترسـک

ایدرم مـرگ مـفـاجـات ایله آنی تبـشـیـر

(شـیّخ منجـوغ)* ایله طبـعی اویاجگدر زیرا

منجـوغ ایله بەزنور کلهء اعناق حـمـیـر

* شێخ منجوغ (موورگ) یەکێکە لە شێخانی سەید سەروەر لە کەرکووک

واتا:

ئەو کەسەی لەگەڵ هەمزە پاشادا بووە مزگینیی هێنا

کە مزکێنیت دەدەمێ مشیر ئەو خائینەی لابرد

تەنها بە عەزلی قایل نابم ئەو تەرەسە

ئەمەوێ مزگێنیی مردنی لە ناکاوم بدەنێ

طەبعی لەگەڵ شێخ منجوخ ڕێک دەکەوێت چونکە

موورگ و زەنگوڵە دەکرێتە ملی کەر.

ئەم هەمزە پاشایە، خۆی بە شاعیر دەزانێت و غـەزەلێکی بلاوکردووەتەوە. شێخ ڕەزا ئەمە دەڵێت بە غەزەلەکەی.

نشـــر اولنـدی تزک تـازه گــبی بر غـــزلـک

اول تزکـــدن بیلورم حـــالی یماندر صـــقلک

صـــقلک هر بری جـــاروبی خـــلایه دونەجک

حـــمـــزه بابا بو ایســـه زادهء طبع جـــعلک

واتا:

غەزەلێکتن؛ وەکو و تەپاڵەی تەڕ بلاوکرایەوە

لەو تەپاڵەیەوە دەزانم حالی ریشت چەند خراپە

هەموو تەڵێکی ڕیشت ئەبێتە گسکی ئەدەبخانە

هەمزە بەبا گەر ئەمەبێ ڕچەی طەبعی قالۆنچە ناسات

گیت سنک عزلک ایچون کیمسه تأسف ایدەماز

تا کـوپک وار ایسـه، کـرکـوکـده چوقـدر بدلک
بـو لـواده املـک قـــالماق ایدی یـیلـرجــــه
گـــوتکه قـــویدی فلک رســـتــــهء طول املک

واتا:

برۆ؛ کەس بۆ عەزلی تۆ بەداخەوە نابێت
تاکو صەگ هەبێت، لە کەرکووکدا زۆر هەن جێت بگرنەوە
هیوات وابوو لەم لیوایە ساڵەها بێنیت
فەلەک ڕستەی درێژی هیوای کوتایە قنگت

سنی تـشـــیـــیع ایدرم دیدهء گـــریـان ایله آه
دوشـــمـــدی دامه اول بچـــهء آهو کـــفلک
اوپـرم لـبلـریـنـی اشـک نـدامـت تـوکـــــــرم
او لـب غـنـچـــه دهـن اول پـســـر لب عـــسلک

واتا:

تو بە چاوی گریانەوە بەڕێ ئەخەم آه
ئەو کوڕە کەفەڵ ئاسکەت نەکەوتە داومەوە
لەبی ماچ ئەکەم و ئەشکی پەشیانی دەڕێژم
ئەو لەبە غونچە ڕەنگەی ئەو کوڕەی لەب هەنگوینەت

گـلـردم بـن ده ســــزکـلـه بـیـنـردم ارقـــــهکــــزه
بر ایمش مـــادهلری چونکه جـــمـــیل و جـــملـک
عـزل عـالیکزه ظن ایتـمـه (رضـا) اولدی سـبب
ســـوء کـــردار و فـــســـاد عـــملندر عـــملک

واتا:

دەهاتم منیش لەگەڵتان و سواری پشتان دەبووم
مادەیان یەک بووە چونکە جەمیل و جەمەل
وا مەزانە (ڕضا) بووە هۆی عەزلی جەنابتان
خراپەی کردەوەت و کاری فەسادە کارت

***

## گاڵتەکردن بە عەبدوللا پاشای والیی مووصڵ

ناوچەی پشدەر لەکاتی حوکمی داگیرکەرانی عوسمانییەکان، لەسەر سنووری ئێران و عوسمانی، سەریان بۆ هیچ لایەکیان شۆڕ نەدەکرد. گەلێک هەبوون کە داوایان لە کاربەدەستانی حکومەت دەکرد کە سەر لە بەردە ڕەقەکانی چیای کوردستان نەدات و ڕێگای گفتوگۆ بگرن بۆ ڕێک کەوتن لەگەڵ ئێڵی پشدەر. بەڵام عەبدوللا پاشای والیی مووصڵ وا دەزانێ بە چەند تۆپێک دەتوانێ سەر بە پشدەرییەکان شۆڕ کات و ئەم سەرکەوتنە ئاسانە دەکاتە دەسکەوتێکی خۆی و بەمە نیشان و خەلاتێکی باش وەردەگرێت. بەڵام سەر لە بەردە ڕەقەکانی چیاکانی کوردستان دەدا و بە شکستی و پەشیمانی دەگەڕێتەوە و لەجیاتی نیشان و خەلات، عەزل دەکرێت و شێخ ڕەزا، بەشێوەی مەدح گاڵتەی پێ دەکات.

دامـــان دلیـــرانەی بند کـــمـــر ایتـــدک
کـــوە و کـــمـــر پشـــدری زیر و زبر ایتـــدک
کـــاشـــانەلری اوج ثریا ایلە همـــدوش
بر طائفـــە اشـــراری هم آغـــوش یر ایتـــدک
تـــابـع اولانـــی یـرلـریـنـە ایـلـدک اسـکـان
طاغی قـلانی صـاغـە سـوروب دربدر ایتـدک
خـیـبـر گـبی بر قلعـەء آلمق دکل آســان
اللە ایچـون ای حـضـرت والی هنر ایتـدک

واتا:

چاکی دلێرانەتان کردە پشتتان
چیا و هەردەی پشدەرتان ژێر و زەبەرکرد
قەڵاکانیان لەگەڵ ئەوجی ثورەییا کردە یەک
دەستەیەکی ئەشرارت لەگەڵ ئەرزدا ڕاست کردەوە
ئەوەی مل شۆڕ بوو لە جێی ئەوانت دانا
ئەوەی زۆر داربوو بەرە و ڕاست ڕانێت و دەربەدەرت کرد
زۆر ئاسا نییە قەڵایەکی وەکوو خەیبەر بگرێت
بۆ خوا دەڵێم، ئەی جەنابی والی هونەرت کرد.

صف بستــــهء جنگ ایلدیگک عـــسکر اوگنده
جـولان ایدهرک ملتـهء جـانک سـپـر ایتــدک
قـــیـردک قــوهء طاغــیـــهنک انفنی مکســور
هب آنلری مــــحکوم بـر ادنی نفــر ایتـــدک

واتا:

لەبەردەمی ئەو سەربازانەی کە ڕیزتان کردبوو
جەولانتان دەکرد و قەڵای گیانتان بە سوپەر کرد
لووتی هێزی زۆردارانتان شکاند
هەموو ئەوانت خستە ژێر دەستی نەفەرێک

بیلدرمک ایچـــون سلطنت و شـــان و شکوهی
گـــوش فلک الاطلسی طوپ ایله کـــر ایتــدک
ایرانی دخی آلمق ایدی مــــقــــصــــدک امــــا
انصــافــه یاقــشـمــاز دیو صـرف نظر ایتــدک

واتا:

بۆ ئەوەی شان و شکۆی سەڵتەنەتیان پێ بناسێنیت
گوێی فەلەکی ئەطلەسیت بە تۆپ کەڕ کرد
مەبەست ئەوەبوو ئێرانیش بگریت بەڵام،
ووتت لەگەڵ ئینسافا ناگونجێت، سەرفی نەزەرت کرد

اسلوب حکیـــمــــانه ایشی عــوقــه صـــالوردی
تشــهـیـر سـلاح ایله سـوزی مـخـتـصـر ایتـدک
عـشق اولســون اگـر بویله ایســه دوریه چیـقـمق
چشم ظفـــره جلوه ویران بر ســـفـــر ایتـــدک

واتا:

ئاسلووبی حەکیمانە دەبووە کۆسپ لەبەر کار
بە چەک هەڵکێشان قاڵی قسەت بڕییەوە
ئافەرین ئەگەر وا بێت بۆ دەورییە دەرچوون
سەفەرێکت کرد کە ڕەونەق بداتە چاوی سەرکەوتن

عـــصـــرک گـــيـــدشی منهج عـــدل اوزره دگلدی

فـــتـــحکله آنی رشک زمـــان عـــمـــر ايتـــدک

بر حـــمـله ايله قـــالمادی قـــارشنده مـــبـــارز

ای فـــارس مـــيـــدان شـــجـــاعت نه‌لر ايتـــدک

واتا:

چوونی عه‌صر له‌سه‌ر به‌رنامه‌ی عه‌دل نه‌بوو

به فه‌تحت، ئه‌وه‌ت به‌سته سه‌رده‌می (عمر)ه‌وه

به هێرشێک له‌به‌رده‌متان شه‌رکه‌رێک نه‌ما

ئه‌ی سواری ئازای مه‌یدان چیتان کرد

يوز ســـــورمک امـــــيـــــدنده ايدم پاينه امـــــا

بخـــــتم بکا يار اولادی چابوق گـــــذر ايتـــــدک

ياخـــــود صـــــاقنمق عـــــادت ايمش شـــــاه گـــــدادن

شـــــاعـــــرده گـــــدادر ديو آندن حـــــذر ايتـــــدک

يا بشـــقـــه سـبب دن طولايی (شـيخ رضـا) نک

خـــوش گـــوکليکی پا مـــال ســـپـــاه کـــدر ايتـــدک

واتا:

به ته‌مای ئه‌وه بووم ڕوو بساومه به‌رپاتان

به‌ختم يارم نه‌بوو زوو ڕۆيشتن

يان خۆشاردنه‌وه‌ی شاه له‌گه‌دا عاده‌ته

شاعيريش گه‌دايه وتت و له‌وه خۆت لادا

يان له‌به‌ر هۆيه‌کی تر له (شێخ ڕه‌زا)

دڵ خۆشيتان پامالی که ده‌ر کرد

***

## هه‌جوی ڕائيف پاشای موته‌سه‌ڕيفی که‌رکووک

ڕائيف پاشا له ده‌وری عوسمانيدا موته‌سه‌ڕيفی که‌رکووک بوو. له کاتی موته‌سه‌ڕيفيی ئه‌ودا، کوڕێکی بچوکی جو له ده‌س که‌سوکاری ڕا ده‌کات و ده‌يه‌وێت ببێته ئيسلام. به پێی ياسا، له‌به‌رئه‌وه‌ی نه‌گه‌يشتووه‌ته ته‌مه‌نی ئه‌وه‌ی چاره‌نووسی خۆی بکات، و له‌سه‌ر

داوای کەسوکاری و حاخامی جووەکان، فرمان دەدا کورەکە بدەنەوە دەستی باوکی. ئەمە دەبێتە هۆی نارەزایی موسوڵمانەکان و ئەمین پاشای قوماندان فرمان دەدا کە بەپێی یاسا تەحقیق بکرێت. شێخ رەزایش خۆی تێدەخا لە شیعرێکی تورکیدا بە سەر و پۆتەڵاکی رائیف پاشادا دێت و دەڵێت:

گلیــر گلمــاز همــان دینی یهــودی التــزام ایتــدی
نه تعظیم شـــریعت نه رعـــایات نظام ایتـــدی
مـــسلمـــان اولمش ایکن بر یهـــودی زاده جـــبـــرا
یدی خـاخـامـه تسلیم ایدوب چوق احـتـرام ایتـدی
ایشی برخـــانئنه واردردی آخـــر (رائف) جـــاهل
کـه ملت هر طرفـدن، خـارج و داخل، قـیـام ایتـدی
ملـوث ایلدی، رشـــوتله، دینی دولـتی گـــویا
جنـاب داوراکـــــرم ابقـــــای نـام ایتــــدی

واتا:

هەر هات و نەهات پشتگیریی لە ئایینی یەهودی کرد
نە رێز لە شەریعەت و نەریعایەتی نیزامی کرد
کورە جوویەک کە بووبووە موسڵمان، بە زۆر
دایە دەستی حاخام و زۆر رێزی لێ گرت
کاری دایە دەستی خائینێک آخر (رائیف)ی نەزان
کە میللەت لە هەموو لایەک، لەناو لە دەرەوە هەڵسان
بە بەرتیل دین و دەوڵەتی پیس کرد کە گۆیا
جەنابی داوەری ئەکرەم گووی کرد و ناوی بەجێ هێشت

امـیـر المؤمـنین اعـدامنه أمـر ایتـــسـه شـایاندر
بو بد طـینت کـه هتک ملت خـیـر الانام ایتـدی
بنای ارتشـــا چوق یرلری نقـــصـــاند قـــالمشـــدی
قـمـو نقـصـانلری الله ایچـون (رائف) تمام ایتـدی
الهی حـــاکـــمی شـــرع شـــریفی بردوام ایله
نه غـیـرتله کـه اول عـلامـهء عـالی مـقـام ایتـدی

خـصــوصــا قـهـرمــان دولت و ملت (امين پاشــا)
قـومــاندان ديانت پيشــه خـيلى اهتـمــام ايتـدى

واتا:

ئەگەر (امير المؤمنين) ئەمرى خنكاندنى بدات شايانە
ئەم بەد رەسەنە كە هەتكى ميللەتى (خير الانام)ى كرد
بناى بەرتيل زۆر جێگاى بەجێ مابوو
هەمو و كەموو كورتى بۆ خوا، (رائيف) تەواوى كرد
خودايە حاكمى شەرعى شەريف بەردەوام كە
بەچى غيرەتێك كە ئەو دانايە بێ پايە بەرزكرد
بە تايبەت قارەمانى دەوڵەت و ميللەت (امين باشا)
قوماندارى ئاينى پيشە زۆر گوێ داين.

كردەوەى موتەسەرِيف بەپێى ياسا و جارِدانى «مشروطيت» بوو قوماندان ناتوانێت هەڵيوەشێنێتەوە. شێخ رەزا دەيەوێت ئەمە بگەيێنێتە كاربەدەستانى بەرزتر كە دەڵێت:

قـلـم آلـدم يـازەيم شــــــاهـە شـكـايـت نـامــــــە
دهشـت واقـــعـــەدن چاتلدى نـوک خـــامـــە
بر يهــودى بچــە اســلامى قــبــول ايتــمش ايكن
آغليـــە آغليـــە ويرمگ نەديگ خــاخــامــە

واتا:

قەلەمم گرت بنووسم بۆ شا شكايەت نامە
لە سەر سوورِمانى رووداوەكە نووكى قەلەم شەقى برد
كورِە جوولەكەيەک كە ئيسلامى قەبووڵ كردبوو
بە گريان بدرێتە دەستى حاخام ماناى چييە.

زوجــەسى طالقــەدر، قـــانى هدر، مـــالى حـــلال
گـــوشـــەء چشم اهانتله بقـــان اســـلامــە
(رائف)ک سـيـئـاتى گـون گـبى مـيـدانە چيـقـر
گـر شـهنشــاه دوشــونســون ايشى، اسـتـعـلامـە
حكم ايدوب كـفـرينە اصـحـاب شـريعت اول

حـــضـــرت قـــاضـی لاری گـــبی بر عـــلامـــه
ایـتـمـسـون غـیـرت اگـر حـضـرت شـێخ الاسـلام
قـــالـمـــز حـــرمـــتی پاچادره قـــدر عـــمـــامـــه
سن ده بو یولده (رضـــا) مـــال و ســری ایله فـــدا
مـــؤمنک جـــیـبنه گـــیـــرمـــز بو گـــبی هنگامـــه

واتا:

ژنی لێ حەرامە، خوێنی هەدر و ماڵی حەڵاڵە
ئەوەی بە سووچی چاوی ئیهانەت سەیری ئیسلام بکا
خراپەی (ڕائیف) وەکو ڕۆژ دەکەوێتە مەیدانەوە
ئەگەر شاهەنشا بیر لەوە بکاتەوە لەم کارە بزانێت
حوکمی کفری ئەدات، خاوەن شەریعەت
وەکو حەزرەتی قازی دانایەکی لاز
ئەگەر حەزرەتی شێخونیسلام غیرەت نەکات
حورمەتی عەمامە بە قەدەر باچارەیەک نامێنێ
تویش لەم ڕێگایەدا (ڕەزا) سەر و ماڵت بکە فیدا
ئەم جۆرە ئاشوویە ناچێتە گیرفانی خاوەن ئیمان

***

## هاوکاری کردنی مەئموورانی حکومەت لەگەڵ دز و جەردە

لەسەردەمی حکومەتی عوسمانلی، لە کوردستاندا، کاربەدەستانی حکومەت لەگەڵ دز و جـەردە ڕێـک دەکـەوتن بۆ دزی و جـەردەیی و تالان کـردنی کـاروانی بازرگـانی و مـاڵی هاوولاتـیـان. شێخ ڕەزا لەم شـیـعرە تورکـیـیـەی خوارەوە دا باسی قـومـیـسـێـرێکی پۆلیس (بەهرام) ناو ئەکات کـە بە بەرتیل چاوی لە جـەردەکانی ڕێگای سولەیانی و کەرکـوک پۆشی بوو و ڕێگای چەمچەماڵ باڵندە لێی ڕزگار نە ئەبوو و ئەڵێت:

اشـــقـــیـــا حـــقـنده عـــاجـــز ارتکاب ایتـــمـکدەدر
ارکک ایله قـــانجـــغـک بیننده واقع بر مـــشـــال
بو دوام ایلرســـه ملک و مـــال هب الدەن گـــیـــدر
جـان دخی ایتـمـزسـه تخلیص گـریبـان احـتـمـال

قوش ده گیچمز کاربانله بادپیما نیلسون
اشقیادەن بویله باغلانمش طریق (چمچمال)
آلمق آلقده، مفوض، بشقه برشی بیلمیور
اولمسون بهرام، یارب، آلدیغی آیلق حلال

واتا:

بەرامبەر جەردە بێ دەستەلات و هەر خەریکی بەرتیل خواردنە
وەکوو میثالێک لە نێوان نێرەکەر و ماکەر هەیە.
ئەمە وا بڕوات موڵک و سامان هەمووی لە دەس ئەڕوات
گیانیش یاقە ڕزگار ناکات ئیحتیمال
مەلیش تێ ناپەڕێت کاروان و عەرەبانە چی بکەن
بە جەردە وا ڕێگای چەمچەماڵ داخراوە
لە بەرتیل وەرگرتن بەولاوە، (مفوض) هیچی تر نازانێت
ئەی خوایە، بەهرام، ئەو مانگانەیەی وەری ئەگریت حەرامت بێ

لە هەجوێکی تری دەفتەردار، شێخ ڕەزا، دزی و بەرتیل خۆری دەردەخات کە لە ئێلی زەنگنە وەری گرتووە. لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت:

واجب اولدی ایدەیم درد دلک اظهاری
یوقسه دق علتنه منجر اولور اضماری
صالی ویر زنگنەلری یا گری ویر رهواری
ویرمم باد هوا، اسب صبا، رفتاری
جملە آفاقە دگشمم تویونک بر تاری

واتا:

پێویست بوو دەردی دڵ ئاشکەرا کەم
گەروا نەبێ، لە دڵا هێشتنەوەی ڕام دەکێشێت بۆ نەخۆشی دق
زەنگەنەکان بەرەڵاکە، یان پارەکە بگەڕێنەرەوە
نایدەمە بای هەوایا، ڕەفتاری ئەسپی صەبا
تەنها موویەکی بە هەموو دونیا ناگۆڕمەوە

بری یوزدن متجاوز، بری سویلر یوز ایمش

بری انصـــافی براقـــمـــازده، دیر طقـــوز ایمش

بری ســـویلر: بو نەچوق رشـــوت آلور دونکزایمش

کـــیـــمـــســـه بیلمـــز عـــددی بن بیلرم اوتوز ایمش

زنگـنەلـردن آلـنان لـیـــرەلـرک مـــقـــداری

واتا:

یەکێک دەڵێ لە صەد پتر، یەکێک دەڵێ صەد بووە

یەکێک پشت لە ئیناف ناکات دەڵێت نۆ بووە

یەکێک ئەڵێت ئەمە چەند زۆرە ئەم بەرتیل خۆرە بەراز بووە

کەس نازانێت ژمارەی، من ئەزانم سی بووە

ژمارەی ئەو لیرانەی کە لە زەنگنکان وەرگیراوە.

وعـــدەء تخلیـــه گـــوز فـــصلی ایکن اولدی شـــتـــا

گـــورمـــدم بویله عـــجب خـــائن مـــادر بخطا

یاپدی افـــســـونلری، گـــوســـتـــردی فنون شَـتّـا

آتمی آلدی هـوانتـــه ایله مـــجـــانا حـــتی

ســـیـــزک ســـرتـنەده اتمادی بر عنتـــاری

واتا:

کاتی سەربەست کردن کە فەسلی پایز بوو بوو بە زستان

ئەمدی دایک حیزێکی خائنی وا

زۆر سیحری کرد و هونەری جۆراوجۆری پێشان دا

ئەسپەکەمی بە هەوانتە بە بەلاش وەرگرت.

إیشی گـویرمکده جـبـان آقـچـه آلمقـده جـســور

نیـــجـــه بیک خـــاطر بیـــچـــاره شـــرندن مکســـور

ذات نحـــسنده دنانت دیدکن هب مـــحـــصـــور

نه رودادر کـــه قـــومـــاندان ســـپـــاه منصـــور

ایدسک پادشـــەهم بـویله خـــیـــانت کـــاری

واتا:

لە کار بینیندا ترسنۆک لە پارە وەرگرتن ئازا

چۆن خاتری هەزار بێچارە لە شەڕی شکاوە
ئەوردەنا ئەتانەی کە پێی دەڵێت هەمووی تێیدایە
چە ڕەوانە کە قوماندانی سوپای سەرکەوتوو
پادشام خیانەتێکی وا بکەی.

دولت و مللتـــه اســبـــاب زیاندر بـو ترس
بلکه بر فـــتنهۋ آشـــوب جـــهـــاندر بو ترس
ایتـــســـه اللهـــه یمین عین یلاندر بو ترس
هم بزم قـــانمزی ضـــائع ایداندر بو ترس
نیـجـه قـاندردی جنابک قـوجـه بر خـونکاری

واتا:

مایەی زیانی دەوڵەت و میللەتە ئەم تەرسە
بەڵکو فیتنە و ئاشوبی جهانە ئەم تەرسە
ئەگەر بەخوا سوێن بخوا بە تەواوی درۆیە ئەم تەرسە
هەم خوێنی ئێمەی بە بەێهوودە داوە ئەم تەرسە
چون پیاوێکی خونکاری وەکوو جەنابتان ئیقناع کرد؟

گـــر بودر دائرەیـی گـــردش ایام رضـــا
ویرەمـــز دهر مگر ســـفلەیە انعـــام رضـــا
یارامـــز عـــفت و، دولت ایچـــون اقـــدام رضـــا
بو ایســـه پیش ڕەوی لشکری اســـلام رضـــا
حق بزم اوزره مـظفـــر ایدەجک کـــفـــاری

واتا:

گەر ئەمە بێت دائیرەی گەردشی ڕۆژانی ڕەزا
دەهر ئینعامی ڕەزا ناداتە سفلەیەک
بۆ ڕەزامەندی، پاکی بۆ دەوڵەت بێ سوودە
گەر ئەمە بێت پێشڕەوی لەشکری ئیسلام ڕەزا
خودا گاوران بەسەر ئێمەدا سەر دەخا

نە بیـــچـــــدر، نە ایمش یوزی، ندر اسطاری

بیــــــچــــــمندن بیـلنر ملعنـتک اثاری
ارمنـی لرلـه اویـوب دوغــــــری دگـل افـکاری
طانمز کـیـــمـــسـه بنم تک او خــیــانتکاری
دیکله تعـــریف ایده‌یم حـــضـــرت دفـــترداری

واتا:

چه بیچیمێکه، ڕووی چی بووه، چییه ئەستاری
له بیچمی دەزانرێت آثاری مەلعوونی
لەگەڵ ئەرمەنییەکاندا ڕێکه بیری ڕاست نییه
کەس وەکو من ئەو خیانەتکاره ناناسێت
گوێت لێ بێ بۆتی وەسف کەم حەزرەتی دەفتەردار

نه ارامـــیله ویرر پاره نه ایتـــامـــه مـــعـــاش
آقـــجـــه٫ واحـــده آندن آلامـــز کـــیـــمــــسه بلاش
بر تراش پاره‌سی ویر، ســـوق گـــوتنه نابتـــراش
روحنـی آلمق ایچــــــون ای ملـک الموت یناش
ایتلره طعـــمـــــه اولنـســــون اوتـن مـــرداری

واتا:

نەپاره به بێوه ژنان ئەدا نه مەعاش به هەتیو
کەس پوولێک لەو وەرناگرێت به بەلاش
پارەی تەراشێکی بدەرێ، تابن بکوتەره قنگی
ئەی (ملک الموت) بۆ وەرگرتنی گیانی نزیک بەرەوە
با ببێته خۆراکی سەگان ئەو لەشه مردارەی.

باباسی ســـبـــزه صـــاتر، والده‌سی جنگانه
حـــرمی مـــحـــتـــرمی، خـــادمـــه٫ کـــارخـــانه
دختـــری بد ســـیـری، جـــرعـــه کـــشی پیـــمـــانه
بـاشـی بریـانه دوشـــــــــر، آل ایـاغـی بریـانه
(ســـوق هراجـــده) اللرده گـــیـــزه‌ر شلواری

واتا:

باوكی سەوزە دەفرۆشێت، دایكی جینگانە

ژنی بەڕێزی، كارەكەری قەحپەخانە

خوشكی بەد ڕەوشتی ساقی مەیخانە

سەری دەكەوێتە لایەک دەست و پای بەلایە

لە بازاڕی هەراجی كەران دەرێتی بە دەستەوە دەگێڕرێت.

حالنە باقمیەجقسک فقرانک آترس

فکرینە اویمیەجقسک وزرانک آترس

بیلمدن خربی یماندر شعرانک آترس

بیلمدن خانە ییقار (شیخ رضا) نک آترس

شەرەری حوصلە سوزی شهب اشعاری

واتا:

سەیری حاڵی هەژاران ناكەی ئەی تەرەس

لەگەڵ بیری وەزیراندا نانگونجێییت ئەی تەرەس

نەتزانی لێدانی شاعیران بە هێزە ئەی تەرەس

نەتزانی (شێخ ڕەزا) ماڵ ئەڕوخێنێ ئەی تەرەس

بەڵام نە بەتكا و نەیش بە هەجو نەیتوانی مووچەكەی لە دەفتەردار وەرگرێت ئەی بەچی؟ لەم شیعرە توركییەدا ئەڵێت:

نە رجا ایلە معاشم آلە بیلدم نەهجا

چارە یوقدر بو قورمساغە مگر موت فجا

پارەم یوقدر آلەیم ابدست ایچون بر ابریق

واجب اولدی صقلیلە ایدەیم استنجا

واتا:

نە بە تكا توانیم مەعاشم وەرگرم نە بە هەجو

چارەی نییە ئەم قورمساغە مەگەر مەرگی فوجا

پارەم نییە گۆزە بكرم بۆ دەسنوێژ

پێویست بووە بە ڕیشی خۆم پاک بكەمەوە

لە هەجوێکی تریدا لەم بەیتە تورکییەدا ئەڵێت:

بـو ولایتـــــده جنابک اولـەلـی دفـــــتـــــردار
اولدی طبـــعک گـــبی مـــالیـــه امـــوری مـــردار

واتا:

لەم ویلایەتەدا کە جەنابتان دەفتەردار بن
کاروباری مالیە، وەکوو طەبعتان، مردارەوە بوو

***

## بەرتیل خواردنی دائیرەی عەدلییە

لە دوا ساڵانی حوکمڕانیی عوسمانی، بەرتیل و دزی هەموو دەستەی کاربەدەستانی گرتبووەوە. هیچ کارێک بەبێ بەرتیل نەدەڕۆیشت. ئەمە گەیشتبووە دائیرەی عەدلییەیش. شێخ ڕەزا باسی بەرتیل وەرگرتنی ئەو دائیرەیەی کەرکووک ئەکات کە موتەسەڕیف و والیی مووصڵیش تاوانبار ئەکات و لەم شیعرە تورکییە دەڵێت:

خـــبـــرک وارمی؟ آلنمش. نە آلنمش؟ رشـــوت
آلنان شی نە ایمش؟ لیـــره، آلان کـــیم؟ هیـــئت
هیـــــئـــــتک آدی ندر؟ دائـره‌ء عـــــدلیـــــه
آنـی ایجـــــاد ایدنـک روحنـه یـوزبـیـک لـعنـت
قـــاچ عـــدد لیـــره آلنمش عـــجـــبـــا ؟ یوز اللی
لیـــره‌ء خـــالصـــه اوســـتنده یازلمش ضـــربت
بیلدک کـــیـــملر ایمش لیـــره آلانلر؟ های های
گـــیـــدیشندن بیلنور خـــائن دین و دولت

واتا:

ئاگات لێیە؟ وەرگیراوە. چی وەرگیراوە؟ بەرتیل
ئەوەی وەرگیراوە چی بوو؟ لیرە، کێ وەری گرتووە؟ هەیئەت
ناوی هەیئەت چییە؟ دائیرەی عەدلیە
ئەوەی ئەوی داناوە صەد هەزار لەعنەت لە ڕووحی
چەند ژمارە لیرە وەرگیراوە؟ صەد و پەنجا

لیرەی صاغ لە سەری نووسراوە (ضربت)
زانیت ئەوانە کێ بوون لیرەیان وەرگرتووە؟ هەی هەی
لە ڕۆیشتنی دەزانرێت خائنی دین و دەوڵەت.

بری مستنطق افندی، بری جنگانه رئیس
ا و برن سویلیه‌مام، سویله بابانه رحمت
یوزینی (راغب) آلوب یگرمیسنی (امین)
او برن سویلدیکم ذات ولی النعمت
حضرت داور اکرم متصرف پاشا
ایشگک باشنی طوت، حمزەیه کلدی نوبت
حصه ویرمک بکاده لازم ایدی حق سکوت
ویرمدی، آغزیمی ظن ایتدی قپاتمش ذمت
اسمی دفترده اوزی خائب و خاسر بری بن
بری موصلده اولان والی عالیء همت
عجبا آلدی قوماندان دخی بر شی، حاشا
وارمی نیاده قوماندان گبی صاحب عفت

واتا:

یەکێکیان موستەنطیق ئەفەندی، ئەویتریان سەرۆکی جینگانە
ئەویتریان ناڵێم، بلێ ڕەحمەت لە بابت
صەدی (ڕاغب) وەری گرتووە و بیستی (ئەمین)
ئەویتریان کە دەڵێم زات وەلی نیعمەتم
حەزرەتی خاوەن شکۆ موتەسەڕیف پاشا
سەری کەر بگرە، ڕیز هاتە (حەمزە)
پێویست بوو بەشی منیش بدەن بۆ دەم داخستنم
نەیدا، وای زانی باج دەمی داخستووە
ئەوەی ناوی لە دەفتەردایە و خۆی دەس بۆش و بەتاڵ، یەکێکی من
ئەویتریان ئەوەی لە مووصڵدایە والی هیمەت بەرز
ئایا قوماندان شتێکی وەرگرت؟ نە حاشا

لە جیهاندا هەیە پاکێکی وەک قوماندان!

***

## شێخ ڕەزا لە بەغدا

یەکەم جار سەردانی شێخ ڕەزا بۆ بەغدا، لەگەڵ شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی بۆ زیارەتی بارەگای شێخ عبدولقادری گەیلانی بووە. لەو هاتنەدا، عەلی پاشای والیی بەغدا، خۆی و گەلێ لەکاربەدەستانی وویلایەتی بەغدا تاکو شارۆچکەی (خالص) دێنە پیری شێخەوە و بەڕێزێکی زۆر پێشوازی لە شێخ عەبدولڕەحمان ئەکەن.

دەڵێن شێخ عبدولڕەحمان بە کوڕەکانی ئەڵێت، لە بارەگای شێخی گەیلانی هەر داوایەک بکەن خوا پێتانی ئەبەخشێت. شێخ ڕەزا لە بارەگادا ئەم شیعرە فارسییە دەڵێت کە تاکو سالانی دوایی لەسەر دەرگای بارەگاه نووسرابوو کە لە پاشان دەیخوێننەوە:

« این بارگه حضرت غوث الثقلین است »

شێخ ڕەزا کە بە یەکجاری نیشتەجێی شاری بەغدا دەبێت، لەساڵی ١٣١٨ کۆچیدا لەسەر داوای شێخ عەلیی کاکی، بۆ سەر پەرشتیی تەکیەی تاڵەبانی دەبێت کە لە گەڕەکی (المیدان) بوو، بریتی بوو لە خانوویەکی دوو نهۆمی و لەپێشەوە ڕیزە دوکانێکی هەبوو، شێخ ڕەزا کرایە (متولی) ئەم وەقفانە و بەکرێی ئەم دوکانانە گوزەرانی بژێ و مەمری دەبردە سەر.

مەبەستی شێخ عەلی ئەوە بوو کە شێخ ڕەزا لە شەڕە جنێوی شاری کەرکوک و گەڕەکی بەر تەکیە دوورخاتەوە و بیگەڕێنێتەوە سەر ڕێبازی دەروێشانەی با و باپیری، بەڵام ڕەوشت و بیروباوەڕو هونەرمەندی شێخ ڕەزا لەگەڵ ڕەوشتی دەروێشان نەدەگونجا و تەنها بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕۆشنبیران و ئەدیبانی شاری بەغدا ناسیاوی پەیدا بکات قایل بوو بێتە بەغدا. لەم شیعرە فارسییەدا ئەو مەرجە دادەنێت و لە بەغدادا پێوەندی لەگەڵ گەلێک لە بنەماڵە ناسراوەکان و ڕۆشنبیران و کاربەدەستانی حکومەت پەیدا کرد و وەکوو ئەستارەیەکی گەش لە ئاسمانی بەغدادا دەدرەوشایەوە.

چە کرامت چە خارق عادە
جلق بهتر ز دلق و سجادە
سخن من مفید و مختصراست

بابت ساده بابت ساده

گرچه نتوانم از زمین خیزم

بس که هستم ضعیف وافتاده

گر بگویند هست در بغداد

ساده روی لطیف و بگزاده

ذره آسا بمهر و دیدارش

(گیدرم باشم اوزره بغداده)

سوی مسجد دوگام من نروم

سوی میخانه تند وآماده

مشربم مشرب امین فیضی است

هردو از هردو عالم آزاده

ای (رضا) تا بمرگ رندی کن

این بود دولت خدا داده

که دێته بەغدا، کاروباری لەلای کاربەدەستان جێ بەجێ دەکرێت و پیاوە ناسراوەکانی بەغدا دەستی یارمەتیی بۆ درێژ ئەکەن تەکیەی بۆ نوێ ئەکەنەوە.

کارم کە بەکام است نە از شاە و وزیر است

هرمایە کە دارم همە از سایەی پیر است

واتا:

کارم بە ئارەزووی دەروات نەک لە شا و وەزیرەوە

هەر سەرمایەیێکم هەیە، هەموو لە سایەی پیرەوەیە

که دێته بەغدا، ژیانی ئەدەبی بەغدای پێ خۆش بووە و جێگای ئایندارییە.

گەر بڵێم (بەغدا) لە جەننەت خۆشترە هێشتا کەمە

چونکە سوکنای غەوث و کەرخی یو ئیمامی ئەعزەمە

ئەی برادر شاری بەغدا بێ حەسادەت بێ هەمە

زۆر ئەمین بە لەم حیسابە پێت بڵێم کورتە و کەمە

لەم ولاتە هیچ ولاتێ هەر وەکــو بەغــدا نیـیــە
حـاکـمی عـەدل و عـەدالەت زۆر ئەمین و بێ غـەمـە

شێخ ڕەزا لە بەغدا دۆستایەتی و یارمەتی، ئەو بنەماڵانەی کە ناسیاویی لە گەڵیاندا پەیدا کردبوو، پێی گەیشتووە. لەوانە (عەبدولغەنی بەغدادی) خەرقەیەکی شامی بۆ هێناوە بە دیاری، لەمەدا، ئەمەی بە نیشانەی دۆستایەتی زانیوە و دەڵێت:

مـن سـرمـازده را داد زغـم ازادی
خـەرقـەء شـام ز(عـبـدالغنی البـغـدادی)
خـەرقـە یاخـود شـفـقت نامـەء ازجـانب دوست
کـە نمایم بکدامین یک ازینـهـا شـادی

واتا:

ئازادیی بەخشی بە منی سەرما بردەڵە
پاڵتۆ شامییەکەی عبدولغەنی بەغدادی
پاڵتۆکەی، یاخود بەزەیی نامەکەی ئەو دۆستە کە بۆم هات
دڵ بە کام لە مانە خۆش بکەم

و لەگەڵ هەموو ئەو بەرێزییەی بۆ شێخی گەیلانی، جار جار دانوولەی لەگەڵ سەید مەحموودی نەقیب نەکولاوە، و هەجوی زۆر تیژ و تونی کردووە. لێرەدا دەڵێت:

ارجع بغـدادا وانی غـریبـهـا
علی جنة الفـردوس لولا نقـیـبـهـا

لەسەر ئەم شیعرە شاعیرێکی عەرەب پێنج خشتی دەکات و دەڵێت:

عـجبت لنفـسي کـیف ضـاع نصـیـبـهـا
مـن العـیـش في ارض واني ادیـبـهـا
فـمن ظلمـهـا اذ بان غي طمـیـسـهـا
«ارجع بغـدادا وأنا غـریبـهـا
علی جنة المأوی لولا نقـیـبـهـا»

لە بەغدادا نە قسەی لە کەس خواردووەتەوە و نەیش لە کەمو کورتی بێ دەنگ بووە.

جارێک دەچێتە مزگەوتی ئیمام (ئەبوحەنیفە) مەلای مزگەوت مرۆڤێکی نەزان و بەد فەساڵ دەبێت. کە دەبێتە دەمە تەقێیان، دەزانێت هیچی لە باردا نیە و دەڵێت:

لوكان يعلم انت من جيرانه

لفر من قبره الامام الاعظم

تەکیەی تاڵەبانیی بەغدا، هەم مزگەوت و هەمماڵی شێخ ڕەزا بوو. بەڵام زۆر پەڕپووت بوو بوو و پێویستی بە نوێ کردنەوە بوو. ئەمەیش پارەیەکی زۆری دەوێت بەڵام پارە لای شێخ ڕەزا کوا؟ لە شیعرێکی تورکیدا دەڵێت:

يتـمش، سكسـان دەردیمی درمـان ايده بيلمـز

مـشكللريمی يوز دخی آسـان ايده بيلمـز

يوز اللی ايش بيـتـر امـا گـدای دوران

يوز اللی قـدر ليـرەيی احـسـان ايده بيلمـز

يا دەست تهی گله اگـر (مـوسی عـمـران)

ويرانه اولان تكيـەيی عـمـران ايده بيلمـز

واتا:

هەفتا، هەشتا دەردم تیمار ناکات

صەدیش گیروگرفتم ئاسان ناکات

صەد و پەنجا کار تەواو دەکات، بەڵام گەدای دەوران

صەد و پەنجا لیرە ناتوانێت ببەخشێت

ئەگەر هەر ئێستا موسای عیمران بێت

تەکیەکە وێرانەیە عیمرانی ناکات

بەڵام بنەماڵەی عیسا ئەفەندی و جەمیل زادە و عەبدولغەنی بەغدادی دەستی بەخششیان درێژ دەکەن و بۆ ئاوەدان کردنەوەی تەکیەکە یارمەتییەکی باشی دەدەن و شێخ ڕەزا لە سوپاسیدا بە شیعرێکی تورکی دەڵێت:

ممكن اولەمـز هركس ايچـون مـجـد مـؤيد

«قـد خـصـصـه الله بعـيـسی بن مـحـمـد»

بـندن صـوريكز بن تانرم آل جـمـيلی

«اصـــحـــاب مـكارم، ولد، عـم، اب، جـــد»
تـنـهـــانـه منم بـاركـــشـی منت ايـشـــان
«لاعـــاتق الا وعـلـيـــه لـهـم الـيـــد»
در باره‌ء ايـنـهـــا كـــه كـــريم ابن كـــريمند
بـبـــريده زبـانى كـــه بـگـويـد ســـخن بد
احـســانجـه وفـا سـبـقت ايدر وعـــده لرندن
آنلرجـــه قـــبـــاحث گـــورينور قـــول مـــجـــرد
الـطاف خـــــدادن ديـلرم عـــافـــيـت اوزره
خـــيـلـى يشـــاســـون هربرى منصـــور و مـــؤيد

واتا:

بۆ هەمو کەسێک مەجدی هەتایی پێک نایێت
خوا تەنها بۆ عیسا کوڕی محەمەد دایناوه
لەمن بپرسن من دەیاننانسم ئەو ئالی جەمیله
خاوەنی بەخشش، کوڕ و مام و باب و باپیر
تەنها منم بارکێش مننەتی ئەوان
هیچ کردەوەیەک نییە، دەبێت دەستیانی تیابێت
لەبارەی ئەوەوە کە جۆمەرد کوڕی جۆمەردن
ئەو زوبانە ببڕێت کە خراپەیان بڵێت
کە وەعدیان دا، بەجێ هێنانی پێش بەخشش دەکەوێت.
بەلای ئەوان قسەی ڕووت کردەوەی خراپە
لە لوتفی خوا دەپاڕێمەوە لەسەر تەندروستی
زۆر بژین هەر یەکە مەنسوور و موئەییەد

خـابيـده‌ء اسـلاف دگـل شـيـوه‌ء شـيـعـرم
آيـين (رضـــا) در بوگـــبى ســبک مـــجـــدد

واتا:

وتنەوەی پێشوو نییە شێوەی شیعرم
ئایین (ڕەزا)یە ئەم داڕشتنە نوێیە

له شیعرێکی تورکی تریدا دیسان باسی بەخششی مستەفا ئەفەندیی جەمیل زادە ئەکات کە سێ (ثریا)ی بە دیاری ناردووە بۆ تەکیە. دەڵێت:

سخاکسبی دگل آل جمیله، ارث آبادر
ان ادنی پایه ء همتلری اوچ ثریادر
خصوصا مصطفی کیم ایده بیلمم وصفه ایفاسن
وفا هر چند اکا مخلص بولنمش حقی اوفادر
دگل اوفی اگر اعلادن اعلا بر لقب بولسه
جناب (مصطفی) حضرتلری اندن اعلادر
یتشمز دامن اوصافنه سر پنجه فکرم
نهال قامتی، اهلیتی اول رتبه ء بالادر
زلال مشربی، آلایشی، شیرین عذابنده
صانورسن الله الله شربتی شهد مصطفی در

واتا:

دەس کراوەیی کەس نییە بۆ ئالی جەمیل لە باپیرانەوە ماوەتەوە
کەمترین پایەی هیمەتیان سێ ثریایە
بەتایبەت مستەفا، کێ! ناتوانم وەسفی بکەم
وەفا هەرچەندە مل کەچی بێت، هەقی (اوفا)یە
ئەوەک اوفی ئەگەر لە بەرز بەرزتر لەقەبێ هەبێت
جەنابی مستەفا لەوەش بەرزترە
سەرپەنجەی بیرم ناگاتە داوێنی ئەوسافی
بەرزیی قامەتی ئەهلیەتی لە و ڕوتبەیە بەرزترە

دری قارننده خشیتندن هر زمان دریا
اگر دریا کفی دریادیرسم بر تعدادر
نیجه دریایه تشبیه ایلەیم اول دست احسانی
که کمتر بخشش عالیلرک مخصوص دریادر
ایدر بیک خاطر پژمردەیی بر لطف ایله احیا

اول عالی قدر اگر عیسی دگلسه عم عیسی در
(رضا) آل جمیلی سودیگنده مدح ایدر یوقسه
نەحاجەت رایت احسانلری میدانده بر پادر

واتا:

لەترسی ناوسکی پیستە هەرکاتێ دەریا
ئەگەر بڵێم دەستی دەریایە تەعدایە
چۆن بە دەریا بیشوبهێنم ئەو دەستە بەخشەی
کە کەمتر بەخششی بەرزی تایبەتی دەریایە
بە لوتفێک هەزار خاتری غەمناک زیندوو ئەکاتەوە
ئەو پایە بەرزە ئەگەر عیسا نەبێت مامی عیسایە
(ڕەزا) لە خۆشەویستی مەدحی ئالی جەمیل ئەکات، ئەمە نەبێ
هیچ ئەمەی ناوێ چاکەیان لە مەیداندا دیارییە

***

### باسی نەعیم

یەکێک لە خاوەن مەلهاکانی بەغدا کچێکی گۆرانیبێژی خەلقی حەلەب دێنێ. ئەم کچە برایەکی جوانی دەبێت ناوی (نەعیم) دەبێت و گەلێک لە پیاوانی ئەم سەردەمەی بەغدا کەمەنکێشی دەبن. ئیبراهیم مونیب پاچەچی شەوێک بە سەرخۆشی لە تیاترۆی (گهوة سبع) ئەم نەعیمە دەکوژێت. شێخ ڕەزایش وەکوو شاعیرانی تر شیعریان بەسەردا هەڵداوە و دەڵێت:

بر نعـــیم آدلو صنم گلمش دیار شـــامـــدن
زن او زن کـیم بویله مـەحـبـوبی چیـقـارمش آمـدن
حــاجی گــر گــورســه انی دور مطاف کــعــبــه ده
باش چیــقـــارر اژدها اســا ســیکی احــرامــدن
دونده پنهـان ایلمش سـیمین دونک حفظی ایچون
دون دگل گـەردونە حـفظ ایتـمـز آنی اقـلامــدن
نقــرەء ســمت و ســورینی پارەسـز گــیـرمـز اله

سن که مفلس سن (رضا) کیچ بو خیال خامدن

واتا:

کۆتەڵێکی نەعیم ناو هاتووە لە وڵاتی شامەوە

ژن ئەو ژنەیە، کێ جوانێکی وای لە کوزی دەرهێناوە

ئەگەر حاجی لە سووڕانی مەطافی کەعبە ببینێت،

کێری وەکو ئەژدیها لە ئیحرامەوە سەر دێنێت

لە دەرپێدا دووی سیمینی شاردووەتەوە

ئەک دەرپێ بەڵکو گەردوونیش ئەوە لە قەڵەم ناشارێتەوە

ئوقرەی سمت و سوورینی بە بێ پارە دەس ناکەوێت

تو کە موفلیسی (ڕەزا) واز بێنە لەم خەیاڵە خاوە.

لەسەر ئەوەی نەعیم لە لایەن ئیبراهیم مونیب پاچەچییەوە کوژرا، شێخ ڕەزا لە شیعرێکی تورکیدا ئەڵێت:

قرلسون آل اياغك، قانه باتسون پاچەچی زاده

نیچون ویردن نعیمک نونهال عمرینی باده

سوره‌ن بزم طربدن ساقی و سازنده زیرا

نعیم سز درد سر در نغمهء بی نشئه باده

واتا:

دەس و پات شکێ لە خوێن هەڵکێشرێت پاچەچی زادە

بۆچ عومری نوێ نهاڵێ نەعیمت دایە بادا

ساقی و دەنگ ساز کە بەزممان بۆ دەگێڕن

بەبێ نەعیم سەرئێشەیە نەغمەی بێ نەشئە بادە

لە زۆرداری و جۆری ئەم جۆرە کردەوانە بێزار بووە و ئەمانە دەستی زۆرداری حکومەتیان پێ نەدەگەیشت. شێخ لە شیعرێکی تری تورکیدا دەڵێت:

ستم اندازه‌دن چیقدی الهی بردها گوندر

(هولاکوخان) گبی بر کافر خنزیری بغداده

اسامی نامهء عشاقنی اول سرو بالانک

آچوب گوردم یازلشدی (رضا)نک اسمی بالاده

واتا:

ستەم لە ئەندازە دەرچوو خودایە جارێکی تر بنێرە

(هولاکۆخان)ی گاوری بەراز بۆ بەغدا

ناوی نامەی عاشقانی ئەم سەرو بالاّیە

کردمەوەو دیم ناوی (ڕەزا) لەسەرەوە نوسراوە

لەوەسفی گەرماوی بەغدا، بەم شیعرە تورکییە دەڵێت:

گیرمه، بغداده اگر گلدن ایسه، حمامه

بر گل اندامی گوروب، سنده دوشرسن دامه

چیلدیرر گورسه اگر غلمانلری شیخ الاسلام

طولاشیر پاینه زنجیر گبی عمامه

بوسەدن رشوت اگر وعده الورسه ایلر

باطل حق تحریر شهادت نامه

واتا:

ئەگەر هاتیتە بەغدا مەچۆرە گەرماوەوە

گوڵ ئەندامێک دەبینیت، تویش دەکەویتە داوەوە

ئەگەر شێخولئیسلام (غلمان)یان ببینی

مێزەر وەکو زنجیر دەئاڵێتە پایەوە

ئەگەر وەعدی ماچ بە بەرتیل وەرگرت

حەق دەکاتە باطل نووسەری شەهادەتنامە

شێخ ڕەزا، لە بەغدا، وەکوو دۆست و ناسیاوی هەبوو، ناحەزیشی هەبوو لەگەڵ هەندێ لە ڕۆشنبیران و زانایان دا کەوتە تەقەوە. وەکو لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت:

کلمدم فسق وفساد ایتمک ایچون بغداده

بر طاقم اهل غرض باشلادیلر افساده

باشلادم بنده معایبلرینی تعداده

قزلری فاحشەدر بچەلری کونداده

سیکی ویرهر کیمی گوردنسه (زهاوی) زاده

واتا:

ئەهاتمە بەغدا بۆ فسق و فەساد

دەستەیەک خاوەن کینە دەستیان کردە فەسادی

منیش دەستم کردە ژمارەکردنی عەییان

کچیان سۆزانی و کوڕیان قنگدەر

کێرت بدە هەر کەسێکت دی لە (زەهاوی) زادە

لە بەغدا هەندێ بازرگانی خاوەن پارەی نەزان هەن، بە سامانیانەوە دەنازن و یارمەتیی هەژاران نادەن و لەگەڵ کەللە بۆشییان خۆیان وا دەردەخەن کە هەموو شتێک دەزانن. یەکێک لەوانە (مهدی چلبی)بووە کە شێخ ڕەزا دەیەوێت خۆی لە قەرەی بدات و بڵێت «چەلەبی» بە لووسکەیەکی نازک بەدەن دەڵێن و لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت:

دوشنوردم نە ایچــون تاجــرە دیرلر چلبی

فــارسی در بو لغت، تورکی مــیــدر یا عــربی

بونی کیــمدن صورەیم، بحر تفکیــردە ایکن

گلدی تاج الادبا قــارشــومــە (مــهدی چلبی)

واتا:

بیرم دەکردەوە، بۆچ بە بازرگان دەڵێن چەلەبی؟

ئەم وشەیە فارسییە، تورکییە یان عەرەبی

ئەمە لەکێ بپرسم لە دەریای بیرکردنەوەدا بووم

هاتە بەرامبەرم «تاجولئودەبا» مەهدی چەلەبی

دیدم. ای جــرعــە کــەشی مــعــرفــتک شق سطیع

وی عــیــراق وعــجــمک داهیــەیی بو العــجــبی

لقب عـــالیکزک حـــاصلی مـــعناسی ندر؟

باقــدی دوندردی بنا گــوشــەء چشم غــضــبی

دیــدی: یــاهــو، چــلــبــی نــازک اولان زاتــە دینــر

هر فـــرومـــایە اولان چابقنە دینمـــز چلبی

دیدم: احــسنت بو فــضل وهزرو مــعــرفــتــە

ای بزم مملکتک مــفــتــخــر و منتــخــبی

گیتمه دن مکتبه، تحصیل کمال ایلەمەدن
نیرده بولدن بو قدر دانش وعلم وأدبی
گورمادی مثلنی ای فاضل یکتا گوزمز
(مصری) گیزدم یمنی، شام، حجاز و حلبی
سایه سنده ایدرز حل مسائل یوقسه
نه بیلور (شیخ رضا) اویله معما لقبی

واتا:

وتم: ئەی دڵۆپەی زانستی ڕۆشن کەرەوە
وەی دانای عەجیبی عیراق و عەجەم
لەقەبی بەرزتان حاصلی مانای چییە؟
سەیرێکی کردم بە تووڕەییەوە سووچی لێ کردم
وتی: یاهو، چەلەبی بە زاتێکی نازک دەڵێن
بەهەر نا ئەسڵێکی جابقی ناڵێن چەلەبی
وتم: دەم خۆش بۆ ئەم فەزڵ و هونەر و زانستییە.
ئەی جێی فەخر و هەڵبژاردەی وڵاتی ئێمە.
بێ ئەوەی بچیتە قوتابخانە و فێری عەقل و کەماڵ ببی
لەکوێ ئەم هەموو دانش و زانست و ئەدەبەت دۆزییەوە
چاومان مانەندی تۆی نەدیوە ئەی فازڵی یەکتا
میسر گەڕام و یەمەن و شام و حیجاز و حەلەب
لەسایەیەوە کێشە چارە ئەکەین، ئەگینا،
(شێخ ڕەزا) چۆن دەزانێت لە قەبێکی بە لەغزی وا

***

### بەخێر هاتنی والیی بەغدا

والییەکی نوێ دێتە بەغدا. شێخ ڕەزایش وەکوو ناسرەواکانی شاری بەغدا دەچێت بۆ بەخێرهاتنی. لەسەر شێوەی سەڵاوی عوسمانییەکان سەر دادەنوێنێ و دەستی ڕێزی بەرزدەکاتەوە و لەو کاتەدا مێزەرەکەی دەکەوێتە بەریای والی. یەکانسەر چوار بەیتی تر دەخاتە سەر شیعرەکەی کە دەڵێت: «رسم فرنگیان..» و ئەم ڕووداوە پینە دەکات.

رویم بدیده سـجـده کنان خـاکی راهرا
شکـرنـهء قـــدوم ولایـت پنـاهـرا
ای والی ولایت زورا خــوش آمــدی
برزن بجـای برمکیــان بارگــاهرا
رسم فــرنگیـان کله ازســر فکنداست
تعظیم چون کندد خـداوند جــاهرا
من اکـتـفـا بشـیـوهء ایشـان نمیکنم
هم ســر به پایت افکنم و هم کــلاهرا
اقـلیم بـابـل ازقـــدمت یـافت رونقـی
کــز ابر نوبهــار درخت و گــیــاهرا
ازین مــقــدمت چه‌عـجب گـر رها شـود
(هاروت بابلی) کــه اسـیــرست چاهرا
عــزمت خط نفــاق زلوح عــراق شـست
چون ســیل توبه ازدل مــجــرم گناهرا
نقش است بر صـحـیـفـه رأیت رمـوز غـیب
حـاجت به گــفـتـوگـو نبـود داد خـواهرا

واتا:

وەک سوجده بەر خاکی ڕێگا بە چاو ئەمالم
لە شوکرانە بژێری هاتنی والیی ویلایەت پەنادا
ئەی والیی ویلایەت (زەورا) خۆش هاتی
بارەگا هەلدە لە جێگای بەرمەکییەکاندا
ڕاوڕەسمی فرەنگیان ئەوە کلاو لەسەر داگرن
کاتێ کە قەدرو تەعزیمی مروڤی خاوەن جاه نەکەن
من بە شێوەکەی ئەوانەوە ناوەستم
سەریشم فڕێ دەدەمە بەر پێت و کلاوەکەشم
ئیقلیمی عیراق ڕەونەقێکی تۆ دەسگیر بوو
وەک چۆن درەخت و گیا لە هەوری ئەو بەهارەوە دەستگیریان دەبێ

هیچ سەیر نییە لە پیرۆزی هاتنت ڕزگار ببێ
(هارووتی بابلی) کەدیلی ناو چاڵە.
هاتنت هێڵی دوو ڕوویی و نیفاقی لەسەر تەختەی عیراقدا شۆری
وەک چۆن لافاوی تۆبە گوناه لە دڵی تاونبار دەشوات
نیشانەکانی غەریب لەسەر لاپەڕەی بیرورات نەقش بووە
دادخوا پێویستی بە گفتوگۆنییە.

آســـــوده آنچنان بـوجـــــود تـو مملکت
کـــزدل بلب هوای ســـفـــرنیـــست راهرا
ازبیم صـــــولت توکـــــمـــــان ابراون بدل
از دیـده افـکـنـنـد خـــــدنـگ نـگـاهـرا
فـرخ رخـا ، خـجـســتـه پـیـا ، والیـا یکی
بشن و زمن شکایتی بخـــتی ســـیـــاهرا
مـــیـــراث مــانده از پدرم کـــهنه تکیـــه ء
چون عـــمـــر نوح دید بسی ســـال و مـــاهرا
انجـــاز ســـالکان طریقت جـــمـــاعـــتی
گـــســـترده برزمین عـــبـــادت جـبـــاهرا
شـــیخ و مـــــرید دست بر اور ده ء دعـــــا
یـارب دوام عــــمــــــر بده پـادشــــاهرا
شـایـد شـود بەوجـه توجـه مـعـیـشـتی
آیـنـد و رونـده ء ان خــــــانقـــــاهرا
ای مظهـر مـجـیـد ، (رضـا) را توجـهی
تحـــصـــیل چو فـــرضت رضـــای إلاهرا
یـارب همـــیـــشــه مظهـــر نور خـداشـوی
تا اقـــتـــبـــاس نور زمـــهـــراست مـــاهرا

واتا:

وڵات ئەوەندە بە بوونی تۆ وچانی داوەتەوە

ئاخ هەڵکێشان ئارەزووی ئەوەی نەماوە لە دڵەوە سەفەر بکا بۆ سەر لێو

کچانی ئەبرو کەوانی لە ترسی هەڵمەتی تۆ

تیری نیگایان بۆ دڵی عاشقان بۆ ناو دڵی خۆیان هەڵ ئەدەن

ئەی ناوچەوان پیرۆز، ئەی پێ و قدووم خێر و بەرەکەت،

ئەی والی، شکایەتی بەختی ڕەشم لەمن بیبیسە

کۆنە تەکییەیە میرات لە باوکمەوە ماوەتەوە،

وەک عومری نووح ساڵ و مانگێکی زۆری دیوە

کۆمەڵێ لەوانەی کە ڕێگەی تەریقەتیان گرتووە لەوێ،

تەوێڵیان لەسەر عەردی خواپەرستی ڕاخستووە

شێخ و مرید هەموو دەستی دوعایان هەڵبڕیوە و ئەڵێن،

خوایا دەوامی عومری پادشاه بدە

بەڵکو لە لایەنی ڕووتێکردنەوە،

ژیانی بۆ ئایندە و ڕەوەندەی ئەو خانەقایە بێ.

ئەی دیەنی پرشکۆ، ڕوویێ بکەرە ڕەزا،

چونکە دەست خستنی ڕەزای خوداوەند فەرزە

خوایە، تۆ هەمیشە دیەنی نوری خودابی، تا

ئەو ڕۆژەی ڕۆژ ڕووناکیی خۆی لە مانگەوە وەرئەگرێت

***

## مەدحی تۆفیق بەگی میر ئالای

تۆفیق بەگی میر ئالای یەکێک بوو لە قوماندانەکانی دەوڵەتی عوسمانی. پیاوێکی ئەدیب و شاعرە لە شیعری غەزەل و مەدح دەستێکی بەرزی هەبوو. لەگەڵ شێخ ڕەزا دا هەندێ شیعریان بەیەکدا هەڵداوە. لەم شیعرە فارسییەدا، شێخ ڕەزا باسی شاعیری ئەکات و ئەڵێت:

شمشیر بە خون دشمن ئالا

سالار سپاه و میر الا

(توفیق بگ) انکه از تواضع

پست است، ولی برتبه بالا

دیوان قصائدش مرتب

شعر وغزلش علی واعلا

هر حرف از و چو در شهوار

هر نقطه چو کوکبیست والا

واتا:

شمشێری به خوێنی دوژمن ئاله

سالاری سوپا و میر ئالآ

تۆفیق بەگ ئەو کەسەی کە بە توازوع

نزم ئەنوێنێ، بەڵام بە روتبە باڵآ

دیوانی شیعری رێک و پێکە

شیعر و غەزەلی بەرز و باڵآ

هەر بەیتێکی وەک دوڕڕی شایانی شایە

هەر خاڵێکی ئەستێرەیەکی باڵآ

شاید کە صحیفەء بیانش

سازند باب زر محلا

استاد سخن بە مدح والی

پر داختە مدحهای بالا

در نامە چو نافە مشک بیزاست

نوک قلمش بەگاه إملا

ترکیب وجود او بدیع است

در عالم صورت و هیولا

واتا:

شایانی ئەوەیە لاپەڕەی فەساحەتی

بە ئاوی زێڕ برازێنێتەوە

مامۆستای قسەیە لە مەدحی والیدا

دانەری شیعری مەدحی باڵآ

بۆنی میسک دێت لە نامەی وەک ناووکی ئاسک
نوکی قەڵەمی لەکاتی نووسیندا
دروست بوونی شێوەی زۆر جوانە
لەجیهانی صورەت و هیوولادا

گـــــر طرد کـنـد وگــــــر نـوازد
هـرگـــــــز نـکـنـم از أو تـولا
برمــــسند عــــزتم نشــــانده
شـکرانـه، مــــسند مــــعـــــلا
افـــزایش عــــمـــر ومـــال وجــاهش
خــــواهم زجناب حق تعــــالی
گـــر اهل دلـم بســــان تـوفـــیق
تحـــصـــیل کند (رضـــا)ی مــــولی

واتا:
دەرم کا یان دڵم بداتەوە
هەرگیز لێی نابم تەوەللا
لەسەر کورسیی گەورەیی داینیشاندووم
لە شوکرانەی پایە بەرزی خودا
زۆری تەمەن سامان و جاهی
داوا نەکەم لە خوای تەعالا
ئەگەر تۆفیق دڵم بێنێتە جێ
ڕەزامەندیی مەولای دەسگیر دەبێ

توفیق بەگی میرلوا، لە شیعرێکیدا مەدحی رەئووف بەگی دۆستی نەکا. بەڵام شێخ ڕەزا ئەم مەدحەی ڕەئووف بەگ بە زۆر ئەزانێت. لە شیعرێکی تورکی دەڵێت:

نسخەسی گلدی بکا سویلدیک مدح رؤوف
ایچنە بن دخی برنسنە صوقارسەم دیە اوف
بطن فـــضلندن نهـــان نافـــه، حکمت آثار
ینە چیـقـدی قـوقـوسی یعنی ریاح مـألوف

قــوهء شاعــرەیی شـیــعــردن اکـلار عــارف

مــثــلا بعــره ایله اولدی اباعــر مــعــروف

ذات والاکـزی مدح ایتمک شایستـه ایکن

بو تنزل یا قــیــشــرمی سنک ادراکنه یوف

واتا:

نوسخەیەکم پێگەیشت ئەوەی وتووتە لە مەدحی رەئووف

دیسان بۆنی دەرچوو، واتا بای زانراو

توانای شاعیری، زانا، لە شیعر تێ دەگا

وەکوو لە (بعر)ە وە (اباعر) زانرا

کە مەدحی پایە بەرزیتان شایانی مەدح بوو

ئەم نزمییە لەگەڵ تێگەیشتنی جەنابتانا رێک دەکەوێ؟

شــربت شــعــر بخــور تاکــه روانت باشــد

نشــود دفع قــبــوضــیت طبــعت به صــفــوف

برســـیــــه اژدره بـکـزەر قلم تحـــریرک

آچوب آغــزنی ایســتــرســه ایدر عــالمی لوف

واتا:

شەربەتی شیعر بخۆ تا رەوان بیت

قەبزی بەیانیانت بە دەرمانی (قاوت) ئاسا لاناچێ

قەڵەمی نووسینت لە ئەژدەرهای برسی ئەکا

ئەگەر بیەوێ دەم دەکاتەوە و دونیا قووت دەدا

ایش مــوافق گلەمــز اولمســه توفــیق رفــیق

نیک وبد جــملەسی توفــیق اوزرنده مــوقــوف

تخت یا پدرده چابوق اول بزەگــوندر توفــیق

سن دخی قــاچ غــروشن ایله (رضــا)یه مــعــروف

واتا:

ئەگەر تۆفیق نەبێتە رەفیق کار بە رێکی ناگونجێت

گوفتار جوان و بەد لەسەر تۆفیق وەستاوە

تەخت دروست کە زوو کە بۆمانی بنێرە تۆفیق

تویش به چەند غروشێکەوە چاکە لەگەڵ (ڕەزا)دا بکە

شێخ ڕەزا گفت ئەداتە توفیق بەگی میر ئالای کە گۆچانێک و تەسبیحێکی بۆ بنێرێت. دیارییەکان کە بە دەستی خانمی ژنی ئەکەوێت، بەبێ پرسی تۆفیق بەگ گۆچانەکەی گل ئەداتەوە و تەسبیحەکە دەنێرێتە دواوە. تۆفیق بەگ لەسەر نەگەیشتنی تەسبیحەکە هەجوێکی شێخ ڕەزا ئەکات و دیارییەکەی بیر ئەخاتەوە. شێخ ڕەزایش ئەم هەلە لە دەست نادات و ئەم وەڵامەی بە شیعرێکی تورکی ئەداتەوە:

یازدیغک صاچمه سپانی بکا استاد ایتدک
ایتـمـه توفـیق کـه لعنت اوقـونور مـفـتـریه
سکا وعـد ایلەدیکم هدیەلرک عرض ایتـدم
زوجـەکـز خـانمه شـاد اولدی دیدی گل بریه
قلدی اظهـــار فـــرح پشـکشـــمـــدن امــا
مـتکائی چیـویروب سـبحـەیی ویردی گـیـریه

واتا:

ئەو پەلار گرتنەی کە بۆ من نووسیبوت بە هونەری بوو
مەکە تۆفیق کە لەعنەت ئەکرێت لە بوهتان کەر
ئەو دیارییانە گفتم پێت دا خستمە بەردەستی
خانمی ژنتان، شاد بوو و وتی بێرە پێشەوە
خۆشی خۆی، لەوانەی پێشکەشم کرد، دەرخست بەڵام
گۆچانەکەی گل دایەوە، تەسبیحەکەی دایە دواوە.

ئیتر خوێنەوارانی بەڕێز تێ دەگەن کە شێخ چی بە خانمی ژنی وتووە

***

## مەدحی یوسف پاشای میر ئالای بەغدا

لەدەوڵەتی عوسمانیدا قوماندانی لەشکر دەسەڵاتی بەسەر کاربەدەستانی حکومەتەوە هەبوو. ئەوانیش بەبێ لەشکر نەیاندەتوانی کاروباری دەوڵەت بەرنەڕێوە. لەگەڵ ئەوەشدا، بەرتیل وەرگرتنیان بە کارێکی ڕەوا دەزانی. جار جار قوماندانی لەشکر بو بەرهەڵستی دزی و بەرتیل وەرگرتنی مەئموران خۆیان دەنواند. شێخ ڕەزا لەم چەند بەیتە تورکییە

مەدحی یوسف پاشای میر ئالای ئەکا:

طشت زرینی آلوب باشنه دونیـــایی دولاش
اتکی سـور دیەمـز کـیـمـسـه سکا آتلو یواش
بارک الله قـومـاندان فـلاطون تەدبیـر
اختـلاسک اوگنه کیچدی نه آل کسدی نه باش

واتا:

تەشت زەڕین بخەرە سەر سەرت و دونیا بگەڕێ
ئەسپت تاو دە کەس پێت نالێ سوار ئێواش
بارک الله قوماندانی ئەفلاطون تەدبیر
پێشی دزیت گرتەوە، نە دەستت بڕی نە سەر

لەمەدحێکی تریدا، باسی ڕەوشت پاکی و بڵاوکردنەوەی عەدل و نەهێشتنی جۆر دەکات دەڵێت:

کـاشـانهء صـهـبـای سـرور ایتـدی عـراقی
دولدر قـدحی (مـیـرلوا) عـشـقنه سـاقی
اول (یوسف) شـیـرین حـرکـات عـشـقنه بزده
شـیـرین ایدەلم بادەء تلخـیله مـذاقی

واتا:

عیراقی کردە خانەیی بادەی مەیی سەروور
بادەکە پڕکە، بە عەشقی میرلوا، ساقی
با ئێمەش بە عەشقی ئەو (یووسف) و شیرین ڕەوشتە
بە بادەی تەڵخی تامی دەممان شیرین کەین

رفـتـار حکیـمـانه ایله ایلدی پامـال
قـارنجـهء باصـمق سـزن ارباب نفـاقی
آل ویرسـه ایدر گـیـجـه ایله گـوندزی بتـدیل
وادر اوقـدر ردی مظـالـلـه مـراقی
دون جـیـبی کـسـان دامن تقـوایه صـارلمش

باشنده صاریق صانکه اولمش شیخ عراقی
هر حبه‌سی بر قبه قدر سبحه اندده
عراده ایله جنبشه کلمر آن افاقی
ای بخت سیاهم نه اولور بن دخی اولسه‌م
(یعقوب) گبی حضرت (یوسف) له ملاقی
پیغمبر ایکن اولمدی تاب آور هجران
بن نیجه تحمل ایده‌یم بار فراقی

واتا:

به ڕه‌فتاری حه‌کیمان پامالی ئه‌هلی نیفاقی کرد
به‌بێ ئه‌وه پێ له مێرووله‌یه‌ک بنێت
گه‌ر ده‌س بدات شه‌و و ڕۆژ ده‌گۆڕێته‌وه
ئه‌وه‌نده مه‌راقی هه‌یه بۆ لابردنی جۆر
ئه‌وه‌ی دوێنێ گیرفان پڕ بوو داوێن خوا په‌رستیی گرتووه
مێزه‌ر به‌سه‌ره وا ده‌زانی شێخی عیراقه
هه‌ر دانه‌یه‌کی به قه‌ده‌ر گومه‌زێک ته‌سبیحی به ده‌سته‌وه
به عه‌ره‌بانه‌ی گه‌وره‌ش بچووکترین قلی نابزوێ
ئه‌ی به‌ختی ڕه‌شم چی ده‌بێت که منیش ببم
وه‌ک (یعقوب) که له‌گه‌ڵ حه‌زره‌تی یووسف به‌یه‌ک گه‌یشت
که پێغه‌مبه‌ر بوو به‌رگه‌ی ئاگری هیجرانی نه‌گرت
ئه‌ی من چۆن به‌رگه‌ی باری فیراق بگرم؟

بر نامه‌ء تلطیف نوازشله (رضا) یم
اندیشه‌ء بکرن بدل و مهر صداقی
باقی اوله قالدقچه جهان عز و شرفله
قالاقچه جهان عز و شرفله اوله باقی
دونمزسه اگر چرخ و فلک خواهش اوزره
زیر وزیر اولسون فلکک طاق و رواقی

واتا:
به نامەیەکی دڵخۆشکەرەوە رازیم
ئەندێشەی کچ بەدەل و شیربایی و مارەییە
هەربژی بە عیزز و شەرەف تا جیهان ماوە
تاجیهان ماوە بژی بەعیز و شەرەف
ئەگەر چەرخ و فەلەک لەسەر خواهش ئەسووڕێتەوە
تاق و ڕەواقی فەلەک زێڕ و زەبەر بێت.

***

## شێخ ڕەزا و ناظم پاشا

لەدەوری حوکمڕانیی عوسمانیدا،بەغدا ناوچەی وویلایەتی ولەهەمان کاتدا ناوچەی لیوابوو. والی دەستەڵاتی بەسەر چەند لیوایەکدا هەبوو .بۆ نموونە ،عیراق بریتی بوو لەوویلایەتی بەصرە و بەغدا و مووصڵ. کوردستانیش ڕژێمێکی تایبەتی هەبوو کەلە پێشا ئەیالەتی شارەزوور و میرنشینی بەبە و لەپاشان میرنشینییەکە بریتی بوو لەلیوای سولەیمانی، خرایە سەر ویلایەتی بەغدا. لەکاتی هاتنی ئەحمەد ناظم بەگ، کە لە پاشا بووە ناظم پاشا ، شێخ ڕەزا ئەم مەدحەی بەشیعرێکی فارسی ئەکات و دۆستایەتییەکی قووڵ دەکەوێتە نێوانیان.

گنبدی هست کەنامش کفل سیمین است
اندرونش همــــە باآب طلا رنگین است
عشق باسادە روخان ازپی سمت است وسرین
نەرخ وزلف خم اندرخم وچین درچین است

واتا:
گومەزێ هەیە ناوی سمت و کەفەڵی زیوینە
لەناوەوەی هەموو بە ئاوی (طلا) ڕەنگینە
عەشق لەگەڵ سادەڕوان بۆ بووز کەفەڵە
نەک بۆ ڕووزولفی لوول وچین لەسەرچینە

آن دروغست کەمن شیفتەء خاڵ و خطم
شێخ راهم غرض ازسادە پرستی این است

ایها الناس چومن رخت به بەمیخانه بکشید
نەبســـجــد کــه درو زاهدک بی دین است

واتا:

ئەوە درۆیە کە ئەڵێ من شێت و شێواوی خەت و خاڵم
شێخیش هەر ئەم مەبەستەی هەیە لەسادە پەرستی
خەڵکینە ئێوەش وەک من ڕووی بارخانەتان بکەنە مەیخانە
نەک بۆ مزگەوت کە زاهیدی بێ دینی تیایە.

خود دوصد عـیب نهان دارد و إغـماض کند
داسـتـانش همـه از عـیـب من مـسکین است
مـیـتـوانم کـه کـشم کـینه ز دشـمن لیکن
ای عزیزان چەکنم؟ سیتهء من بی کینه است

واتا:

خۆی لە خۆی دا دوو صەد عەیبی هەیە و چاوی لێ نەپۆشێ
داستانەکەیشی هەموو باسی عەیبی منی هەژار و بێ دەستەڵاتە
ئەتوانم کینەی دوژمن تەحەممول کەم بەڵام
برادەرینە چی بکەم سینەی من بێ کینەیە.

چـه غـم ار در نـظـر اهـل ریـا زشـت آیـد
خلقت من که بچشم همـه کس شیـرین اسـت
مـایه ام گـوهر نظم است خـریدارش نیـست
سـالهـا شـد کـه زخـرجی تهـیم خـرجین است

واتا:

خەمم چییە ئەگەر ئەخلاق و ڕەوشتی من
لەبەر چاوی ریابازان ناشرین بێ کە لەبەر چاوی هەموو کەسێکی تردا جوانە
سەرمایەی من گەوهەری شیعرە بەڵام کڕیاری نییە
ساڵەها خورجم خاڵییە لە خەرجی

عـارم آید کـه نویسم به کـسی شـرح نیـاز
جـز به (ناظم) کـه ولیّ النعم دیرین است

حــبــذا قــبلهء ارباب هنر (ناظم بیک)

متـصـرف به شـرف چون فلک پروین است

واتا:

شورەییم لێ دێ نیازی دڵی خۆم بۆ کەس بنووسم

تەنها بۆ (نازم) نەبێ کە خاوەن نیعمەتی لە مێژمە

چاک پیاوێکە (نازم بەگی) قیبلەی هونەرمەندان

تەسەڕوف بە شەرەفەوە ئەکات وەک فەلەک و پەروینە

عـــزم او یافت مگر باد وزان چالاکــست

حــزم او دید مگر کــوه ازان تمکین است

خامه اش گرچه عبارت زیکی شاخ نی است

بلکه در دیدهء اعـــدا به اثر زوبین است

واتا:

با عەزمی لەو وەرگرتووە بۆیە وا چالاکە

کێو ڕەقی لەوەوە دیوە بۆیە سەنگین و بەویقارە

قەڵەمی هەرچەند تەڵە قامیشێکە

لەچاوی دوژمنا، وەک کورتە ڕم تیژ و بڕندەیە

پس بود مــعــدلتش مــایهء ارایش ملک

شهر بغداد چه محتاج به شهر آیین است

خنجر موعظه تا قبضه بدل کار کند

گر چه شمشیر بدست خطبا چوبین است

واتا:

ئەوەندە عەدالەتی بووە بە مایەی ڕازاندنەوەی وڵات

شاری بەغدا کەی موحتاجی داب و دەستووری شارانە؟

خەنجەری ئامۆژگاری تا مستووەکەی کار لە دڵ ئەکا

گەرچی شیری دەستی خەتیبیان دارینە.

گــر ندانم ســخن از نگهت خلقش گــفــتم

روز کــاریست کــه بوی نغم مــشکین است

ای دبیری که بتحسین منت حاجت نیست
زانکه سر تا قدمش تعبیه از تحسین است

واتا:

ئەگەر توانای ئەوەم نەبێ باسی نوکهەیی خەلقی بکەم
دەمێکە بۆنی هەناسەم وەک بۆنی میسک خۆشە
ئەی گەورەیێ کە پێویستت بەوە نییە تاریفی بکەم
چونکە لە تەوقی سەریەوە تا نووکی پێی هەموو چاکەیە.

پایه ات بسکه بلند است ز وصفت خجلم
چند بالا بروم مینگرم پائین است
چمن عمر تو از باد خزان ایمن باد
تاچمن پر ز گل و یاسمن و نسرین است

واتا:

پایەت ئەوەندە بڵندە شەرمەزارم لە تاریفکردنت
هەرچەند بەرز بڕۆم، ئەبینم هەر نزمە
چیمەنی تەمەنت دڵ نیابێت لە بای خەزان
تا چیمن پڕە لە گوڵ و یاسەمین و نەسرین

تا درین دیر مسدس بلآلّ نجوم
پیکر گنبد فیروزه گهر آکین است
ور بکرکوک فروماند (رضا) پنداری
در حصار یست که دیوار و درش رویین است

واتا:

تا ئەم دونیا شەش ڕەنگە بە ئەستیران کە لە دوور ئەچن
گومبەتی ئاسمان کە پیرۆزە زەنگە لە گەوهەر گیراوە
ئەگەر (ڕەزا) لە کەرکووکدا پەککەوتە و ماندووە گومان بکە
لە گەمارۆیەکایە دەور و دیواری مەفرەقە

ناظم بەگ کە ئەم شیعرەی پێ ئەگا نامەیەکی سوپاس و عەبایەکی «ووبر»ی بە دیاری بۆ دەنێرێت، شێخ ڕەزا بە شیعرێکی تری فارسی سوپاسی ئەکات و ئەڵێت:

از من بدوست واسطه یەک صبا بس است
ازوی مرا تعارف یک مرحبا بس است
گردون نمیکشم بطمع چون شتر دراز
درویشرا زی شم شتر یەک عبا بس است

واتا:

لای من بۆ دۆست یەک بای صەبای نامەبەر بەسە
لە دۆستەوە بۆ یەکتر ناسین مەرحەبایەک بەسە
وەکو حوشتر، گەردن بۆ تەماع درێژ ناکەم
دەروێش عەبایەکی لە مووی حوشتری بەسە.

پشمی کفایت است ز پوشیدنی مرا
گستردنی بخانهء من بوریا بس است
ما بندەرا بچیز دیگر احتیاج نیست
این دست خط روانەکە کردی بما بس است

واتا:

پۆشاک خورییەک بەسە بۆ من
بۆ ڕاخستنیش لە ماڵی منا پارچە حەسیرێ سەر و زیادە
ئێمەی بەندە پێویستمان بە هیچی تر نییە
ئەم دەسخەتەی بۆت ناردین بەسمانە

وقتی کە خواجە از سر شفقت غلامرا
درنامە یاد کرد همینش عطا بس است
(ناظم بگم) نواخت فرستاد هدیە ئی
این افتخار بهر من بینوا بس است

واتا:

کاتێ کە گەورە لەبەر بەزەیی هاتنەوە خولامی خۆی
لەنامەیەکا یاد بکاتەوە، ئەم ئەندازە بەخششەی بەسە
نازم بەگ دڵی دامەوە، دیارییەکی بۆ ناردم
ئەم شانازییە بۆ منی هەژار بەسە.

يارب بحق آل عـــبـــايش نگاه دار

كين پنج تن شفاعتشان از خدا بس است

غمگين مشو (رضا) اگرت مال وجاه نيست

اين خواندنت، نبام إمام رضا بس است

واتا:

هەم دڵی بەندەی داوەتەوەو، هەم دڵی بەندە زادەکەیشی

بۆ ئەوە لەم دوو بەندەوە ئەم دوعای خێرە بەسە لە باتی یا:

خوایە: بۆخاتری ئالی عەبا ڕایگری (محمد و فاطمە و علی و حسن و حسین)

چونکە تکای ئەم پێنج کەسە لای خوا بۆ هەر داواتێ بەسە

خەفەتبار مەبە (ڕەزا) ئەگەر پارە و پایەت نەبێ

تەنها ئەمەت بەسە کە بەناوی ئیمامی ڕەزاوە بانگت ئەکەن

ئەم دۆستایەتییەی شێخ ڕەزا و ناظم بەگی موتەسەڕیف تا دێت قوڵتر دەبێت شێخ ڕەزا لەم ستایشەدا کە لەم شیعرە فارسییەدا بۆ ناظم بەگی دەنێرێت، ڕەخنە لە زیان و تەقدیر نەکردنی هونەر و شیعر و ئەدەب دەگرێت. گەردوون وا لە هونەرمەند ئەکات و کەچی هەر کەرێ دێت بە خەروار گەوهەری دەداتێ. بەڵام شێخ ڕەزا شوکرانەی ئەوە دەکات کە خودا، لەجیاتی ماڵ و دەوڵەت، بەهرەی ئەم قسە شیرینەی داوەتێ. لەگەڵ سوپاس ناردنی سەعاتێک بە دیاری، دەڵێت:

روزى كه خدا خلعتى هستى به بشر داد

افسوس كه روزى نه بمقدار هنر داد

تا داد معاشى فلكم عمر بسر شد

وان نيز بەصد كشمكش و خون جگر داد

واتا:

ڕۆژێ کە خوا خەڵاتی بوونی دا بە ئادەمیزاد

داخەکەم کەوا ڕزق و ڕۆژیی بە گوێرەی هونەر بە هەرکەسێ نەدا

تا گەردوون مانگانەیەکی دامێ، تەمەنم بەسەر چوو

ئەویشی بەسەد کێشمە کێش و خوێنی جگەر دا

گردون كه پشيزى بهنرمند فزون ديد

هر جا که خری یافت، به خروار گهر داد
دانا به مثل همچو درختیست برو مند
صد سنگ بسر خورد درختی که ثمر داد

واتا:

گەردوون کە پوولێ بە زیاد ئەزانێ بۆ هونەرمەند
لە هەرکوێ کەرێ ببینێ بە خەروار گەوهەری ئەداتێ
غوونەی پیاوی زانا وەک دارێکی بەردار وایە
هەردارێ بەر بدا سەد بەرد ئەدرێ بە سەریا

با این همه کم طالعی و تلخ مذاقی
صد شکر که شعرم مزهء قند و شکرداد
تنهانه همن شعر خوش وگفتهء شیرین
المنتة لله که مرا فضل دیگر داد

واتا:

لەگەڵ ئەم گشتە کەم بەختی ودەم تاڵییە
سەد سوپاس بۆ خوا کە شیعرم تامی شەکر ئەدا
تەنها ئەم شیعرە خۆش و قسە شیرینانەم نییە
منەتی خوا ئەزانم کە گەورەییەکی تریشی داومەتێ

این هم کرم اوست وگرنه متصرف
از بهر چه نادیده مرا ساعت زر داد
ناظم بگ دانا، که خداوند توانا
اورا نه همین میمنت و شوکت و فرداد

واتا:

ئەمەش هەروا بەخششی ئەوە، ئەگینا موتەسەڕیف
لەبەرچی لە ئەدیتوو سەعاتی زەڕی دا بەمن؟
نازم بەگی دانا کە خواوەندی توانا
هەر تەنها ئەم بەرەکەت و فەڕ و شەوکەتەی ئەداوەتێ

ادراک فلاطون و جوانمردی حاتم،

مـــرادنگی حـــیـــدر و انصـــاف عـــمـــر داد

دلخـــواه ازان گـــشت کـــه از نگهت خلقش

در نافـــــه ء آهوی خطا مـــــشک تتــــرداد

واتا:

تێگەیشتنی ئەفلاتوون و بەخشندەیی حاتەم و

مەردایەتیی حەیدەر و دادپەروەریی عومەری داوەتێ

لەبەر ئەوە دڵی خۆشە کە لە نوکهەی ڕەوشتی

لە ناوکی ئاسکی خەتا مسکی تەتار ئەدا

عـــــزمش جـــبل قـــــاف تواند بفلک برد

قـــدرش صـــفت آب تواند بحـــجـــر داد

در بزم چوشد حاصل و کانرا همه بخشید

در رزم چوشـــد خـــون یلانرا بهـــدر داد

واتا:

عەزمی ئەتوانێ کێوی قاف بگەیەنێتە ئاسمان

قەدر و حورمەتی ئەتوانێ بەرد بتوێنێتەوە و بیکا بە ئاو

کە چووە ناو بەزمەوە هەرچی بووە و هەرچی هەیە گشتی ئەبەخشێ

کە چووە مەیدانی شەڕەوە خوێنی قارەمانان ئەدا بە ئاوا

در یوزه ء انوار تواست مـــهـــر جـــهـــان گـــیـــر

از رای منیـــرت کـــه خـــجـــالت بقـــمـــر داد

مـــهـــر و غـــضـــبت را پی پاداش بدونیک

از روز ازل فـــــــاعـل مطلق دو اثر داد

واتا:

ڕۆژی دنیا گرەوە سوالی ڕۆشنایی لە بیروڕای ڕێ ڕۆشنکەرەوەی تۆ ئەکا

کە شەرمەزاریی بەسەر مانگا هێناوە

خۆشەویستی و ڕقی تۆ بۆ پاداش دانەوەی چاکە و خراپە

هەر لە ڕۆژی سەرەتاوە خواوەند کە هەموو شتێ هەر خۆی ئەیکا دوو کاری پێداون

این را عـــمل رفـــعـــه و، آنرا عـــمل جـــر

آرایش احکام بدین رفـــعـــه وجـــر داد

أز عــمــر گــران مــایه، خــود بهــره نبــیند

بد گـــوی تراهـم کـــه بکوی تو گـــذر داد

واتا:

کاری بەرز کردنەوەی داوە بە خۆشەویستیت کاری ڕاکێشانی داوە بە ڕقت

(واتە ئەوەی بەر خـۆشـەویسـتـیـت بکەوێ پایەی بەرز ئەبێـتـەوە و ئەوەی بەر ڕقت بکەوێ ڕائەکێشرێ)

ئەوەی کە خراپەی تۆی ئەوێ و بە کۆلانی تۆدا گوزەر ئەکا

بەهرە لە تەمەنی بەدبەختی خۆی نابینێ

آن بەکـــــه دعـــــایت کنـم و هرزه نـگـویم

کین هرزه دورایی (برضــا) سـخت ضــررداد

یـارب بە جــهـــان بادترا هرچه مـــرادست

یـارب زدرت بـاد بـدر هـرچه کـــــــدر داد

واتا:

چاکتر ئەوەیە زیادە گۆیی نەکەم و دوعای خێرت بۆ بکەم

چونکە زیادە گۆیی زیانی زۆری بە(ڕەزا) گەیاندووە

خوایە تۆ هەرچیت مەبەستە لە دنیادا بۆت بێتەدی

خوایە هەرکەس نارەحەتیت پێ نەگەیەنێ لە دەرگات وەدەرکەوێ

لەم شیعرە فارسییەدا، شێخ ڕەزا، خۆی بە حەکیم دادەنێت، دەزانێت ستایشی بۆ کێ دەکـات و لەعنەت لەکێ، و ڕێز لـەکێ دەگـرێت و پەلار لەکێ دەوەشێنێت و لەئەنجـامـدا مەدحی ناظم بەگی موتەسەڕیف دەکات و دەڵێت:

بـکـار آرد حـکـیـم مـــــــــصلحت بـین

گـــــهی داروی تلـخ و گـــــاه شـــیـــرین

بمحـــــــروران نبـــــایـد انگـبین داد

نســـازد با مـــزاج گـــرم تســـخین

مــــیــــاور شـــربت گلقند و بـادام

کـــەداروی جـــعـل بشکست و ســرگین

پی صـــفـــرا مـــزاجـــان گـــرچه زهرابت
بود (عین الشـــفـــا) حب الســـلاطین

واتا:

پزیشکی مەصلەحەت بین
جارێ دەرمانی تاڵ دەدا و جارێ شیرین
نابێ هەنگوین بدرێ بە ئادار
گەرم کردن لەگەڵ میزاجی گەرم ناگونجێ
شەربەتی گوڵاوو شەکرو بادام مەهێنە
چونکە دەرمانی قاڵۆنچە پشقل و ریخی وڵاخە
بۆ سەفرا میزاجان هەرچەنێ ژارە
دەبێتە مایەی چاکییان (حەب سەلایێ)

چو بینی خـــون فـــاســـد در دمـــاغش
فـــرو برد در قـــفـــایش نشـــتـــرکین
زخـــیل شـــاعـــران من هم حکیـــم
گـــهی گـــویم هجـــاو گـــاه تحـــسین
همی گـــویم نکویانرا ســـتـــایش
همی خـــواهم بدانرا لعن و نفـــرین
بکام دوســـتـــان ریزم تبـــر زد
زنم برفـــرق بدخـــواهان تبـــرزین

واتا:

ئەگەر خوێنی پیست لە دەماغی داوی
نەشتەری ڕەق بەملیا بەرەو خوار بێنە
لەناو خێڵی شاعیراندا منیش حەکیمم
جارێ هەجو ئەکەم و جارێ تاریف
ئەوەی تاریف ئەکراوە تاریفی ئەکەم
بۆ خراپانیش لەعنەت و نەفرەتم دەوێ
شەکری کەللە بە ئارەزووی دۆستان دەوەرێنم
تەوەرزینیش ئەدەم بە کەللەی بەدخوا هانا

کریمانرا دهانم کوزهء شهد

لئیمانرا زبانم تیغ روبین

معاذ الله زبان آتشینم

(جعلناها رجوما للشیاطین)

ستایش راست ناظم بگ سزاوار

نظام ملک وملت (ناصر دین)

جهان محتاج رایش زانکه دارد

دل روشن تر ازجام جهان بین

واتا:

دەمم گۆزەیی پڕ لە هەنگوینە بۆ چاکان

زبانیشم تیغی پۆلایینە بۆ نامەردان

پەنا بە خوا لە زبانی ئاگرینم

(جعلناها رجوما للشیاطین)

تاریف کردن لایقی ناظم بەگە مایەی ڕێک و پێکێ وڵات و لایەنگیری گەل و ئایین

دونیا پێویستی بەبیروڕای ئەوە چونکە دڵی لە جامی جیهان ڕۆشنترە

بیا روزی تماشا کن سواریش

بدوش اشقر اندر خانه زین

واتا:

ڕۆژێ وەرە تەماشای سواریی بکە

بەسەر زینی ماینە شێیەوە

گرفت آوازهء عدلش جهانرا

ز(مرز روم) تا دروازهء چین

چو بانگ سازمی آید بگوشش

برزم اندر خروش نای زرین

کند بر فرق محتاجان گهرپاش

زابر رحمت از بالا به پایین

نگهبان سریر شهریاران

بلی شـــهـــرا نگهـــبـــان است فـــرزین

واتا:

ناوبانگی دادپەروەریی جیهانی گرتووەتەوە
لەسنووری رۆمەوەتا دەروازەی چین
کاتێ کە هاواری (ساز) دێتە بەر گوێ
لەمەیدانی جەنگا لە هاتنە خرۆشی نایی زێڕینەدا
گەوهەر بەسەر سەری هەزاران بڵاو ئەکاتەوە
لە هەوری ڕەحمەتەوە لەسەرەوە تا خوار
پاسەوانی تەختی پادشاهانە
ڕاستە (فرزین) پاسەوانی (شاه)ە

عـــــروسی بـکر فکرم را بـخــــــواهد
شـــــبی در برکــــشــــد تا داد کــــابین
ازین مـــدحم غـــرض خـــوشنودی اوست
بـود آری دعـــــــا از بـهــــــــر آمـین
اگـــر خـــواهی بچـــشم خـــویش بینی
روان بـرباد صــــرصــــر کـــــوه تمکین
خـــــــــــداونـدا بـحـق نـور طـه
خـــــــداوندا بجـــــــاه آل یـاسـین
بتــــابد کــــوکب جـــاه وجــــلالش
بـعـــــالم تا بتــــابد مـــــاه و پروین

واتا:

بووکی (بکر)ی بیرمی ئەوێ
شەوێ بیگرێتە باوەش تا مارەییەکەی بدا
مەبەست لەم مەدحەم خوشنودیی ئەوە
بەڵێ ببێتە بۆ ئەو ئامین
ئەگەر ئەتوانی بە چاوی خۆت ببینی
چۆن کێوی قدەر و ویقار بە کۆڵی بای سەرسەرەوە ئەڕوا
خودایا بۆ خاتری نوری پێغەمبەر

خودایە بۆ خاتری پایەی نالی یاسین
ئەستێرەی شان و شکۆی بدرەوشێتەوە
لە جیهانا تا مانگ و ئەستێرەی حەوتەوانە ئەدرەوشێنەوە.

***

## مەدحی گوڵ وەزیری چایچی

گوڵ وەزیر، کوردێکی فەیلی دەبێت. لە بەغدا، لە گەڕەکی مەیدان چایخانەکەی جێگای کۆبوونەوەی شاعیر و ئەدیبان بووە. شێخ ڕەزا لەم شیعرە تورکییەدا، باسی جوامێردیی ئەکات کە چۆن لە ڕۆژی بیرەوەریی هاتنە سەرتەختی سوڵتان، چای بە بەلاش گێڕاوەو ئاهەنگێکی ڕێک خستووە.

گل وزیرک مجمع خوبان اولان چایخانەسی
جوهر روح روان در جرعەء و پیمانەسی
قوردیغی کورسیلر اوزره خوب و رویان عراق
آل یناقلر هربری یاقوت و مرجان دانەسی

***

بویلە بزم دلفریبی گورسە شێخ خانقاه
مانع اولمز رقصنە واعظلرک افسانەسی
پادشاهک جاننە برینده سیدر (گل وزیر)
ایستەمز الا (رضا)ی حضرت شاهانەسی
آقچەلر صرف ایتدی شهر آیین ایچون روز جلوس
یوق ایکن بر آقچە بیت المالدن ماهانەسی
چای ایچون بیکلرجە اجرت ویرمیان آدملرە
منت ایتمز، افرین طبع جوانمردانەسی
ایسترسە ایلر ستایش ایسترسە ایلر هجا
لا ابالیدر (رضا)نک مشرب رندانەسی

واتا:
چایخانەی گوڵ وەزیر کە جێگای کۆبوونەوەی جوانانە

جەوهەری ڕوحی ڕەوانە قوم لێدان و پەیمانەی
لەسەر ئەو کورسییانە کە داینــاوە ڕوو جوانانی عیراق
ڕوومەت ئالان هەر یەکە وەک دانەی یاقوت و مەرجان

***

ئەگەر شێخی خانەقا ئەم دڵ خەڵەتێنەی ئێمە ببینێ
وەعز و ئەفسانەی واعیزان نابێتە مانیع بۆ سەمای
بۆ گیانی پادشاه بەندەیەکە (گوڵ وەزیر)
نایەوێت، تەنها (ڕەزا)ی شاهانەی نەبێت.

***

ئاقچەیەکی زۆری خەرج کرد بۆ ئاهەنگی ڕۆژی (جلوس)
لە کاتێکدا یەک ئاقچەی مانگانەی لە خەزێنەوە نییە
بۆ هەزاران کەس کە پارەی چاییان نەداوە
مننەت ناگات، ئافەرین بۆ طەبع جوانمەردی
بیەوێت مەدح ئەکا و بیەوێت هەجو ئەکا
بێ باکە مەشرەبی زیرەکی (ڕەزا).

***

## شێخ ڕەزا و موفتی زەهاوی

موفتی زەهاوی.. مەلا و دانای کورد، محەمەد فەیضی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی حەسەن بەگی کوڕی ڕۆستەم بەگی کوڕی کەیخەسرەو بەگی کوڕی بابا سولەیمانە، کە باپیرە گەورەی میرانی بەبەیە. لە ساڵی ١٣٠٨ لە شاری سولەیمانیی کوردستانی خواروو هاتووەتە دونیاوە. باوکی لە میرانی بەبە و دایکی خەڵقی زەهاوی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە. لەبەرئەوەی لە زەهاودا ژیاوە، نازناوی زەهاوی وەرگرتووە. لە تەمەنێکی درێژ نزیکەی صەد ساڵ، هەشتا ساڵی بە مەلایی و مامۆستایی و لەمە ٣٨ ساڵی موفتیی بەغدا بووە. خوێندنی زانستی ئیسلامیی لەلای مامۆستای دانا شێخ مارفی نۆدێیی و زانستی بەیان و بەلاغەی لەلای شێخ عەبدوڵلای خەرپانی لە هەڵەبجە و لەپاشان زانستی حیکمەت و فەلسەفە و ڕیازیاتی لەلای شێخ محەمەد قەسیم مەردوخی لە سنە و لەپاشان دەچێتە سابلاغ (مەهاباد) لەلای مەلای دانا محەمەد ئیبنو ڕەسوول کۆتایی بە خوێندن دێنیت.

موفتی محەمەد فەیضی زەهاوی، بە زوبانی کوردی و عەرەبی شیعری وتووە بۆ نموونە، لە شیعرێکی کوردیدا دەڵێت:

وتم، لە بەغدات ژن هێنا
هەم لەم بەری هەم لەو بەری
بۆ نۆبەیان بە حوکمی دین
هەم لەم بەری هەم لەو بەری
تا بە تەقاضای جەماڵیان
هەم لەم بەری هەم لەو بەری
دەوڵەمەندیشن تاکە ماڵ
هەم لەم بەری هەم لەو بەری

ئەم شیعرەی موفتی زەهاوی کە لەژمارەی (٥٠) ساڵی ١٩٩٢ی گۆڤاری ڕەنگین بڵاوکرایەوە، بووە هۆی کێشە و بەرە لە نێوان نووسەراندا ئایا شێخ ڕەزا کە دەڵێت:

ماڵی موفتی لەم بەرە، مەعلومە قاضیش لەو بەرە
من فەقیرم کێ دەزانێ لەم بەرم یا لەو بەرم

ئایا موفتی لە شێخ ڕەزای قۆستووەتەوە یان شێخ ڕەزا لەو. ئەوەی زانراوە، شیعرەکانی شێخ ڕەزا لە هەر شارێک وتوویەتی کەوتووەتە سەر زوبانی دانیشتوانی ئەو شارە.
ئەم شیعرەی شێخ ڕەزا زۆر دەمێک بوو بەسەر زوبانی کەرکوکییانەوە بوو کە بە موفتیی کەرکوک دەروێش ئەفەندی و قاضیی کەرکووکی وتووە.
موفتی زەهاوی لە شیعرێکی عەرەبیدا کە بۆ سەرخۆشی کردن لە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا خدری بە بۆنەی کۆچی دوایی مەلا سولەیمانی خدری باوکی ناردوویەتی ئەڵێت.

ألا انما الدنيا سجيتها الغدر
فليس لمغرور بزخرفها عذر
فظاهرها ودٌّ وباطنها قلىً
وادبارها خيرٌ واقبالها شرٌّ
ورغبتها غيٌّ ورهبتها هوىً
وطالبها عبدٌ وهاربها حرٌّ

وعـزتها ذلّ وفـرحـتـهـا أسى

وصحتـهـا سقم وثروتهـا فقـر

شێخ ڕەزا لەو ساڵانەی کە لە بەغدا ژیاوە، لە سەرەتاوە دۆستایەتیی لەگەڵ موفتی زەهاویدا پەیدا کردووە. کە باسی زیرەکیی موفتی ئەکات ئەڵێت:

مومکن نییـە ئیدراکی حەقائیق بە تەواوی

مـومکن نییـە ئیدراکی نەکا زیهنی زەهاوی

هەروا لە بەیتێکی تریدا دەڵێت کە گێتی هێشتا یەکێکی تری وەکو زەهاوی نەهێناوە.

ئەی مـادەری گـێـتی تو هەتا ایسـتـە نەزاوی

زاتێکی وەکـو فـەیضی ئەفـەندیی زەهاوی

چونکە موفتی لە فەلسەفە و مەنطیق زۆر شارەزا بوو. بەڵام لە دواییدا دژایەتییەکی قووڵ ئەکەوێتە نێوانیان و بەچوار زوبان، کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی هەجوی موفتی و جەمیل صدقی کوڕی ئەکات.

ئەگەر لە بن و بنچینەی ئەو ناکۆکییە قووڵ ببینەوە، تەنها لەم شیعرە تورکییەدا شێخ ڕەزا تروسکەیەک لە هۆی ئەو ناکۆکییەمان بۆ دەرئەخات کە ئەڵێت:

گـرچە علمندن طولایی مـفـتی بغـداد ایمش

زوجـەسی کـرخـانەلردن چقـمـە برگـواد ایمش

قـاتل عـبد العزیز خـان، مـدحت ایلە مـتـفق

فکرینە خـدمت ایدوب خـائنلرە امـداد ایمش

واتا:

هەرچەندە لەبەر دانایی موفتیی بەغدا بوو

ژنەکەی لە کارخانە دەرچوو، گەوادێک بوو

لەگەڵ (مەدحەت) کوشتیاری عەبدولعەزیز خان، هاوبیر

خدمەتی بیری دەکا و یارمەتی خائینان بوو

لەمەدا دەرئەکەوێت کە موفتی ڕۆشنبیرێکی عەسری و پێوەندی لەگەڵ ڕۆشنبیرە عیلمانییەکانی تورک پەیدا کردبوو، کە شێخ ڕەزا هەر چەندە ئەویش کەوتبووە تەقەوە لە سوڵتانی عوسمانی و کاربەدەستانی، بەڵام ڕقێکی زۆری، لە ئیتحادییەکانیش بوو،

چونکە لە حوکمی قورئان و ئایین دوور دەکەوتنەوە.

یەکێک لە زاناکانی عەرەبی ئەو سەردەمەی بەغدا، (مەحموود شوکری ئالووسی) کە حەسادەتی بە موفتی دەبرد دەڵێت:

«أما علمه، فقد كان له بعض الالمام بمنطق اليونان وحكمتهم التي هي من الخرافات ومحض الهذيان. وتقلده للافتاء أتى لما يريده الله من خراب العالم وانذاراً بقرب الساعة، حيث انه ورد، ان من علاقاته، ان تتوسد الأمور الى غير اهلها».

هەروا دەڵێت:

«انه كان متفقاً مع مدحت پاشا الذي تسبب لقتل امير المؤمنين عبدالعزيز خان، انه كان يخدم فكره ويعين الخائنين لدينهم ودولتهم، كما لا يخفى على من عاشره واطلع على سوء احواله، فقد كان من عاداته المعلومة موافقة الحكام على غيهم وضلالتهم، يحسن منكرهم ويزين باطلهم ويسبب ذلك تمكنوا من تنفيذ اهوائهم ونيل شهواتهم. لذلك عتب بعض السلف على من كان يحضر مجلس امراء الحكومة ورؤساء الدولة مما لامجال لذكره»

(نامیلکەیەکی دەس نووس ئالووسی ـ کتێبخانەی موزەی بەغدا)

لەم بەڵگانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە موفتی زەهاوی شارەزایی لە فەلسەفە و مەنطیق و حیکمەتی یونان هەبوو کە توندڕەوەکانی ئیسلام، فەلسەفە بە (هرطقه) دادەنێن. هەر دوو دڵی یەک بەرامبەر دروست کردن و بوونی ئەزەلیی کائنات هەرطەقەیە، چونکە بە پێچەوانەی ئیمامی موتلەقی ئیسلامە. هەر لەبەر ئەم بیرە توندانە، لە کاتی خۆیدا، ئەو فەیلەسووفەی کە بنەڕەتی فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی دانا، کە (محەمەد کوڕی طورخان کوڕی ئوزلغ) فارابی بوو، لە بەغدا دەریانپەڕاند و چووە حەلەب و خۆی دایە پاڵی سەیفوددەولە ـ ئەلحەمدانی.

ئەم بیرەکراوەی موفتی زەهاوی وای لێ کردووە کە لە بیروباوەڕدا لە ڕۆشنبیرانی دەوڵەتی عوسمانی نەک لەگەڵ سوڵتانی کۆنە پەرستی ئوتۆقراتی، کە ناوی «امیر المؤمنین»ی لە خۆ نابوو، نزیک بێت. چونکە ئایینداڕانی ئەو سەردەمەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی سوڵتانیان بە پارێزەری وڵاتی ئیسلام و ئایینی ئیسلام دادەنا. مەدحەت پاشایش یەکێک بوو لە ڕۆشنبیرانی ئیتحاد و تەرەقی کە بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی دەرەبەگی عوسمانی تێدەکۆشان. شێخ ڕەزاو شێخی ئالووسی هەر هاوکارییەک لەگەڵ ئەو جۆرە

پیاوانەیان بە خائینی ئیسلام دادەناو هەموو جۆرە قسەو باڵۆرەیان بۆ دروست دەکرد. دەبێت ئەوەش بزانین ئیتحادییەکانیش بۆ پاراستنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سیاسەتێکی ڕەگەز پەرستی توندیان بەرامبەر میللەتانی غەیرە تورک بەکاردەهێنا کە لەگەڵ ئامانجی ئەوان نەدەگونجا.

پرۆفیسور ا. ف. میلر دەڵێت:

«ئیتحادییەکان لە بیری یەکیەتیی عوسمانیدا مەبەستیان ئەوە بوو کە هەموو میللەتانی تریش بکەنە تورک»

شێخ ڕەزایش لە سەرەتای ژیانی سیاسیدا، لەسەر هەمان باوەڕی دژی هاوکاری کردن لەگەڵ ئیتحادییەکان بوو. بەڵام بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی تا دەهات ئاڵۆزتر دەبوو، نە سوڵتان و نەیش ئیتحادییەکان چارەسەری ئەو گیروگرفتانەیان پێ نەدەکرا. یاسای بنەڕەتی، هەرچەندە زۆربەی دەسەڵاتی سوڵتانی دایە دەستی ئیتحادییەکان، بەڵام هیچی لە ژیانی میللەتانی ژێر دەستی تورکی نەگۆڕی. وەکو لە پێشەوە وتمان، شێخ ڕەزایش هەستی بەمە دەکرد بەڵام وای دەزانی گەڕانەوە بۆ حوکمی قورئان تەنها ڕێگایەکە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی میللەتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەکو دەڵێت:

بیچارە عدالت کە ییقلمشدی بناسی
بردن ایچنە سیچدی بو قانون اساسی
قانونی الهی وار ایکن یعنی شریعت
قانون هذیاندر چە سیاسی چە أساسی

واتا:
عەدالەتی بێچارە کەبیناى ڕووخا بوو
بەیەکجاری گووی تێکرد قانوونی ئەساسی
قانوونی خودایی هەبێت، یانی شەریعەت
قانوون وڕێنەیە، سیاسی بێت یا ئەساسی

هەر لەگەڵ پەرەسەندنی بیری نەژادپەرستانی تورک، بیروباوەڕی نەژادی میللەتانی تریش سەری بەرزکردبووەوە. ئیتر نە زەبر و زۆری سوڵتان، کە شێخی ئالووسی بە«أمیر المؤمنین» ناوی دەبات و نەیش کوشتن و بڕینی ئیتحادییەکان، کەموفتی زەهاوی و

جەمیلی کوڕی هاوکارییان لەگەڵ دەکردن، چارەی گیروگرفتی وڵاتی نەدەکرد. هەر لەم سووچەوە دەبێت تەماشای هەجوەکانی شێخ ڕەزا و قسە هەڵبەستەکانی شێخی ئالووسی بەرامبەر موفتی زەهاوی بکرێت. موفتی زەهاویش زیرەک بوو دەیزانی چۆن خۆی بپارێزێت. هەتا دەیگێڕنەوە کە ڕۆژێک موفتی زەهاوی و مەحموود شوکری ئالووسی لەسەر تەختێک دانیشتبون و سەرینێک لە نێوانیاندا دەبێت.

ئالووسی شەڕ دەفرۆشێتە زەهاوی و دەڵێت: «مالفرق بینک وبین الحمار؟».

زەهاوی گورج وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: «هذه الوسادە» یانی کەرەکە تۆی! موفتی خۆی و جەمیلی صدقی کوڕی ئەدیب و شاعیر بوون. بەڵام تاکو ئێستا لە تەنها بەیتێک بەولاوە کە جەمیل صدقی زەهاوی وەڵامی شێخ ڕەزای داوەتەوە هیچی ترمان دەس نەکەوتووە. جەمیل صدقی دەڵێت:

هجانا الرضا من غیر داع لهجونا

کذاک کلاب الحي بالطبع تنبح

کەوابوو، ناکۆکی لە نێوان شێخ ڕەزا و موفتی زەهاوی و جەمیلی کوڕی، کە ئەو هەموو هەجوە توند و تیژانەیانی کردووە، لەسەر دژایەتیی بیروباوەڕی سیاسی بووە. شێخی ئالووسیش پێی ناخۆش بوو لە شارێکی وەکو بەغدا مەلایەکی کوردی وەکو موفتی زەهاوی ٣٨ ساڵ موفتی بێت کە هیچ گومانی تێدا نییە خۆی بە پڕکەرەوەی ئەو جێگایە دەزانی و شێخ ڕەزایشی هان داوە دژی موفتی.

***

### هەجوەکانی شێخ ڕەزا دژی موفتی زەهاوی

شێخ ڕەزا بەکوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی هەجوی موفتی زەهاوی و فامیلیای کردووە. لە بەیتێکی کوردیدا ئەڵێت:

حەیزی کوزی حیز و دزی فەیرووزە گوواوی

مەعجوونی خەنە و وەسمەیە بۆ ڕیشی زەهاوی

لە شیعرێکی فارسیدا بە جەمیل صدقی زەهاوی دەڵێت:

نشوید گر درامیزد باب دجلە جیحونرا

ز شهوت دامن آلودهء فیروزە خاتونرا

توانی یافت چون گـردش کنی در کـوچهء فـرجش
عـمـود سـام و رخش رسـتـم و گـرز فـریدونرا

واتا:

ئەگەر ئاوی دیجلە تێکەڵی ئاوی جەیحوون بکەیت
داوێنی پیس و ئاڵوودەی فەیرووزە خانم داناشۆرێ
ئەگەر بە کووچە و کۆڵانی قوزیا بگەڕێی
ستوونەکەی سام و ڕەخشەکەی ڕۆستەم و گورزەکەی فەرەیدوون ئەدۆزیتەوە.

جـمـاع مـفت اگـر خـواهی برو در خـانهء مـفـتی
که آنجا قدر یک جو نیست صد خرمن کس وکونرا
ز خـردل دانهء کـمـتـر نماید گـر دراندازی
بسـوراخ فـراخ خـواهرش دریا و هامـونرا

واتا:

ئەگەر گانی بەلاشت ئەوێ بڕۆ ماڵی مفتی
لەوێ سەد خەرمان قوز و قنگ قەدری یەک دەنکە جۆی نییە
ئەگەر دەشت و دەریا بخەیتە کونی قوزی خوشکیەوە
لەدەنکە خەرتەلەیەک کەمتر ئەنوێنێ

مـیـان هردو ران خـواهرانش جنگلسـتـانیـست
کـه انجا خفـتـه بینی صد هزاران خرس ومیمونرا
شکـاف زیر، ناف خـاتم فـیـروزەرا نازم،
کـه در زیر نـگین دارد تمام ربع مـسکونرا

واتا:

لە نێوان هەردو رانی خوشکەکانیا دارستانێکە
هەزاران ورچ و مەیموونی تیا نووستوو دەبینی
شانازی بە درزی ژێر ناوکی ئەموستیلەکەی فەیرۆزە (پیرۆزە) خانەوە بکەم
کەتەواوی چواریەکی خەڵک تێدا ژیاوی تۆپی زەوی لە ژێر نقێمەکەی خۆیا ڕاگرتووە

سـەچندان سـپـاه روس لوطی در عـقب دارد
اگـر خـواهد باسـانی بگیـرد ملک (جـاپونرا)

بشـاخ (کـرکـدن) تسکین نیـاید خـارشی کـونش
چه خـواهد کـرد کـیـرم جـمـیل پشت و مـأبونرا
اگــر هریکی زان لوطیــان یک پارەبســتــانند
بأندک مــدتی جـمـع آورند صـد گنج قــارونرا

واتا:

سێ ئەوەندەی لەشکری ڕووس گانکەری بە دواوەیە
ئەگەر ئارەزووی لێ بێ ولاتی ژاپۆن بە ئاسانی ئەگرێ
چزووی قنگی بە شاخی کەرگەدەنگ ناشکێ
ئیتر کێری من چی ئەتوانێ بکا بۆ جەمیلی پوشت و قنگدەر؟
ئەگەر لە هەرکام لەو گانکەرانە یەکێ پارەیێ وەربگرن
لەماوەیەکی کەما سەد گەنجی قاروون کۆئەکەنەوە

لە جنێوێکی تریدا بە شاعیر جەمیل صدقی، لە چوار بەیتی فارسیدا دەڵێت:

زدم بە کــون (جـــمـــیل ابن مــفــتی بغــداد)
کـــشـــیـــد گـــوزی و گـــفـــتم بروح ابن زیاد
کـشـیـد گـوز دیگر چون فـرو کـشـیـدم ازاو
ازان مـــزیـد تـعـــفـن یـزیـدم آمـــد یـاد

واتا:

کوتامە قنگی جەمیلی کوڕی مفتیی بەغدا
بایەکی لێ بەربوو، وتم: بەڕوحی ئیبنو زیاد
کە لێم دەرکێشایەوە، بایەکی تری لێ بەربوو
لەوە گشتە بۆگەنییەوە یەزیدم هاتەوە یاد

لە شیعرێکی عەرەبیشدا دەڵێت:

قـبيل الموت قـال ابو جـمـيل
لزوجته اصبري صبراً جميلا
فلم تصبر على الفحشاء يوماً
وقد جعلت سبيليها سبيلا

وەلە شیعرێکی فارسیدا بەرامبەر بە زەهاوی زادە کە قائم مەقام بووە دەڵێت:

(زهاوی زاده) گرچه قائمقام است
خدای ما عزیز و ذو انتقام است

واتا:

هەر چەند زەهاوی زادە قائمقامە
خوای ئێمەش (عزیز ذو انتقام)ە

لە جنێوێکی تری بە جمیل زەهاوی لە بەیتێکی فارسیدا دەڵێت:

مرا هست کیری چ و بازوی پیل
بکونی ساده رخان و جمیل

واتا:

کێرێکم هەیە وەکوو قۆڵی فیل
بە قنگی لووسان، بە قنگی جەمیل

هەروا لە جنێوێکی تریدا بە تورکی دەڵێت:

سَورمەدان مادرک سیکدن یمش ملیونجە میل
کیم بیلور سن هانگی کلبک یاوروسی سن ای (جمیل)

واتا:

کلدانی دایکت لە کێر ملیۆن میلی پێدا چووە
کێ ئەزانێت تۆ بەچکەی کام سەگیت ئەی جەمیل

خانم فیروزه خانم حالی اوزره قالمامش
صانکی بر اسکی بنادر خانهء در خورده فیل

لە شیعرێکی عەرەبیدا بە جەمیل صدقی زەهاوی بە پێنج خشتەیەکی شیعرێکی پێشووی دەڵێت:

یاجمیلاً ماله عرض ولا فعل جمیل
انت من ماء الزنا انزلت جیلاً بعد جیل
حسبنا قول (الرضا) ان قلت فأتوا بالدلیل
سورمدان مادرن سیکدن یمش ملیونجه میل

کیم بلور سن هانگی کلبك یاوروسیسك اي جمیل

هەروا لە شیعرێکی تری عەرەبیدا دەڵێت:

لیس شعری مثل: یا ارض ابلعی

معجز لکنه سحر حلال

بنت فکر مالها من خاطب

لا لیفقد الحسن بل قحط الرجال

لە شیعرێکی تورکیدا بە جەمیل صدقی زەهاوی دەڵێت:

جمیلک یاشی قاچدر، جدی کیمدر، کیم بلور آدنێ؟

اشک بیطار لرندن صور ملی تاریخ میلادی

وطندن ایلمشلر بر طاقم جنگانەلر هجرت

کلوب بغداده برباد ایتدیلر ناموسی بغدادی

واتا:

تەمەنی جەمیل چەندە، باپیری کێیە، کێ ناوی ئەزانێ؟

لە بەیطاری کەر دەبێ بپرسن مێژووی لە دایک بوونی

لە نیشتمان، دەستەیەکی جنگانە، کۆچیان کردووە

هاتنە بەغدا، ناموسی بەغدایان بەرباد کرد

اگر پشت ایسە تعییب ایتمە تأثیر نسبدندر

طبیعی پشت اولور ابناء پشتک آل اولادی

واتا:

ئەگەر پوشت بێ بە شوورەیی مەزانە تەئسیری نەسەبە

بێ گومان پوشت ئەبێ ئەولادی پوشت کەسوکاری

هەروا لە بەیتێکی تری تورکیدا دەڵێت:

قزلری فاحشەدر، بچەلری کونداده

سیکن ویر هرکمی بولدنسە زهاوی زاده

واتا:

کچەکانیان قەحپەن و منداڵەکانیان قووندەر

کێرت بدە هەرکەسێکت دی لە زەهاوی زادە

شێخ ڕەزا لە شیعرێکی عەرەبیشدا بە جەمیل دەڵێت:

قــال الرضــا لجــمــيـل، حين قــال لـه:
يا شـــيـخ هل لك من مـــيـل الى دبري؟
ايرى تقــوس واســتــرخت مــفــاصله
مـــثـل العـــجــوز حناها شـــدة الكبـــر
يقـــوم حـــينا يريد البـــول منحنيـــا
كـــــأنـه قـــــوس نداف بـلا وتـر
ولا يقـــوم اذا نبـــهــتـــه ســـحـــرا
اذا تقـــوم ايور الناس في الســـحـــر
يبكي جـــمـــيل بعـــد خـــيـــبـــتـــه
يقـــول: وا اســـفـــا لـم احظ بالذكـــر
ثم انثنى عنه يهـــجـــوه ويشـــتـــمـــه
والدف للطرق للنجم في الصـــغـــر

لەم شیعرە تورکییەی شێخ ڕەزا دەردەکەوێت کە مەحموود شوکری ئالووسی توانوویەتی سوود لە شێخ ڕەزا وەرگرێت دژی موفتی زەهاوی کە دەڵێت:

عــــراقک خـــاندن اقـــدســـيـــدر (آل آلوسی)
زهاوی زاده جـمـیلک بوزقـتـر عـرض و نـامـوسی

واتا:

ئالی ئالوسی خانەدانی پیرۆزی عیراقە
عیرز و ناموسی جەمیلی زەهاوی زادە شەلەقاوە

***

## شێخ ڕەزا بەرامبەر عیراق چی دەڵێت؟

شێخ ڕەزا خۆشەویستیی خۆی بەرامبەر عیراق لە دوا بەیتەکانی شیعری «اهل عراق»دا دەردەبڕێت کە دەڵێت:

بو عــراقک طو پراغنده صــو گــبی آلتــون آقــار
صــو کنارنده صوســز خلقــه صــویی اولمش یصــاق

واتا:

له خاکی ئەم عیراقە، وەکو ئاو زێڕ ڕێ دەکات
بەڵام ئەو تینوویانەی لە لێواری ئاودان ئاویان لێ قەدەغە کراوە.

بەڵام لەو بارەیەوە خەڵقی عـیراق تاوانبـار دەکات کـە یەک لە دژی یەکـتـرن و ڕەنجـیـان بەبادا دەڕوات چونکە گوێ بە قسـەی حەق نادەن و بڕوا بە قسـەی هیچو پووچ دەکەن. لەم شیعرانەدا دەڵێت:

معـتـدل گـیـتمز هەواسی گە صاووقدر گە صیـجاق
نـامـــوافــقـــتــــرو مـــزاجی اهلنه بکزر عـــراق
بو عــراقک خلقنی (حــجــاج) اصــلاح ایتــمـدی
هر طرفـــدک ملتک قـــانک ایدردی انهـــراق
حق تعــالی تقــســیم ایتــمــشــدر نفـاقی اون یره
طقـــوزک ویرمش عـــراقک اهلنه بالاتفـــاق
گــیــجــه گــوندوز چالشــر کــســبنده بولماز ازدیاد
کیسەسی بۆش، قارنی آج، باشی آچیق، یالین ایاق
مـــخـــتـلف آب وهواسی دەردی چوقـــدر رزقی آز
راحت ایستـرسک اگر، خاکی عـیراقدک اول اوزاق
زنگـینی سکران گبی، مـسکینی سەرگەردان گزر،
باطلی تصــدیق ایدرکن حق ســوزه ویرمــز قــولاق
بو عــراقک ط و پراغنده صــوکــبی آلتــون آقــار
صــو کنارنده صوســز خلقــه صــویی اولمش یصــاق

واتا:

هەوای بە موعتەدیلی ناروات، جارێک سارد و جارێک گەرم
میزاجی ناڕێکە، لە دانیشتوانی دەچێت عیراق
ئەم خەڵقی عیراقە، (حجاج) نەیتوانی چاکی کات

که له هەمو لایەکەوە خوێنی مللەتی دەڕێژت.
خوای گەورە دوو ڕوویی کردووەتە دە بەشەوە
نۆی داوەتە خەلقی عیراق بە ئتیفاق
شەو ڕۆژ تێدەکۆشێت هیچ قانزاجی پتر نابێت
کیسەی بەتاڵ، سکی برسی، سەریەتی و پێ خاوس
ئاو و هەوای چەشن چەشن، دەردی زۆر و ڕزقی کەم
ئەگەر ئاسودەبیت دەوێ، لە خاکی عیراق دوور بە.
دەوڵەمەندی وەکو سەرخۆش دەگەڕێت و هەژاری سەرگەردان
گوێ بە قسەی ڕاست نادات و بڕوا بە قسەی درۆ دەکات
لە خاکی ئەم عیراقە زێڕ وەکو ئاو دەڕوات
ئەو میللەتە توونییەی لە لێواری ئاو، ئاوی لێ قەدەغەیە.

لەشیعرە فارسییەکانیشیدا دەڵێت: لە درۆم پرسی کە ڕاستم پێ بڵێت، خەلقی کام مەملەکەتی و ماڵت لە کوێیە؟ وتی من و نیفاق دوو ابلیس زادەین لە عیراقدا کە جێگای باپیرمانە.

پرسیدم از دروغ که مارا بگوی راست
اهل کدام مملکتی، خانەات کجا است؟
گفتا من و نفاق دوو ابلیس زادە ایم،
درخطەء عراق کە مأوای جدما است

واتاکەی
لە درۆم پرسی وتم راستیم پێ بڵێ
تۆ خەڵکی چی ولاتێکی، ماڵت لە کوێیە
وتی: من و دوو رووبی دوو بێچووە شەیتانین
لە ناوچەی عێراقدا لە مەئوای باپیرمانە

کە باسی ئیسماعیل پاشای عوسمانی دەکات کە بە هێرشێکی چەکدارییەوە هاتە سەر عیراق بەڵام هیچی پێ نەکرا، ئەڵێ:

(عراقە) کلدی اسماعیل پاشا فرط سرعتلە
کە پای فتنەیە آینەء ملکە جلا ویر سون

کـلاب اشـقـیـا اطرافک آلدی شـاشـدی بیـچـاره
دیدی: «یاهو نـاصـل بر مملکت الله بلا ویرســـون»

واتا:

نیسماعیل پاشا زۆر بە پەلە هاتە عیراق
کە پامالّی پای فیتنە لە ولاّتدا بکات
سەگی جەردە دەوریان دا بێچارە سەری لێ شێوا
وتی: «ئەمە چۆن ولاّتێکە بەلاّی خوای لێ بێ»

هیچ گـومـانی نیـیـە لە هەمـو دەمـێکدا ئەوەی بەرهەلّستی بێگانە بکات پێی دەلّێن «فتنە»و«أشقیا».

***

## مێژووی چەند ڕووداوێک لە شیعری شێخ ڕەزادا

هەندێ ڕووداو هەن، لە کـاتی خۆیدا شێخ ڕەزا بە ژمـارەی پیتی (ئەبجەدی) بە شیعر مێژووی ڕوون کردوونەتەوە. ئەم ڕووداوانە، یان مێژووی کۆچی دوایی پیاوێکی ناسراو، یان دروست کردنی مزگەوت و زیارەتگان.

***

## مێژووی دروست کردنی زیارەتگای بەرمالّی پێغەمبەر

بەرمالّی پێغەمبەر کە لەلای فامیلیای (خادم السجادە) بوو لەمالّی حاجی ئەمینی خادیم ئەلسەججادە دانرابوو. سولّتان عەبدولحەمیدی دووەم فەرمانی دروست کردنی ئابیدەیەک، کە لایقی بەرمالّی پێغەمبەر بێت لە کەرکووک، داویەتی. شێخ ڕەزا مێژووی ئەمەی لە دوو بەیتە شیعرەکەی مەدحی سولّتاندا کردووە کە دەلّێت:

تـاریـخی مـطابـق واقـع دیـدی (رضـــــا)
(سـجـادەء پیـمـبـر ایچـون خـانە یا پدیلر)

لەوی تریان دیسان لە بەیتێکی تورکیدا دەلّێت:

یک گـوزەل دشـمـش (رضـا) جـوهرلی بو تاریخکز
(امــجـد پیـغـمـبـر)ک مــوقف سـجـادەسی

بەپێی ژمارەی تیپی ئەبجەدی مێژووی دروست کردنی لە ساڵی ۱۳۰۳ هەبووە

***

## مێژووی دروست کردنی مزگەوتی حاجی مستەفا ئاغا لە کەرکووک

مزگەوتی حاجی مستەفا ئاغا لە گەڕەکی (بلاغ)ی شاری کەرکووکە. حاجی مستەفا ئاغا خەڵکی شیرەدر بوو. لە کەرکووک بازرگانی تووتن بوو و لە فرۆشتنی تووتن پارەیەکی زۆری دەس کەوتبوو و ئەم مزگەوتە دروست دەکا. مەلای دانا، مەلا عەلی حیکمەت لەم مزگەوتە مامۆستا بوو و گەلێ مەلای کورد زانیاریی لێ دەسکەوت بووە. کە مستەفا ئاغای کوڕی حاجی ئەحمەد ئاغا مزگەوتەکە دروست ئەکات، شێخ ڕەزا لەم شیعرە فارسییەدا مێژووی دروست کردنی دادەنێ:

اگر خواهی سعادت سعیها کن در نیکوکاری
که یزدان (لیس للانسان الا ماسعی) فرمود
ببر رنج و بیفشان گنج در راه خداوندی
که در پاداش نیکی بندگانرا وعدها فرمود

واتا:

ئەگەر بەختەوەریت ئەوێ تەقەلای زۆر بدە بۆ چاکە کردن
چونکە خوا فەرموویەتی (کەس لەبەری ڕەنجی خۆی زیاتری دەسگیر نابێ)
ڕەنج بکێشە و گەنج دابەش کە لە ڕێگای خوداوەندا
چونکە خوا گفتی زۆری داوە بە بەندەکان لە وەڵامی چاکەدا

مگو زحمت کشید و ساخت مسجد مصطفی آغا
بگو جنت خرید و باخدا بیع وشرا فرمود
جواهر پاش شد طبع (رضا) وگفت تاریخش
(مزین معبدیرا مصطفی آغا بنا فرمود)

واتا:

مەڵێ زەحمەتی کێشاوە و مزگەوتی دروست کردووە مستەفا ئاغا
بڵێ بەهەشتی کڕیوە و لەگەڵ خودا ئاڵوگۆڕی بووە
تەبیعەتی (ڕەزا) گەوهەری بەخشییەوە و لەمێژووی ئەم مزگەوتەدا وتی:

(مستەفا ئاغا عیبادەتگایەکی ڕازەوەی دروست کرد)

بەپێی ژمارەی پیتەکانی دوا بەیت، لە ساڵی ١٢٩١هـ دروست کراوە

***

## نوێ کردنەوەی مەرقەدی شێخی گەیلانی لە بەغدا

سەید عەبدولڕەحمانی نەقیب، کە سەرەک وەزیرانی حکومەتی عیراق بوو. مەرقەدی شێخ عبدولقادری گەیلانیی نوێ کردەوە و دیمەنێکی لایق بە پایەی ئەو زاتەی دایێ. شێخ ڕەزا لەم شیعرە فارسییەدا مێژووی ئەوەی داناوە. ئەوەی شایانی باسە، لە هەردوو دەرگای مەرقەدی گەیلانی شیعری شێخ ڕەزا دانرابوو.

چون شد بأمر مظهر رحمن نقیب غوث.
تعمیر آشیانهء شهباز کبریاء
تاریخی تام خواند بگوش (رضا) سروش
(آراستند بارگاه شاه اولیا)

واتا:

کە بە فەرمانی دیارگەی خوا نەقیبی حەزرەتی غەوسی
هێلانەی شابازی گەورەیی ئاوەدان کرایەوە
سروش مێژووی تەواوی ئەو ڕووداوەی دا بە گوێی (ڕەزا)دا
بارەگای شای ئەولیایان ڕازاندەوە.
بەپێی ئەمە لە ساڵی ١٢٩٩ هـ بووە.

***

## مێژووی مردنی شاکر ئەفەندیی مەکتووبچی

شاکر ئەفەندیی مەکتووبچی (مدیر تحریرات)ی بەغدا بوو و لە نەوەی (شێخ جاکری)یە. ئەم شێخە، وەکو د. مستەفا جواد لە وتارێکدا لە تەلەفزیۆنی بەغدا وتی، ناوی (شێخی جهانگیر)ە و لە ڕەسەن دا کوردە و لە سامەڕا بە خاک سپێراوە. شاکیر ئەفەندی زۆر دۆستی شێخ ڕەزا بوو. لە مێژووی مردنیدا لەم شیعرە فارسییە دەڵێت:

ایام چو پروردهء خودرا کشد آخر

ای دوست دل آن بەکـــــە بە ایام نبندی
دیدی کە چسان بستەء فرمان اجل باشد
مکتـــــوبچی بغـــــداد بآن پایە بلندی

واتا:

مادام کە زەمانە سەرەنجام کەسانی پەروەردەی دەستی خۆی ئەکوژێ
ئەی دۆست وا چاکترە دڵ بە زەمانە نەبەستێ
دیت مەکتووبچی بەغدا بەو پایە بەرزەشیەوە،
چۆن بەسرایەوە بە فەرمانی ئەجەلیەوە!

سـیـد نسب از سلسلەء خـواجـەء جـاگـر
مـعـروف بخـوش خلقی ومـشـهـور برندی
تاریخ مـجـوهر ز(رضـا) خـواسـتم و گـفت
(شـد زیب گلسـتـان جنان شـاکـر افندی)

١٣٠٢هـ

واتا:

یەکێک لە ئەولادی پێغەمبەر لە نەوەی خواجەی جاگیر
کە بە ڕەوشت باشی و زیرەکی ناسرابوو
مێژووی گەوهەرینم لە (ڕەزا) داوا کرد و وتی:
(شاکر ئەفەندی بوو بە مایەی ڕازاندنەوەی باغچەی بەهەشت)

***

## مردنی حاجی عومەری یەعقووبیی کەرکووکی

حاجی عومەری یەعقووبی دەچێتە حەج و لە گەڕانەوەدا کۆچی دوایی ئەکا. لەو سەردەمەدا، چوونە حەج زۆر ئاسان نەبوو. چوون و گەڕانەوە چەند مانگێکی پێ ئەچوو. بنەماڵەی یەعقووبی لە کەرکووک، هەر چەنێک لە ڕەسەندا دەچنە سەر ئێلی زەنگنەی کورد، بەڵام خۆیان بە تورکمان داناوە. لە مێژووی مردنی حاجی عومەر شێخ ڕەزا بە تورکی ئەم مێژووە دادەنێت:

حجدن گلوب کیچندی تاریخ ایچون دینلدی

باغ جنانه اندی (حاجی عومەر افندی)

بەپێی دوا دێڕی ئەم شیعرە مێژووی مردنی لە ساڵی ١٢٩٨ ھ بووە.

***

## مردنی سەید محەممەدی کاکەیی

وەکو لەپێشەوە، لەسەر باسی کاکەیی وتمان، کاکەیی ئێلێکی کوردە لەسەر ڕێبازی (ئەهلی حەق)ە. لەبەر ئەوەی ناکۆکیی عەشایەری لە نێوان عشیرەتی تاڵەبانی و کاکەیی دا بووە، شێخ ڕەزا بە شێوەیەکی عەشیرەت پەرستی و نا پەسەند مێژووی خواڵێخوش بوو سەید محەمەدی کاکەیی نووسیوە. ئەم ناکۆکییە ئێستا پامال بووە و بووەتە ڕووداوێکی کۆن. شێخ ڕەزا لەم شیعرە تورکییەدا دەڵێت:

مطبخ نار جحیمه شد رحل ایتدی او کیم

لحم خنزیری کباب ایچون چکردی مطبخه

نعش ناپاکی گورنجه سویلدم تاریخ تام

(کاکەیی سید محمد گیتدی دوز دوز دۆزەخە)

واتا:

(!) بۆ ئاگری جەهننەم کۆچی کرد ئەوە کێ بوون

گۆشتی بەرازی بۆ کەباب ڕادەکێشایە مەطبەخەوە

کە تەرمی ناپاکیم دی مێژووی تەواوم وت

(کاکەیی سەید محەممەد ڕاستە و ڕاست چووە دۆزەخەوە)

مێژووی کۆچی دوایی لە ساڵی ١٣٢٣ھ بووە.

***

## مێژووی هاتنی کەماڵی پاشای موتەصەڕیفی کەرکووک

کەمالی پاشا یەکێک بوو لەموتەسەریفە تورکەکان دەوری عوسمانی لەکەرکووک. شێخ ڕەزا ڕۆژی گەیشتنی لەم شیعرە فارسی تورکییەدا بەیان ئەکا:

مژده امدن اصف ثانی چ و رسید

شاعران جمله فادند بفکر انشا

آرایوب بولدی (رضا) تام اولەقی تاریخی

(گلدی کرکوکه سلامتله کمالی پاشا)

دەکاتە ١٣٢٦)هـ.

واتا:

کەمژدەی هاتنی ئاسەفی دووەم گەیشت

شاعیران هەمووکەوتنە بیری شیعردانان

(ڕەزا) گەڕا و بەتەواوی مێژووی دۆزییەوە

(بەسەلامەت هاتە کەرکووک کەمالی پاشا)

درمیان دو شیر مرد خدا

عار باشد کسی رسد بجزا

شێخ (ڕضا) گفت بهر تأریخش

جای او گشت (جنت لمأوی)

مێژووەکە ساڵی ١٢٨٤بووە.

واتا:

لەنێوان دووپیاوی خوادا کە وەک شێروان

شوورەییە پیاو بەسزابگا

شێخ ڕەزا لەمێژوودا وتی

بەهەشتی بەرین بوو بەجێگەی ئەو.

(بۆمان ساغ نەبۆوەوە کە شێخ ڕەزا ئەم مێژووییەی بۆ کێ داناوە)

***

## شێخ ڕەزا و پیری

پیری، لەپاش ژیانێکی خۆش، وەکو ئێوارەی ڕۆژێکی بەهاری خۆشە .شێخ ڕەزا هەرچەندێک لەژیانی خۆی ڕازی نەبوو هەژاری کۆسپێکی گەورەی ژیانی بوو، بەڵام ژیانێکی لەبەرهەمی هونەری دەوڵەمەند و لە دەوڵەمەندی بێ بەرهەم چاکترە. ئەم هەژارییەی شێخ ڕەزا، وەکو کانی بارانە ساڵ بەهرەی هونەری تەقاندبووەوە .بەڵام پیری هەر پیرییە.

پیری بەتەنها نیعمەتە

پیـــــری و فـــــەقـــیـــــری زەحـــــمـــــەتە
پـیـــــــــرێـکـی زۆر گـــــــەورەم هـەیـە
لـەگـــــەڵ مـندا بـێ ڕەحـــــمـــــــەتـە

لەو پیرە گەورەیە، مەبەستی شێخ عەلیی کاکییەتی، کە لێی بەگلەیی بوو، بەڵام پیریش هەر بەگاڵتەوە ڕادەبوێرێت کەدەڵێت:

شێخ (ڕەزا) پیر بووە ڕووی مەجلیسی یارانی نییە
طاقـەتی کـەشـمـەکـەش و گـەردشی شـارانی نـییـە
دەس بەگۆچان دەگەڕێ ئێستە لەبەر ضوعفی وجوود
مـەترەقـە سـەرزلـەکـەی قـووەتی جـارانی نـیـیـە

ناشیەوێت سەربۆ پیری شۆڕکات و دەڵێت:

عـومـرم گـەیی بە هەشـتـا کـێـرم بەکـارە هێـشـتـا
ئەگەر تەصدیق نافەرمووی ،هەستم بەرم بەرەشتا ؟
کـــــەچی بـەعــــــیـــــــزەتـی تـەل دەڵێـت:
پیـر کـەکـۆکی و نەتری، دوورە لەمـردن هێـشـتـا
وردە ئاهەنگێکی دوای کـۆکـە نیـشـانەی ئەجـەلە
پیـــرکـــەکـــۆکی یو تڕی دەنگی وەکـــو بارەزەلە
شـاهیـدی مـوعـتـەبەرم عـیـزەتی مـەئمووری تەلە

بەناجی ئەفەندی قڕگەیش ئەڵێت.

پیـر بووە ناجی ئەفـەندی، بووە پشـتی بە کـەمـان
چرچ و ژاکـاو و مـولەوەث، وەکـو کـێـری پاش گـان

* مامۆستا مەحەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی دەڵێت ناجی ئەفەندی لەعەشیرەتی (شوان)ە

***

## ئەم کەسانەی کە باسی شێخ ڕەزایان کردووە

گەلێک لە ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کورد و بێگانە باسی زیرەکی و هونەرمەندیی شێخ

ڕەزایان کردووە .لەوانەی کەدەستمان کەوتوون ئەمانەن:

## مامۆستا مەحمودی شوکری ئەلئالووسی

مامۆستا مەحموود شوکری ئەلئالووسی بەزوبانی عەرەبی دەڵێت:

(شعر الشيخ رضا الطالباني اكثره بغير اللغة العربية، بل بعضه باللغة التركية والبعض منه باللسان الفارسي ومنه ما هو بالكردي. فهو ينظم على حسب رواج ذلك اللسان في البلد. وشعره العربي لا عيب فيه ولاركة تعتريه، بل هو شاعر بكل لسان يعترف له بذلك اهل الادب والفصاحة و البيان. وشعره مشتمل على مضامين ونكات غريبة لم يسبقه بها أحد من الشعراء ولاحامت على خاطر احد من الادباء مع ما اشتملت عليه من الحكم والفوائد التي لم يجر بها قلم. وقد رزق شعره الشهرة بحيث اذا نطق بالبيت او البيتين، شاع باقرب زمان في المشرقين والمغربين. وما اصدق من قال فية القائل مستعرضاً شعره:

شعر الرضا الطالباني كله حكم
كأنه جوهر بالدر منتظم
ان قال بيتاً ترى الآذان مصغية
وللبرايا روته العرب والعجم
كم من حقائق ابداها وبينها
كالشمس ينجاب عنها الغيم والظلم
جزا مولاه عنا كل صالحة
ومن اعاديه رب العرش ينتقم
تبارك الله ما ابهى سناه فتى
آلت علي فضله الاحكام والهمم

والحاصل ان هذا الرجل منزلتة في الادب شهيرة ومزاياه بين الانام مذكورة وشعره الفارسي احسن شعره حتى يقال انه مدح ناصر الدين شاه ايران بقصيدة فارسية عجز عن معارضتها شعراء الفرس في طهران. وشعره في التركي والكردي ايضاً من الرتبة العالية وله شعر عربي جيد

وهو قليل النظم فيه.

## شێخ محەمەدی خاڵ

نووسەر و ئەدیبی ناسراوی کورد شێخ محەمەدی خاڵ کە باسی شێخ ڕەزا و حاجی تۆفیق بەگ (پیرەمێرد) ئەکات ئەڵێت:

(بێ گومانم چۆن شێخ پیرەمێرد و شێخ ڕەزا شانبەشانییەک ئەڕۆن لەکوردی و فارسیدا هەروایش شانبەشای یەک ئەڕۆن لە تورکیدا. بەڵام شێخ ڕەزا لە عەرەبیشدا وەک سێ زوبانەکەی تر بەرز و باڵایە، کە پیرەمێرد لێرەدا دەفی دەنگ نادات. بەڕاستی هەردوولا مەشخەڵێکی ڕووناکن بۆ وێژەران و نووسەران و بوێژان.

(شێخ محەمەدی خاڵ - گۆڤاری کۆڕی زانیاری - ١٩٨٧).

لەوانەی باسی زیرەکی و بلیمەتیی شێخ ڕەزایان کردوە ڕۆژهەڵات ناسی ئەڵمان ئۆسکارمانە. بەداخەوە ئەو کتێبەی کەباسی تێداکردووە بەدەستمان نەکەوت .

# ناوەرۆک

له دەزگای ئاراسەوە

# ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی

داوا لە نووسەرانی بەڕێز دەکەین، ئەوانەی بەرهەمەکانیان لە ڕێگەی دەزگای ئاراس - ەوە بڵاو دەکەنەوە، پێڕەوی لەم ڕێنووسەی خوارەوە بکەن کە ڕێنووسی پەسندکراوی کۆڕی زانیاریی کوردستانە:

**یەکەم:** گیروگرفتی پیتی (و).

نیشانەی (و) لە زمانی کوردیدا بە شێوەی خوارەوە دەنووسرێ:

١- پیتی (و)ی کورت، واتە (و)ی بزوێنی کورت (و: u)

بۆ نموونە: **کورد. کورت. کوشت.**

٢- پیتی (وو)ی درێژ، واتە (وو)ی بزوێنی درێژ (وو: û)

بۆ نموونە: **سوور. چوو. دوو.**

٣- پیتی (و)ی کۆنسۆنانت (نەبزوێن). واتە (و: w)

بۆ نموونە: **ئاوایی. وەرە. هاوار.**

٤- پیتی (ۆ)ی کراوە. واتە (ۆ: o)

بۆ نموونە: **دۆڵ. گۆڕ. نۆ.**

**دووەم:** گیروگرفتی پیتی (و)ی سەرەتای وشە.

هەر وشەیەک بە پیتی (و) دەست پێ بکات بە یەک (و) دەنووسرێت.

بۆ نموونە: **وریا. وڵات. وشە. ورد.**

**سێیەم:** گیروگرفتی پیتی (ی):

نیشانەی (ی) لە زمانی کوردیدا بە شێوەی خوارەوەیە:

١- پیتی (ی)ی بزوێن. واتە (ی: î).

بۆ نموونە: **زەوی** - Zewî

٢- پیتی (ی)ی کۆنسۆنانت. واتە (ی: y)

بۆ نموونە: **یار** - yar

- **سەرنج ١:** پیتێکی (ی)ی بزوێنی فرە کورت هەیە کە لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینیدا نیشانەی (i)ی بۆ دانراوە وەک لە وشەکانی: من - Min ، کن - Kin ، ژن - jin. ئەم نیشانەیە لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبیدا نییە.
- **سەرنج ٢:** نیشانەکانی (ی)ی بزوێن و (ی)ی کۆنسۆنانت واتە (î) و (y) لە پیتی عەرەبیدا هەردووکیان هەمان نیشانەی (ی)یان هەیە بەڵام لە ڕاستیدا لە یەکتر جیاوازن و لە کاتی بە دوای یەکتر هاتنیاندا دەبێ هەردووکیان بنووسرێن.
وەک: **نییە. چییە. دیارییەکە. زەوییەکە.**
- **سەرنج ٣:** لە کاتی هاتنی سێ پیتی (ی) بە دوای یەکتردا وەک لە وشەکانی **(ئاواییەکەمان...)** **(کۆتاییەکەی...)** **(وەستاییەکی...)** **(کۆتایی بە کارەکە هێنا)** دەبێ بەسەر یەکەوە بنووسرێن، واتە سێ (ی) بە شێوەی (ییی) بە دوای یەکتردا دێن.

**چوارەم:** گیروگرفتی پیتی (ڕ)ی گران، واتە (ڕ)ی نیشانەدار. ئەم پیتە لە هەر کوێیەکی وشەدا هات دەبێ بە نیشانەکەیەوە بنووسرێت. واتە لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتای وشەدا هەر (ڕ)ی گرانی

نیشانەدارە.
وەک: **ڕۆژ. بڕیار. کەر.**

**پێنجەم:** گیروگرفتی پیتی (و)ی بەیەکەوەبەستن (عطف):
پیتی (و)ی بەیەکەوەبەستن، بە شێوەیەکی جیاواز لە وشەی پێش خۆی و پاش خۆیەوە دەنووسرێت و مامەڵەیەکی سەربەخۆی لەگەڵدا دەکرێت.
بۆ نموونە: **من و تۆ. ئارەزوو و وریا.**

- **سەرنج:** لە هەندێک وشەی لێکدراوودا پیتی (و)ی بەیەکەوە بەستن بووە بەشێک لە هەردوو وشە لێکدراوەکە و بە هەموویان وشەیەکی سەربەخۆیان دروست کردووە.
وەک: **کاروبار. دەنگوباس. ئەلفوبێ. هاتوچۆ.**
لەم بارانەدا مامەڵەی سەربەخۆ لەگەڵ پیتی (و)ی بەیەکەوە بەستندا ناکرێت و وشەکە هەمووی بەسەریەکەوە دەنووسرێت وەک لە نموونەکاندا پێشانمان دا.

**شەشەم:** وشەی ناسادە چ ناو بێ یان زاراوە دەبێ بەسەریەکەوە وەکو یەک وشە دەنووسرێن. وەک:
ناو: **چەمچەماڵ. بێکەس. دڵشاد. زوورگەزراو. بێخاڵ. ناڵپارێز. میاندواو. کانیکەوە. سپیکرە.**
زاراوە: **ڕێنووس. ڕێپێوان. دەسبەجێ. جێبەجێ. نیشتمانپەروەر. دەستنووس. دەسبازی. وڵاتپارێز. ئازادیخواز. دووشەممە. سێشەممە. پێنجشەممە. یەکسەر. ڕاستەوخۆ. یەکشەوە** (مانگی یەکشەوە).

**حەوتەم:** پیتی (ت) لە کۆتای کار (فرمان)دا دەشێ بنووسرێت و دەشێ نەشنووسرێت.
وەک: **دێت و دەڕوات** (یان) **دێ و دەڕوا.**

**هەشتەم:** نیسبەت لە زمانی کوردیدا زۆربەی جار بەهۆی پیتی (ی) لە کۆتای ناودا دەکرێت.
وەک: **پێنجوینی. هەولێری.دهۆکی. شێخانی.**
هەروەها ئەم نموونانەی خوارەوە:
ئەحمەدئاوا: **ئەحمەد ئاوایی**
یارمجە: **یارمجەیی.**
تووزخورماتوو: **تووزخورماتوویی.**
شنۆ: **شنۆیی.**
ئاکرێ: **ئاکرێیی** (یان) **ئاکرەیی.**
لادێ: **لادێیی.**

- **سەرنج:** ئەو ناوانەی خۆیان بە پیتی (ی) تەواو دەبن پێویست ناکات (ی)ی نیسبەتیان بخرێتە پاڵ.
وەک:
سلێمانی: **کامەران سلێمانی.**
کانیماسی: **حاجی حوسێن کانیماسی.**
ئامێدی: **ئازاد ئامێدی.**

**نۆیەم:** هەر وشەیەکی بیانی چ هاتبێتە ناو زمانی کوردییەوە، یان هەر ناو و وشەیەکی تر کە لە نووسینی کوردیدا دێتە پێشەوە، دەبێ بەڕێنووسی کوردی بنووسرێت.
وەک: **قەڵەم. ئەکبەر. قاهیرە. ئۆتۆمۆبێل. دۆستۆیفسکی.**

**دەیەم:** ئامرازی (تر، ترین) کە بۆ بەراورد بەکاردێن دەبێ بەوشەکانی پێش خۆیانەوە بلکێنرێن. وەک:
**جوان: جوانتر - جوانترین.**
**خاو: خاوتر - خاوترین.**

• **سەرنج:** ئەم ئامرازەی (تر) جیاوازە لە وشەی (تر) کە بەواتەی (دی، دیکە) دێت. ئەمەی دوایی دەبێ بە جیاواز لە وشەی پێش خۆی دەنووسرێت.
وەک: **ماڵێکی تر، چیی ترم ناوێ.**
**یازدەیەم:** جێناوی نیشانەی وەک: ئەم. ئەو. ئەڤ.
ئەم جێناوانە ئەگەر ئاوەڵکاری (کات - یان - شوێن)یان بەدوادا هات پێیانەوە دەلکێن و دەبن بە یەک وشەی سەربەخۆ.
وەک: **ئەمشەو. ئەمڕۆ. ئەڤساڵ. ئەمجارە. ئەمبەر و ئەوبەر. ئەڤڕۆ.**
**دوازدەیەم:** نیشانەکانی نەناسراوی وەک ( ...یەک، ...ێک، ...ەک) بە شێوەی خوارەوە دەچنە سەر وشەکانی پێش خۆیان:
١- ئەگەر وشەکان بە پیتە بزوێنەکانی (ا، ی، ە، ێ) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (...یەک)یان دەخرێتە پاڵ. وەک:
**چیا: چیایەک.**
**زەوی: زەوییەک.**
**وێنە: وێنەیەک.**
**دێ: دێیەک.**
٢- ئەگەر وشەکان بە پیتە بزوێنی (وو) یان هەر پیتێکی دەنگدار (نەبزوێن: کۆنسۆنانت) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (ێک - لە کرمانجیی خواروو) و نیشانەی (ەک)یان لە کرمانجیی سەروودا دەچێتە سەر.
**خانوو: خانووێک، خانووەک**
**گوند: گوندێک** (کرمانجیی خواروو)، **گوندەک** (کرمانجیی سەروو).
**ژن: ژنێک** (کرمانجیی خواروو)، **ژنەک** (کرمانجیی سەروو).
**سێزدەیەم:** گیروگرفتی پاشگرەکانی (دا. ڕا. وە. ەوە)
ئەم پاشگرانە بە وشەکانی پێش خۆیانەوە دەلکێنرێن. وەک:
دا: **لە دڵدا** (هەر برینێ کە لەدڵدا هەیە سارێژی کەن). (خەمێکم لەدڵدایە).
ڕا: **لە ئامێدیرا** (لە وێرا بەپێ هاتووین). (لە خۆرا دڵی گۆڕاوە).
وە: لە چوارچراوە (لە وێوە هاتووین).
ەوە: بە ماڵەوە (بە ماڵەوە ڕۆیشتین).
(جارێکی تر نووسیمەوە). (خانووەکەم کڕییەوە).
• **سەرنج:** پاشگری (دا) جیایە لە وشەی (دا) کە فرمانە و چاوگەکەی (دان)ە.
وەک: **تیرێکی لە دڵی دا. تیرێکی لە دڵی داوم.** ئەم (دا)یەی فرمان بە جیا دەنووسرێ.
**چواردەیەم:** گیروگرفتی پێشگرەکانی (هەڵ. دا. ڕا. وەر. دەر)
١- ئەم پێشگرانە کاتێ دەچنە سەر چاوگ یان فرمان یان هەر حاڵەتێکی تر پێیانەوە دەلکێن بە مەرجێ جێناوی لکاو نەکەوتبێتە نێوان پێشگر و وشەکەی دوای خۆی. وەک:
* چاوگ:
**هەڵ: هەڵکردن. هەڵگرتن. هەڵکورمان. هەڵکێشان.**
**دا: دابڕان. داخستن. داڕمان. داکردن.**
**ڕا: ڕاگرتن. ڕاکێشان. ڕاپەڕین.**
**وەر: وەرگرتن. وەرسووڕان.**
**دەر: دەرکردن. دەرهێنان.**

* فرمان:

**هەڵ: هەڵگرە. هەڵمەخە. هەڵکشێ.**

**دا: دانێ. دامەبرە.**

**ڕا: ڕاکێشە. ڕامەپەڕێنە.**

**وەر: وەرگرە. وەرسووڕێنە.**

**دەر: دەرێنە. دەرخە.**

* حاڵەتی تر. وەک:

**هەڵکشاو. هەڵنەکشا. دانراو. ڕاپەڕیو. ڕانەپەڕیو. وەرگرتوو. وەرگرتە. دەرخراو. دەرکراو.**

٢- ئەگەر جێناوی لکاو کەوتە نێوان پێشگر و فرمانەکەی دوای خۆی ئەوا بەجیا دەنووسرێن و جێناوەکە بە پێشگرەوە دەلکێنرێ.

**هەڵ: هەڵم گرن. هەڵیان کەن. هەڵمان کێشن. هەڵمان مەواسن.**

**دا: دامان نەنایە. دایان خەن. دای برە.**

**ڕا: ڕایان دەگرین. ڕام کێشە. ڕام پەڕێنە. ڕاشیان پەڕێنن.**

**وەر: وەرمان گرتایە. وەری نەگری. وەریان سووڕێنەوە.**

**دەر: دەریان پەڕاندین. دەری خە.**

**پازدەیەم:** گیروگرفتی وشەی لێکدراو.

ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی فرماندا بوو، بەجیا دەنووسرێن:

**ڕێک دەکەوین. پێکیان هێنایەوە. پێک نەهاتین. یەکیان نەگرتووە. دەستمان نەکەوت.**

بەڵام ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی چاوگ یان حاڵەتی تردا بوو ئەوا هەردوو وشەکەوە بە یەکەوە دەلکێنرێن.

وەک: **ڕێککەوتن. پێکهاتن. یەکگرتن. دەسخستن. یەکگرتوو. دەسکەوتوو. پێکهاتە.**

**شازدەیەم:** ئامرازی (ش)ی تەئکید کەوتە هەر شوێنێکی وشەوە دەبێ بە بەشێک لە وشەکە و نابێ بە هۆی لەتبوونی وشەکە.

وەک: **هشتەوێ ناتدەمێ. نەشخۆی. گوتی دێم... نەشهات. نەشمانگرتن. هشمانهەن.**

***

زوبدەی مەتاعی حیکمەتە ئەم شیعری کوردییە
هەرزانە، بێ موبالەغە، حەرفی بە گەوهەرێ
جامەی حەیاتی عاریەت کورتە زینهار
ئاڵوودە دامەنی مەکە بۆ پێچی مێزەرێ